# دیوان



رەسووڵ گەردی
لە دۆسیەی (دیوان)دا

گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی گشتییە، ناوەندی هەولێری مەکتەبی ڕاگەیاندنی ی.ن.ک دەریدەکات
ژمارە (٢٨) - ئەیلوولی ٢٠٢٣ی زایینی - ڕەزبەری ٢٧٢٣ی کوردی



- جەمیل عیسا لەگەڵ ڕووداوەکاندا
- ئەوانەی تا لێواری مردن سەمایان کرد
- ڕۆمانێک بە تامی مێژوو
- زیاد ئەسعەد شیعری عاشق بەتۆم-ی چۆن کرد بە گۆرانیی؟
- سەلیم قاقا، ملك الطيور



## شوکریە حەمەدئەمین ڕواندزی:

## مەخموور وەک مەنفایەک وابوو، ئەوەی عەقڵیان نەگرتبا بۆ ئەوێیان دوور دەختەوە

# ژەنەڕاڵی پایز

## محەمەد عومەر عوسمان

## ١٩٥٧- ٢٠١٩/١٠/٢٢



### منم ژەنەڕاڵی پاییز

منی هەرگیز ئۆقرە نەدیو
ژنەڕاڵم، ژەنەڕاڵی هەزارەها داری ڕووت و
ملیارەها گەڵای وەریو
منم ژەنەڕاڵی پاییز
کاسکێتەکەی سەرم هەورە و
ئەستێرەکانی سەر شانم چەند گەڵایەک بە ڕەنگی زیو
پاڵتۆی بەرم کزەبایە و
شمشێرەکەم لقی درەختێکی ڕزیو
منم ژەنەڕاڵی پاییز
خوێنێکی زەرد بەنێو دەمارما دەگەڕێ و
چاوم هەر وەک هەور نمناک
تەنیا من بووم کە لە تابووتی شووشەدا
چەندین گەڵام سپارد بە خاک
منم ژەنەڕاڵی پاییز
من بووم لەگەڵ زریانی بیرچوونەوەدا، کەوتمە جەنگ و
زۆر گەڵام دەرهێنا لە چنگ
من بووم شەوی گەڵاکانم
خستە ژێر باڵی تریفە و ورشەی گزنگ
منم ژەنەڕاڵی پاییز
پاییز بەبی من هەتیوە و
من بووم وتم بەڵێ تەرمی نسێی سەوزە
گەڵای وەریوی کۆچکردوو
تەنیا منم کە لە میحرابی پاییزا
بۆ گیانی زیندووی گەڵاکان
نوێژی شەهید دائەبەستم،
ناوی نانێم نوێژی مردوو
سلێمانی- ١٩٩٠/٢/٢٩

# دیوان

سەرنووسەر
سمکۆ عەبدولکەریم

گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبی و رۆشنبیریی گشتییە
ناوەندی هەولێری مەکتەبی راگەیاندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دەریدەکات

خاوەن ئیمتیاز
مەسعودی مەلا هەمزە

بەڕێوەبەری نووسین
محەمەد گۆران

ژمارە (٢٨) ئەیلوولی ٢٠٢٣ زایینی - رەزبەری ٢٧٢٣ کوردی


## یەکدی نەخوێندنەوە

ئێمەی کورد بۆ هەمیشە بەرهەمی نووسەرانی خۆمان بێ کەم بایەخە؟ بە پێچەوانەوە بە ڕێزەوە لە نووسەران و بەرهەمی بیانی دەڕوانین. بەشێوەیەک هێندەی چاومان لەسەر بەرهەمی وەرگێڕدراوی بیانییە، هێندە تامەزرۆی خوێندنەوەی بەرهەمی خۆماڵی نین.

لە کاتێکدا لە ڕابردوو پێچەوانە بوو، ئێستەش، کە لاپەڕەی کتێبێکی حەفتاکان و پێشتر هەڵدەدەینەوە مووچرک بە لەشماندا دێت، بەڵام ئێستە لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتن و پێشوەچوونەی مەعریفەش، کەچی بە چاوی کەم لێک دەڕوانین.

ئەم بەکەم لێک ڕوانینە دەردێکی کوشندەی نێو دونیای ئەدەبی و ڕۆشنبیریی کوردییە، وایکردووە ئاوڕ لە بەرهەمی یەک نەدەینەوە و ددانی خێری پێدا نەنێین.

زەمانی خۆی، بۆچی نووسەرێک، کە نامیلکەیەکی بچووکی چەند لاپەڕەیی چاپ دەکرد هێندە دەنگوسەدای دەدایەوە و لەسەری دەنووسرا، کەچی ئێستە وەک ئەوە وایە، نە بای دیبێ و نە باران.

ئەو ددان بەیەک دانەنانەی ئەمڕۆی نێو ئەدیب، نووسەر و هونەرمەندانی کورد پەیوەندیی بەچییەوە هەیە؟

پەیوەندیی بە کورسیی و دەسەڵاتی ئەدەبەوە هەیە، یان پەیوەندیی بە بیرتەسکیی، تێکچوونی باری دەروونیی و فزوولییەتەوە هەیە.

فرۆید پێی وایە جەوهەری مرۆڤ نەرجسییەتە، ئەو نەرجسیەتە وادەکات ئەو کەسە ئامادە نەبێت لە خۆی زیاتر کەسی دی بخوێنێتەوە. ئەگەرچی زۆرجار دەکەوێتە داوی بێ مەعریفەیی و خۆشی لە بیر دەکات.

بۆیە لەم بارەیەوە هیوایەک نییە بۆ ئەوەی نەرجسیەت مرۆڤ ویران نەکات؟ یان بە دیوە گشتییەکەی ئەدەب ویران ناکات، وانەکات مرۆڤ بتوانێت واقیع بەو شێوەیەی، کە هەیە ببینێت، واتە ناتوانێت، یان نایەوێت بابەتیانە لە دەوروبەری خۆی بڕوانێت، چونکە سەرئەنجام نەرجسییەت بریتییە لە کەمکردنەوەی سنووری عەقڵ و مەنتق، هەربۆیە ناوەناوە بینیومە، بیستووشمە، چۆن نووسەرێک ستایشی نووسەرێکی دی دەکات، بەڵام بەهیچ شێوەیەک ئامادە نییە، ئەو ستایش و پیاهەڵدانەی بکاتە نووسین و بڵاوی بکاتەوە، لەبەر ئەوەی هەمیشە لە خەیاڵی خۆیدا پێی وایە هەڵکشانی ئەو داکشانی ئەمە، ئەگەرنا بابی ئەوە، هەم نووسەرمان هەنە، هەم دەق و کتێبی خۆماڵیی، بەڵام داخەکەم ئەم خۆخۆرییە وایکردووە، کەس ددان بەکەس دانەنێت، دەگاتە ئاستی ئەوەی، ڕۆماننووسێک زۆر گەمژانە بڵێت کورد ڕۆمانی نییە، بێ ئاگا لەوەی خۆی نووسەری چەندین ڕۆمانە.

ئەوە، ئەو دۆخەیە، کە ئێستە ئەدەبیی کوردیی تێی کەوتووە.

سەرنووسەر


هەولێر - شەقامی ١٠٠ مەتری نزیک کۆلێژی دەرمانسازی
govaridiwan@gmail.com
(گۆڤاری دیوان) لەتیلیگرام
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
دیزاین: ئاسۆ حەسەن ئەحمەد (٠٧٥٠٤٤٧١٨٢١)
سەرپەرشتیاری چاپ: مەهدی ئەحمەد حوسێن (٠٧٥٠٤٥٥٠٢١٣)
چاپخانەی ڕۆژهەڵات - هەولێر (٠٧٥٠٤٤٩٥٦٥٤ - ٠٧٧٠٤٤٩٥٦٥٤)

**• دۆسیە: (ڕەسووڵ بێزار گەردی)**



**• مێژوو:**



**• ئەدەب:**



**• ڕۆشنبیریی گشتی:**



**• دیدار:**



**• هونەر:**



**• خوێندنەوەی کتێب:**



**• لەبری بیرەوەری:**



**• وێستگەی دیوان:**



**• لاپەڕە ١٤٤:**

# دۆسیە

# ڕەسووڵ بێزار گەردی

## ١٩٢٦ - ١٩٩٤/١٠/١٧

- یەکەم هونەرمەندە حەیرانی لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن تۆمار کردووە.
- یەکەم حەیرانبێژی کوردە حەیرانی لەسەر قەوان تۆمار کردووە.
- یەکەم حەیرانبێژە حەیرانی لەگەڵ مۆسیقا گوتووە.
- یەکەم هونەرمەندە سرورود و هۆنراوی نیشتمانیی بە حەیران چڕیوە

ڕەسووڵ ئیبراهیم سوڵتان- ناسراو بە ڕەسووڵ بێزار گەردی ساڵی ١٩٢٢ لە گوندی قەڵادگە لە دەشتی بەڕانەتی هەولێر، لە بنەماڵەیەکی ئاییندار لە دایکبووە، بەبێ سۆزی باوکی گەورە دەبێت، چونکە هەر کۆرپە بووە، کاتێک باوکی کۆچی دوایی دەکات.

گەردی دوو برای دیکەی هەبوونە، بەناوەکانی (عەلی و خدر) ئەوانیش دوای چەند ساڵێک گیانیان بە یەزدان دەسپێرن.

پلکەکەی بەناوی (ستی) کە ماڵیان لە گەڕەکی عارەبان دەبێت لە هەولێر بەخێوی دەکات، هەر لە قوتابخانە و لەتەمەنی منداڵی بەهرەمەندی لە سروود و گۆرانی گوتن دا بەدەردەکەوێت و دەنگخۆشیی ئەو منداڵە بچووکە بڵاودەبێتەوە. تا پۆلی شەشەمی سەرەتایی دەخوێنێت، پێشتریش لە حوجرە خوێندوویەتی. پاش چەند ساڵێک بۆ هەڵسوڕاندنی ژیانی خۆی و خێزانەکەیان، واز لە خوێندن دێنێت و دەست بەکارکردن دەکات.

لە ساڵی ١٩٤٠ بانگ دەکرێت بۆ خزمەتی سەربازیی، لەسەربازیشدا لەبەر پاکوخاوێنی و ڕێکوپێکی دەیکەنە (ئینزیبات) بەشداری شەڕی (ڕەشید عالی گەیلانی) دەکات، لەو شەڕەدا بریندار دەبێت، دوای چاکبوونەوە و تەواوکردنی ماوەی سەربازیی، دەبێت بە پۆلیسی سوارە واتە (الخیالە) بۆ ماوەیەک دەنێردرێتە شاری (کۆیە)

لەگەڵ ئەوەشدا هەر بەردەوام دەبێت لە گوتنی حەیران و بەستە و مەقام و گۆرانیی، شارەزایی و لێهاتوویی خۆی دەنوێنێت. لە حەیران گوتن و جۆرەکانی مەقام، لە شاری کۆیەش بە پۆشتەیی و پاکوخاوێنی و دەنگخۆشیی ناوبانگی بڵاودەبێتەوە و لەلایەن خەڵکی ئەم شارە زۆر خۆشەویست دەبێت. هەر لەم سەردەمەدا ئاشنایەتی لەگەڵ هونەرمەندی گەورە (تاهیر توفیق) پەیدا دەکات و تا مردن ئەم هاوڕێیەتی و برایەتییەیان بەردەوام دەبێت.

دوای چەند ساڵێک دەگوازرێتەوە بۆ(ڕانیە) و ناوچەی (میرزا ڕۆستەم) لەوێش هەر زوو خەڵکی ئاشنای دەبن، لە ساڵی ١٩٤٤ هەر لە وێ ژیانی هاوسەریەتی لەگەڵ (ئامینە محەمەد حەسەن) کە لە بنەماڵەیەکی ناوداری هۆزی بلباس بووە پێکدەهێنێت، دوایی دەگەڕێنەوە شاری هەولێر.

لەناوەڕاستی ساڵانی چلەکانی سەدەی ڕابردوو هونەرمەند ڕوو لە ئێستگە و تەلەفزیۆنی بەغدا دەکات، بۆ ئەوەی بەرهەمەکانی بڵاوبکاتەوە و ببێ بە گۆرانیبێژ و بەشێوازێکی تازە و سەردەمیانە خزمەتی هونەری کوردیی بکات، بەتایبەتی لە بوارەکانی حەیران و مەقام.

یەکەم کەس بووە حەیرانی کوردیی لە ئێستگە و تەلەفزیۆن تۆمار کردووە و بڵاویکردوونەوە، یەکەم کەسیش بووە لەگەڵ مۆسیقا حەیرانی چڕیوە.

هونەرمەند ڕەسووڵ بێزار گەردی باوکی چوارمنداڵ بووە، دوو کوڕ و دووکچ (کەیفی، سەفین، سەرگوڵ، شاهیدە).

دوای نسکۆی شۆڕش دەگەڕێتەوە هەولێر و تووشی نەخۆشی دڵ دەبێت، لە ساڵی ١٩٧٨ ڕوو لە شاری (لەندەن) دەکات بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەکی گەورەی دڵ، دوای سەرکەوتنی نەشتەرگەریەکە دکتۆرەکان پێی دەڵێن دەبێ دوای پازدە ساڵی دی بچێتەوە لەندەن بۆئەنجامدانی نەشتەرگەریەکی دی، بەڵام کەسایەتی و گیانی پاک و دڵسۆزی بۆ گەل و نیشتیمانەکەی ڕێی پێنادات دوای ڕاپەڕین ڕوو لەبەغدا بکات بۆ ئەوەی بۆ چارەسەرکردن ڕەوانەی لەندەنی بکەن.

زۆر بەداخەوە لە هەرێمی کوردستانیش ئەوکاتی بایەخی ئەوتۆ بە هونەرمەندان نەدەدرا، تا ئەو ڕادەیەی ڕەوانەی دەرەوە بکرێ بۆ چارەسەرکردن و ئەنجامدانی نەشتەرگەری دڵ، بەخۆشی لە ڕووی داراییەوە ئەو توانایەی نەبوو، تەنانەت بۆ دابینکردنی دەرمانەکانیشی. تا نەخۆشییەکەی پەرەی سەند و چۆکی پێ دادا و لە ١٠/١٧ / ١٩٩٤ بەداخ و کەسەرێکی زۆرەوە گیانی پاکی بەخوای گەورە سپارد، و لە گۆڕستانی شێخ ئەحمەد لە شاری هەولێر نێژرا.



> «یەکەم کەس بووە حەیرانی کوردیی لە ئێستگە و تەلەڤزیۆن تۆمار کردووە و بڵاویکردوونەوە، یەکەم کەسیش بووە لەگەڵ مۆسیقا حەیرانی چڕیوە»

### ویستگەکانی ژیانی

ڕەسووڵ بێزار گەردی هەر لە منداڵییەوە بەهرەی هونەر و دەنگخۆشی لێ بەدەرکەوتووە، کاتێک



خوێندکار بووە لە قۆناغی سەرەتایی، لە قوتابخانە سروود و گۆرانیی و حەیرانی گوتووە و ناوبانگی دەرکردووە، کاتێک بە پۆلیسی دەگوازرێتەوە بۆ کۆیە، هەر لەوێش ناوبانگی بڵاودەبێتەوە وەک هونەرمەندێکی ڕەسەن و بەتوانا، لە سەرەتای ساڵانی چلەکانی سەدەی ڕابردوو دەگوازرێتەوە بۆ ناوچەی پشدەر بۆ شارۆچکەی ڕانیە، لەوێش هەر بەهەمان شێوە بەردەوام دەبێت و وەک گۆرانیبێژ، حەیرانبێژ و مەقامزانێکی بەتوانا ناوبانگ دەردەکات.



ڕەسووڵ گەردی بە جلوبەرگی پۆلیسی

**ڕەسوڵ بێژار گەردی باوکی چوارمنداڵ بووە، دوو کوڕ و دووکچ: کەیفی، سەفین، سەرگوڵ، شاهیدە**

لە ناوەراستی چلەکانی سەدەی ڕابردوو ڕوو لە ئێستگە و تەلەفزیۆنی بەغدا – بەشی کوردیی دەکات، و دوای تێپەڕاندنی تاقیکردنەوەکان بە سەرکەوتوویی، بەفەرمی دەبێت بە گۆرانیبێژ، لەبەر ئەوەی ئەوکاتی ڕیکۆرد و کاسێت پەیدانەببوون، بەرهەمەکانی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەخش دەکران، وەکو هونەرمەندەکانی دیکە مامۆستایان عەلی مەردان و حەسەنی جزیری و تاهیر تۆفیق، خەڵکی لە هەموو کوردستان و عیراق و ناوچەکەدا گوێبیستی بەرهەمەکانی دەبوون.

بەم جۆرە ڕەسووڵ بێژار گەردی دەست بە قۆناغێکی نوێی هونەریی دەکات، بە شێوازێکی سەردەمیانە و ئەکادیمیانە خزمەتی هونەری ڕەسەنی کوردیی دەکات.

بێجگە لە خزمەتکردنی لە بواری ئێستگە و تەلەفزیۆن، کە لە هەر چوار پارچەی کوردستان و سەرتاسەری عیراق ناوبانگییەکی بەربڵاو بەو هونەرمەندە دەبەخشێت، هونەرمەند هەر ئەوەندە تینوێتی ناشکێنێ، لە دەرەوەی ئێستگە و تەلەفزیۆنیش ئەسپی خۆی تاو دەدات و بەشداری لە زۆربەی ئەو ئاهەنگانە دەکات، کە لە بۆنە نەتەوەیی و نیشتمانییەکان ساز دەکران، بەتایبەتی لە ئاهەنگەکانی نەورۆز بە ئاشکرا و بەنهێنی، لەخۆبردووانە و بە خۆڕایی و بەبێ هیچ بەرانبەرێکی دارایی و ماددی ئاهەنگەکانی دەڕازاندەوە و ئامادەبووانی دڵخۆش دەکرد و گیانی کوردایەتی و ورەیانی بەرزدەکردەوە و هانی دەدان، تا وای لێهات تووشی چەندین گیروگرفت هات.

لەساڵی ١٩٦٨ لە ئێستگە و تەلەفزیۆن لە بەغدا

دوورخرایەوە، چونکە سەردەمانێک ئاهەنگگێڕان بەبۆنەی نەورۆز و بۆنە نەتەوەییەکانی کورد قەدەغەبوو، دوای بەیانی ١١ ئادار لە ١٩٧٠ گەڕایەوە بۆ ئێستگە.

لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕش، هونەرمەند ڕەسوڵ بێزار گەردی پەیوەندی بەشۆڕش دەکات وەک هەموو کوردێکی دڵسۆز ڕوو لە چیا سەرکەشەکانی کوردستان دەکات و دەبێتە پێشمەرگە و دەست وتفەنگ ڕووبەڕووی داگیرکەرانی کوردستان دەوەستێتەوە، و بەرگری لە خاک و میللەتەکەی دەکات، بەڵام کۆڕی هونەریش لەیادناکات، و وەک چەکێکی تر بەرانبەر بە دوژمنەکانمان بەکاری دێنێت، و چەندین سروودی نیشتمانیی و شۆڕشگێڕیی دادەڕێژێ و ئاوازیان بۆ دادەنێت، بە بەرهەمە بەپێزەکانی ئێستگەی شۆڕشیش دەوڵەمەند دەکات. لەگەڵ تیپی مۆسیقای شۆڕشی ئەوسا لە هەموو بۆنە و ئاهەنگەکان بەشداری دەکات. لە باشووری کوردستان و هەروەها لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش. دەبێتە یەکەم کەس کە سروودی نیشتمانی و بەرگری بە حەیران بچڕێت.

دوای نسکۆی شۆڕش ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ هەولێر، سەرەڕای تووش بوونی بە نەخۆشی دڵ بەردەوام دەبێت لە خزمەتکردن لە بواری هونەر و ئەدەب، و چەندین بەرهەم لە تەلەفزیۆنی کەرکوکیش تۆماردەکات، بەڵام زۆر بەدرەنگی، بۆیە تەمەن یار نابێت تاوەکو ئەو بەرهەمانەی کە لە دەرەوەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەوە تۆماری کردوون لەوێش تۆماریان بکات و کلیپیان بکات، بۆ مانەوەیان وەک ئەرشیفێکی هونەریی پارێزراو.

ڕەسوڵ بێزار گەردی زیاتر لە پەنجا ساڵی تەمەنی خۆی لە خزمەتکردنی هونەری ڕەسەنی کوردی بەسەربرد، و چەندین بەرهەمی پڕ بایەخ و بەپێزی لە هۆنراوە و سروود و حەیران و بەستە و مەقام و گۆرانی و ئاواز و چاپکراوەی بۆ کورد بەجێهێشت، کە خۆی لە زیاتر لە (١٠٠٠) بەرهەم دەدات، و نزیکەی (٧٠٠) بەرهەمی بەتەنیا لە ئێستگە و تەلەفزیۆنی بەغدا بەخشکراون و تۆمارکراون، و ئەوانەی تریش لە ئێستگەی شۆڕش و ئاهەنگەکانی شۆڕش لە کاتی پێشمەرگایەتی و لە ئاهەنگەکاندا گوتراون، مامۆستا بێزار گەردی ئاوازدانەرێکی بەسەلیقە و بەهرەداربووە، و ئاوازی بۆ هەموو بەرهەمەکانی خۆی داناوە، و خاوەن زۆرترین ئاوازە لە بواری گۆرانیی و موزیکی کوردیی، بەهرەی هۆنراوە نووسینیشی هەبووە، بەتایبەتی هۆنراوەی گۆرانی (لیریک) و هۆنراوەی بۆ زۆرێک لە بەرهەمەکانی خۆی هۆنیوەتەوە، و بۆیە وەکو شاعیرێک نازناوی (بێزار) ی هەڵگرتووە. خاوەنی پێنج کتێبی چاپکراوە.





یەکەم چاپکراوی ڕەسووڵ گەردی لە ساڵی ١٩٥٧



**بەرهەمە چاپکراوەکانی:**

• کتێبی (بژار - ١٩٥٧) لەسەر ئەرکی خۆی لە بەغدا چاپکراوە.

کۆمەڵە بەرهەمێکە لە حەیران و سروود و هۆنراوەی گۆرانیەکانی ڕەسوڵ بێزار گەردی خۆی و لەگەڵ هەندێ لە شیعری ئەم شاعیرانەی کە بۆخۆی ئاوازی بۆ داناون: حەبیب عەلی میرانی، ئاغای جوکلاغا، پیرباڵ مەحمود، کانی، ئیبراهیم یوسف، ئەحمەد هەردی، بورهان جاهید، مەلا مەسعوودی بێبەش، ئەحەمد دڵزار، موفتی پێنجوێنی، عوسمان عوزێری.

• کتێبی (گوڵە مێلاقە - ١٩٦٠) لەسەر ئەرکی خۆی لە بەغدا چاپکراوە.

ئەم کۆمەڵە بەرهەمە لە حەیران و سروود و لاوک و گۆرانی، بەرهەمی ڕەسوڵ بێزار گەردی خۆی و لەگەڵ هەندێ شیعری شاعیرانی تری گرتۆتەخۆ، لەوانە: حەبیب عەلی میرانی، دڵدار، مەدحەت بێخەو، محەمەد حەسەن مەنگوڕی، جەمال شارباژێڕی، شێرکۆ بێکەس، توفیق وردی، کەمال غەمبار، کەریم شارەزا، کامەران موکری، کانی، پیرەمێرد، ئیبراهیم هۆشیار، شێخ تەها شێخ سەعید (ڕەهبەر)، بورهان جاهید، ئەحمەد دڵزار، عوسمان عوزێری.

• کتێبی (شیلان و شلێر - ١٩٦٧) لەسەر ئەرکی خۆی لە بەغدا چاپکراوە.

ئەم کتێبە لە سروود و گۆرانی و مەقامی تایبەتی ڕەسوڵ بێزار گەردی خۆی پێکهاتووە و هەر خۆشی ئاوازی بۆ داناون.

• کتێبی (دارەشەکران - ٢٠٠٧) ئامادەکردنی: سەفین گەردی و هەندرێن خۆشناو، لەسەر ئەرکی وەزارەتی ڕۆشنبیریی لە هەولێر چاپکراوە.

ئەم کۆمەڵە بریتیە لە حەیران و گۆرانی لە هۆنراوەی خۆی و بۆخۆی ئاوازی بۆ داناون.

• کتێبی (پەنگر - ٢٠٠٨) ئامادەکردنی: سەفین گەردی و هەندرێن خۆشناو، لەسەر ئەرکی کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردی لە هەولێر چاپکراوە، کە بریتیە لە حەیران و سروود، لە نووسینی خۆی.

**" ساڵی ١٩٧٨ ڕوو لە شاری (لەندەن) دەکات بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەریەکی گەورەی دڵ "**



# یەکەم دیدارم لەگەڵ ڕەسووڵ بیژار گەردی

تارق جەوهەر سارمەمی

لە ١٥-٥-١٩٩٢ بۆ یەکەم جار دەستم بەکاری ڕۆژنامەنووسی کرد لە کەناڵی گەل، کە سەر بە پارتی گەلی کوردستان بوو، جگە لەوەی وەک بێژەر و پەیامنێر لە رادیۆ و تەلەفزیۆن دەست بەکار بووم.

هەر زوو بیرم لەوەش کردەوە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی پێشکەش بکەم، سەرەتا بەرنامەی (گەشتی کامیرا)م پێشکەش کرد، کە لە ئامادەکردن و دەرهێنانی (مەهدی ئەلزوبەیدی) بوو، زوبەیدی دەرهێنەرێکی عەرەب بوو لە هەولێر دەژیا، نازانم ئێستە ماوە، یان نا.

پێنج شەش ئەلقەم لە بەرنامەکە پێشکەش کرد، ماوەکەی (١٠-١٥) خولەک بوو، دوای من هەریەک لە بەڕێزان (هونەرمەند تەنیا کەریم، برزۆعەلی هەژار، هونەرمەندی خوالێخۆشبوو فەرهاد ئیسماعیل) یەک لەدوای یەک پێشکەشیان کرد، پاشان بەرنامەیەکی هونەریم ئامادە و پێشکەش کرد بەناوی (لەیادی نەمران) کە لە دەرهێنانی کاک (دلاوەر ڕەسوول حەریری) بوو، وێنەگری بە ئەزموونی ئەوسا خوالێخۆشبوو کاک (عزەدین) چاوپێکەوتنەکانی بۆ تۆمار دەکردم.

ڕۆژێک بەرنامەی لە یادی نەمرانم تەرخانکرد بۆ بەسەرکردنەوەی ژیان و بەرهەمەکانی هونەرمەندی گەورە مامۆستای کۆچکردوو (تایەر تۆفیق) سەردانی شاری (کۆیە)م کرد و لەگەڵ کاک شەفیقی برای هونەرمەند تایەر تۆفیق چاوپێکەوتنم کرد، پاشان لەگەڵ وێنەگری بەرنامەکە کۆچکردوو کاک (عزەدین) چووینە سەرقەبری خاڵە تایەر و چەند دیمەنێکی قەبرەکەیمان تۆمار کرد. لەهەولێریش چەند چاوپێکەوتنێکم لەگەڵ چەند هونەرمەندێکی گەورە، کە هاوڕێی نزیکی خاڵە تایەر بوون کرد، ئەوانیش مام ڕەسوول بێژار گەردی، فوئاد ئەحمەد و وریا ئەحمەد بوون.

لەیادی ماڵاوایی کۆچی پاشای مەقام و حەیرانی کوردیی و بۆ ئە دۆسیەی گۆڤاری دیوان دەمەوێت بەو پەری ڕێزەوە باس لەو چاوپێکەوتنە بکەم، کە لە ڕۆژێکی کۆتاییەکانی مانگی ئەیلول لەگەڵ مام ڕەسووڵ گەردی تۆمارمان کرد. لەگەڵ کاک عزەدین-ی وێنەگر چووینە ماڵی مام ڕەسووڵ لە نهۆمی خوارەوەی یەکێک لە شووقەکانی گەڕەکی ئیسکان بوو، لە دەرگەمان دا مام ڕەسووڵ خۆی دەرگەی لێکردینەوە کراس و بێجامەکی لەبەر دابوو، بە ڕوویکی خۆش بەخێرهاتنی کردین و گوتی: کەسی خاری بەخێربێن فەرموون وەرنە ژووری، بۆ من، کە تەمەنم ٢٢ ساڵ بوو یەکەم جاربوو لە نزیکەوە ئەم هونەرمەندە گەورەیە بە جلوبەرگ و کڵاوجەمەدانی کوردیی ببینم.

> **دوای ماوەیەک مام ڕەسووڵ جلوبەرگێکی کوردیی جوانی لەبەر کردبوو هاتەوە و گوتی: کەسی خارەی ئەوەها باشە**


تارق جەوهەر لە کاتی دیداری لەگەل رەسوول گەردی



ئەوسا مۆبایل نەبوو، تا پێشتر قسەی لەگەڵ بکەم ڕەزامەندی و مەوعیدی چاوپێکەوتنەکەی لێ وەرگرم. بۆیە وەک میوانی ناوەخت خۆمان بەماڵی مام ڕەسووڵ دا کرد و پێمان گوت: مام ڕەسووڵ هاتووین لەسەر پەیوەندیی و بیرەوەری نێوان خۆت و هونەرمەندی گەورە مامۆستا تایەر تۆفیق چاوپێکەوتنێکت لەگەڵ بکەین. گوتی: کەسی خارەی بەخێر بێن کارێکی باش دەکەن کاک تایەر هونەرمەندێکی گەورەیە و جێی خۆیەتی بەڵام بابچم خۆم بگۆرم. ئەو ماوەیەی تا خۆی گۆڕی و هاتەوە من و کاک عزەدین-ی وێنەگر سەیری ژوورەکەمان دەکرد، دیواری ژوورەکە بە چەندین مافوری ڕەنگین و وێنەی یادگارییەکانی خۆی لەگەڵ هونەرمەندانی کورد و عەرەبی ڕازێنرابۆوە. وێنەکانی لەگەڵ سەباح، سەمیرە تۆفیق و خاڵە تایەر زیاتر سەرنجیان ڕاکێشام، بە بایەخەوە لە وێنەکانم دەڕوانی کاکی وێنەگرەکەشم خەریکی هەڵبژاردنی شوێنێک بوو بۆ ئەوەی لێی دانیشین و چاوپێکەوتنەکەی لێ تۆماربکەین.

> گوتی: کەسی خارەی بەخێر بێن کارێکی باش دەکەن کاک تایەر هونەرمەندێکی گەورەیە و جێی خۆیەتی بەڵام بابچم خۆم بگۆرم

دوای ماوەیەک مام ڕەسووڵ جلوبەرگێکی کوردیی جوانی لەبەر کردبوو هاتەوە و گوتی: کەسی خارەی ئەوها باشە بە وێنەگرەکەی گوت: لەکێ دانیشم، ئەویش شوێنەکەی دیاری کرد و دانیشتین، کاک عزەدین ماوەیەک هەر خەریکی ڕێکخستنی وایت بلانس و گۆشەی کامێراکەی بوو، تا دواجار گوتی: هەموو شت تەواوە، بەم جۆرە دەستمان بە چاوپێکەوتنەکەمان کرد.

دەرکەوت سەرەتای پەیوەندیی نێوان هونەرمەند ڕەسووڵ گەردی لەگەڵ هونەرمەند (تایەر تۆفیق) دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی ساڵانی چلەکان و تا ڕۆژی مردنی تایەر تۆفیق بەردەوام بووە. لەوبارەوە هونەرمەندی کۆچکردوو ڕەسووڵ بێزار گەردی گوتی: (لەگەڵ کاک تایەری هەڤاڵ بوویمە، برادەر بوومە، هەتاوەکینی کۆچی دوایی کردیە، شەو و ڕۆژیش لەکنە من بووە هەتا پێش ئەوەی کۆچ بکات) هەروەک ئاماژەی بەوەکرد، کە خاڵە تایەر شارەزاییەکی زۆری لە ماقامات هەبووە، وەک مەقامەکانی: (حجاز و کورد) و گوتی: (پێشان مەقامەکان هەمووی بەکوردیی هەبوو وەک مەقامەکانی: (ڕاست، سەبا، نەوا، هومایون، ئیبراهیمی، لامی، هەتا لە قەتارو ئەلاوەیسی) مامۆستا بوو.

دەیگوت: کاک تایەر بۆی مەدرەسەیەک بووە، مەدرەسەی هەمووشمان ئێمە مانان هونەرمەند (عەلی مەردان)ی نەمر بوو. چونکە ئێمە دەبێ ئەویش لەبیر نەکەین، مامۆستا عەلی مەردانی نەمر وەکو چۆن بڵێی کوپە گەوهەرەکی ببینیەوە، کاک تایەر خۆی کوپە گەوهەرەک بوو بۆ ئەساس و توراسی کوردیی. ئەوانە هەرکەسە بەنەوعی خۆی قیمەتەکی هەبوو، بەڵام ئی کاکە تایەر تۆفیق-ی شەو و ڕۆژ، لەیل و نەهار لەگەڵ من بوو، یەعنی هەتا باسی بکەی هی کاکە تایەر تۆفیق-ی باسەکەی بە چاکەو بۆ هونەری کوردیی هەوڵەکانی بۆ خزمەتی هونەری کوردیی باس بکەی دوایی نایێ.

لێم پرسی، مامۆستا بۆیەکەم جار کەی مامۆستا تایەر تۆفیق-ت ناسی؟

هونەرمەند ڕەسووڵ بێزار گەردی لە وەڵامدا گوتی: ساڵی ١٩٤٥ لە کۆیەم ناسی، لە باخچەیەک دانیشتبووم پێیان دەگوت (ئۆمەرخۆچان) ئەمن بووم کاک جەنگی و مەحموود ئاغا بوون، جەماعەتەک بوون، ئەو کاک تایەر تۆفیق-ش لەسەر کانییەکی دانیشتبوو لەگەڵ برادەرەکی ناوی کاک حوسێن بلباسە، گاسیان کرد گوتیان کاک ڕەسووڵ ئەوە دەنگی زۆر خۆشە، بەڵام ئەویش هێشتان نەچووبووە ئیزاعەی، ئەمن کە ناسیتم نەچووبووە ئیزاعەی.

منیش لێم پرسی ئەتوو پێش ئەو چووبوویە ئیزاعەی؟ مام ڕەسووڵ گەردی گوتی: (نەخێر، ئەمنیش نەچووبووم تێگەیشتی، ئەوی کە لوت باس دەکەم ساڵی ١٩٤٥- ە، پاشان کاک تایەر هات لەگەڵ من قسەی کرد، گوتم کەسی خاری هەندەکی لۆ خاری خۆت برێ. ئەوەبوو هەندەکی گوت و کەوتە بەر دڵی من، لەو ساوە بووینە برا.

چەند کتێبمان چاپکرد، چەند ڕابواردنەکمان ڕابوارد، لەو زورگ و تەلانانە چەند نەورۆز-مان پێکەوە کردییە لە بۆ کوردستان، ئەوی



ڕەسوول گەردی لە کاتی دیدارەکەی لە گەڵ تارق جەوهەر

لەدەستمان هات، قەت تەخسیرمان نەکرد. ئەمن لە ڕاستەوخۆم پێم وایە ئەمن و کاک تایەر هەردوو وەکی یەکین، کەسی خارەی ئیحترامەن لۆ ئەو قسەیەی هیچی تێدا نییە، حزباتیم نەکرد کورد بووم و کورد بووم، ئێستەش سەرم لە بن پێی کوردە، بسم الله الرحمن الرحیم، بەناوی خوای، بەناوی کوردستانی ڕەنگین، ئەمن سەروماڵم پێوەنییە لە بۆ ئەو کوردەی، کە چاوی لەو کوردستانەی بی، ئەو کوردستانە کوو ڕزگار بووە بیپارێزین، ئەوها بە ڕزگاری بژین. هەتا دەمرم قەت قەت کاک تایەری لەبیر ناکەم، چونکە کەسێکی وەک ئەو دروست نابێتەوە، دختۆر دەبێتەوە لە دختۆری چاکتر، بەڵام هیچ فەنانەک ناگەنە ئەو فەنانانەی کە پێشان هەبووە، ئەبەدەن ئەبەدەن ناگەنێ، تەقلید دەکەن، لەباتی تەقلیدەکەی شتەکی بکا باشترە، داهێنانەک لۆ خۆی بکات، مۆسیقی لۆی بکەن کەلیماتەکی تازە، خەڵک گوێی لێ ڕادەگرێ، دەزانێ چ هەیە، چ نییە، بەڵام هەر فۆلکلۆرەکە، سەبر سەبر دیوارەکەیان خراپ کردیە برەکی مایە بڕوخێ، هەندیان لێکۆڵیتەوە هەندیان لێکۆڵیتەوە وەکی دارەکی بێ ئاو سیس دەبێ و دەچەمێتەوە ئەوهایان لێ کردییە، چونکی ئەو فۆلکلۆرە هی باپیرە گەورەمانە، هی ئەژدادمانە،



کەسی خارەی ساحێبی هەیە بەران ساحێبەکەی ئەو مێژووە نەمایە ئەو مێژووەی نووسیبێتەوە، خۆ کاردی نییە لە زەوی هاتبتە دەرێ)

پاشان لێم پرسی: کەی خاڵە تایەر یەکەم گۆرانی لە ئێزگەی کوردیی تۆمار کردووە؟

لە وەڵامدا هونەرمەندی گەورەی میللی و مەقامزان و حەیرانبێژ مام ڕەسووڵ بێزار گەردی گوتی: پێم وایە کاکە تایەر لە ساڵی ١٩٤٦ چوویتە ئێزگەی، ئێمە کە لە ئێزگەی خڕبووبینەوە لەساڵی ١٩٤٦-١٩٤٧ بوو، باش بە بیرم دێ، کە ئەو وێنانەی ئێستە لێرە هەنە، لە چلوحەفت گیرایە، کاکە تاهیر، عەلی مەردان و حەسەن جەزراوی بادینی، کە قەت قیمەتی تەواو نابێ، نەسرین شێروان، فەوزییە محەمەد، مام بێزار گەردی. لە شۆڕشی عەبدولکەریم قاسمی جەماعەتەک هاتن وەکو جەماعەتی شەماڵ سائیب و باکووری و جەماعەتی تەحسین تەها، محەمەد عارف و فوئاد ئەحمەد-یش ئەوانەش هەموو خۆشەویستی منن، تێگەیشتی کەسی خاری. ئەوجا پاشی وی لە شۆڕشی دیکە خەڵکی تر هاتن و هۆڵەکە پڕ بوو. ئەمەش تاقەت و شەنگمان لێ بڕا و ئێشم خەلاس بوو. ئێستەس تکام لەو هونەرمەندانە هەیە، کە تازە پێ ڕادەگەن ئەمە ئسپات دەکەم، کە دەنگیان زۆر خۆشە، دەنگیان لێ هاتییە، شیعری تازە و کۆن وەربگرن، شیعری کۆن لەتازە خۆشترە، هی تازە لە کۆن خۆشترە، ئەو شیعرانە وەربگرن بکەنە گۆرانیی، بکەنە مەقام، مۆسیقاش پێشکەوتووە، با توانای خۆیان بەدەر بێخن خەڵک گوێیان لێ ڕابگری و کەلیماتی تازەی لە گوێدا بزرنگێتەوە، ئەو پێی باش بوو هونەرمەندان تەنیا پشت بە فۆلکلۆر نەبەستن بەڵکو پێویستە سوود لە هۆنراوەی کۆن و نوێی شاعیران وەربگرن، دیاریش بوو زۆر بێزاربوو لەوەی، کە هەندێک لە گۆرانیبێژان لە دووبارەکردنەوەی گۆرانیی و بەرهەمەکان وشە و هۆنراوەکان دەشێوێنن، بۆ ئەمەش گوتی: دوو کەلیمە لۆت ئیسپات دەکەم کەسی خارەی، بزانە ئەو گۆرانی (هەوری لارە) کووە لەگەڵ ئەو (هەوری لارە)ی کە پێشان هەبووە:

> ئاماژەی بە دوو شوێن کرد لە ژوورەکەی گوتی: ئەوە جێی شەماڵ-یە ئەوەشیان جێی کاک تایەر-ییە



***مانگە شەو خۆشە هەوری لار مانگ لە پەرێزێ***

***مانگە شەو خۆشە ئەم ئەمام مانگ لە پەرێزێ***

***دۆستی جوانت بێ ئەی هاوار پڕ بە ئامێزێ***

***ئەی کولەجێ ڕێ ڕێ دەسمال چیتی سۆر***

***خۆ من حاکم نیم هەوری لار ڕاتکێشم بە زۆر***

***مانگەشەو خۆشە هەوری لار مانگ لەسەر مالان***

***دۆستی جوانت بێ بەوەفا دەم لەسەر خالان***

***ئەی کولەجێ ڕێ ڕێ دەسمال چیتی کریشە***

***بەینی من و تۆ هەوری لار بەینێکی کێشا***

## دەرکەوت سەرەتای پەیوەندیی نێوان هونەرمەند ڕەسووڵ گەردی لەگەڵ هونەرمەند (تایەر تۆفیق) دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی ساڵانی چلەکان و تا ڕۆژی مردنی بەردەوام بووە

پاشان درێژەی بە قسەکانی داو گوتی: ئەو گۆرانییە فۆلکلۆریانەی وەک: (دەچمە سەر ناڵەشکێنێ، پێم لێنێ پێم لێمەنێ، خەزێمێ کچێ خەزێمێ) ئەوانە ئەگەر ئەسڵیەکەی خۆی و کەلیماتی خۆی بێ ئەو (هەوری لار)ە هەشت قوفلە هەر هەشتی لەسەر مانگ دەڕوا، ئێستە یەکێکی نابینم لەوەی بڵێ تێگەیشتی پێشم ناخۆش نییە ئەو دەنگە خۆشانە شتی ئەوها دووبارە تازە بکەنەوە.

دواتر، کە لێم پرسی هەستت چۆن بوو، کە هەواڵی کۆچی دوایی مامۆستای خوالێخۆشبوو تایەر تۆفیق-ت بیست، مام ڕەسووڵ گەردی بە حەسرەتەوە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی: دایم لەگەڵم بووە، شەو و ڕۆژ حەیاتمان پێکەوە ڕابواردییە، ئەو و کاک شەماڵ سائیب، دایم لەکنە من بوون، ئاماژەی بە دوو شوێن کرد لە ژوورەکەی گوتی: ئەوە جێی (شەماڵ)یە ئەوەشیان جێی کاک (تایەر)ییە.

هەر لە چاوپێکەوتنەکەدا بەم جۆرە باسی لە دوایین دیداری نێوان خۆی و هونەرمەند تایەر تۆفیق کرد و گوتی: ڕۆژەک کاک تایەر لێرە بوو، تەلەفۆن لێی دا، چوو هەڵیگرت و پێی گوتم: ئەوە دکتۆر (سەباح ئەلخەتیب)ە ئەتووی دەوێ لەبەغدایێ. کە تەلەفۆنەکەم لێ وەرگرت دکتۆر گۆتی: کاکە ڕەسووڵ ئەتو لازمە سبەینێ لە بەغدایێ حازر بی، گوتی فحوساتت هەیە. ئەو قسانەی مام ڕەسووڵ چەند ڕۆژەک پێش مردنی خاڵە تایەر بوو، بۆیە هەر لە پاش تەلەفۆنەکە ڕوو لە خاڵە تایەر دەکات و پێی دەڵێ: کاکە تایەر ئەوجا چ دەڵێی؟ ئەتو لێرە بە، ئەوە کەیفی و سەفین لێرە خزمەتت دەکەن، بەلام خاڵە تایەر دەڵێ: نا ئیزنم بدە ئەمنیش دەچمە (کۆیێ) سەرەکی لە (کۆیە) دەدەم هەتا ئەتوو دێیەوە، بەلام دوای چەند ڕۆژەک، کە مام ڕەسووڵ لە بەغدا دەگەڕێتەوە، لە ماڵ دەبێت زەنگی تەلەفۆنەکەی لێ دەدات و دەڵێ کێ قسان دەکات؟

کاک جیهانبەخش پێی دەڵێ: (کاک ڕەسووڵ، دەزانی ئەوشۆ کاک تایەر تۆفیق عەمری خوای کردییە! مام ڕەسووڵ-یش ڕاست تەلەفۆنەکەی دادەنێ بێ سێ و دوو دوا لە دۆستەکانی دەکات وەرنە دووم ئێستە دەبی بچینە (کۆیێ) وەک خۆی لە چاوپێکەوتنەکە ئاماژەی پێ دەکات: خوا هەڵناگرێ باوکی کاک تایەر تۆفیق-ی کاک محەمەد هات ئەمنی هەڵگرت ڕاست چووینە کۆیە، گەییمە سەر شاردنەوەی جەنازەکەی، چوار شەو و چوار ڕۆژان لە تازیەکەی هونەرمەندی گەورە و دۆستی هەرە نزیکم دانیشتین.

**• چاوپێکەوتنێکی بلاونەکراوە لەگەل ڕەسوول بێزار گەردی ساڵی ١٩٩٣**



تایەر تۆفیق و ڕەسووڵ گەردی



# ڕەسووڵ گەردی گرنگییەکی زۆری بەشیعری خۆی داوە

د. مارف خەزنەدار

ئەوی لەبیرم مابێت بۆ یەکەمین جار لە ڕۆژگاری مێردمناڵیم ناوی دوو گۆرانیبێژی هەولێرم بەرگوێ کەوت بوو. لەو سەردەمە گۆرانیبێژی میللی لەشار زۆر بوون، بەڵام وەک ئەو دوو زاتە بەناوبانگ نەبوون، منیش تەنیا ئاشنای دەنگی ئەو دوو کەسە بووم، یەکێکیان ڕەسووڵ بێزار گەردی، کە بە حەیرانبێژ ناسراوبوو و ئەویتریان حەیدەر عەبدولڕەحمان (حەیدەرە کەچەل) بەقۆریاتبێژ ناوبانگی دەرکردبوو، لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو لەبەغدا ئاشنایەتیم لەگەڵ هونەرمەندان عەلی مەردان و تاهیر توفیق و ڕەسووڵ بێزار گەردی پەیداکرد، ڕەسول بێزار گەردی جێگەیەکی دیاری هەبوو لەپێوەندی برادەرایەتی لەناو دڵی مندا، بۆیە لەپاش یەکترناسینمان تەنیا لە بەغدا چاوم پێی نەدەکەوت، بەڵکو کە دەهاتمەوە هەولێریش بەدیدەنی شاد دەبووم، هۆی ئەمەش ئەوە بوو، کە حەزم لەحەیرانەکانی دەکرد. لە هەموو جێیەک لەو کاتەی لە تەنیشت یەکتر دادەنیشتین بەدەنگی نزمیش بووبێ دەیتوانی دەمی لەگوێم نزیک بکاتەوە و یەک دوو کەرتم لە حەیرانەیەک بۆ بڵێ، کە هەر ئەو کاتە دەیهۆنیەوە و بۆی دەهات.

من تەنیا لەبەر ئەوە لە ڕەسووڵ گەردی نزیک نەبووم چونکە هونەرمەند بوو، بەڵکو داهێنەرێکی سروودی نیشتمانیش بوو، دەنگی لەگەڵ حەیرانی دەشتی هەولێر خۆش مەشرەب بوو، بۆ من نەهاتووە بڵێم هێندەی حەزرەتی (نالی) لە جێتی ئەم حەیرانە شارەزا بوو، بەڵام ڕەسووڵ گەردی چی لەو کەمتر نەبوو.

ڕەسووڵ گەردی گرنگییەکی زۆری بەشیعری خۆی داوە، لە ڕووی دانان و ئاواز و چڕینیانەوە، هەروەها بۆ ئەوەی ڕزگاریان ببێ لەفەوتان هەوڵی دەدا بڵاویان بکاتەوە، تەنیا ئەوانەی بڵاودەکردەوە، کە خۆی ئاوازی بۆ دادەنا و دەیانیچڕی.

ڕەسووڵ بێزار گەردی لەسەرەتای ژیانی هونەری حەیرانی باو و بەناوبانگی سەردەمی خۆی بەئاواز وتووە (کە ئەمەش دەچێتە پاڵ داهێنانەکانی هونەرمەند) بەڵام لەدواییدا خۆی حەیرانی داناوە و چاپ و بڵاوی کردوونەتەوە، ئەمانیش شەقلی گشتیی حەیرانی دەشتی هەولێریان تێدا بەدی دەکرێ و بەسۆز و چێژ و بلیمەتی هونەرمەندانەش قانگ دراون و چەند لاپەڕەیەکیشی لەتۆماری حەیران زیاد کردووە. لە شیعرە بڵاوکراوەکانیشی دەردەکەوێت هەموویان بۆ مەبەستی ئاواز و گۆرانی دانراون (لیریکین) نەک شیعرێک بۆ خوێندنەوە بێ وەکو چیرۆک و ڕۆمان.



ڕەسووڵ گەردی، ؟، د. مارف خەزنەدار

# ڕەسووڵ گەردی لەو زەمەنە ژیا، کە حەیران ڕەزم و ڕیتمێکی تایبەتی نەبووە





ئامانج غازی

یادکردنەوەکانی ڕۆژانی ماڵاوایی هونەرمەندان لەلای میللەتی کوردەوە بەوە ناوزەد دەکرێ، کە لەو ڕۆژانەدا تەنیا بە چەند پەیڤێک بەسەریان بکەینەوە و بەس! کە باس لە مێژووی موزیکی کوردی دەکرێ، دەبێ لە دەنگە ڕەسەنەکانەوە دەست پێبکەین، ئەو دەنگانەی لە نێو تەمومژی (موزیکی بێگانە بە کورد) توانیان مۆرک و ئەدای هونەرییان بپارێزن و وا لە گوێگری غەیرە کوردیش بکەن بە تامەزرۆیی و هزرێکی قووڵەوە گوێڕادێری بن.

ئەمڕۆ کە باسی (ڕەسووڵ بێزار گەردی) هونەرمەند و خاوەن سەدان حەیرانی کوردەواری دەکەین، پێویستە هەڵوێستەیەک بکەین و سەرنجی گوتن و نوێکردنەوە و ئادای حەیران بکەین لەو حەفتا ساڵەی، کە کەوتۆتە سەر قەوان و ڕێکۆردەر، دەبینین بەرهەمەکان هیچ گۆڕانکارییەکی ئەوتۆی لەڕووی هونەریی و قاڵب و ناوەرۆکەوە بەخۆوە نەبینیوە، جا داخەکەم (ڕەسووڵ بێزار گەردی) هونەرمەند لەو زەمەنە ژیا، کە حەیران ڕەزم و ڕیتمێکی تایبەتی نەبووە! موزیک باکگراوندی دەنگە بەهێزەکان نەبوو، تێگەیشتن بۆ مەقام و ئادای حەیران سەرپێیانە بڕیاری هونەری لەسەر دەدرا، بۆیە لەم یادە و ئەم ڕۆژە پڕ حەیرانە پێویستە ئاماژە بۆ خاڵێکی گرنگ بکەین ئەویش ئەوەیە، کە هەتا زووە هەر هەموومان واز لەو چێژە کاتییە بهێنین، کە حەیرانبێژێک لە ساتەوەختێکی زۆر کەمدا پێمان دەبەخشێ، با بیر لەوە بکەینەوە کە (حەیران) وەک یەکەیەکی هونەریی سەربەخۆ بخەینە قاڵبێکی هونەریی و لەتەک قاڵبی (سۆناتە) و(سەمفۆنیا) دایبنێین، پێویستە هەوڵێکی دڵسۆزانە لە ئارادابێت بۆ سڕینەوەی ئەو (نۆتە) بێگانانەی، کە ئادایەکی غەیرە کوردییان پێوەدەکرێ و لە (حەیران)دا ئێستە زۆر بە زەقی هەستی پێدەکرێ.

لە بیرمە ئەو ڕۆژەی (ڕەسووڵ بێزار گەردی) مەرد لە نێو حەشاماتێکی هونەری تیپی چالغی بەغدادی و کۆمەڵێ ژەنیاری نابینا و بەدەیان بلاجکتۆر و کامێرای بەترس و زمانی لێک حاڵی نەبوون و لە هەمووشیان ناسکتر ئەو پیشەکی و موزیکەی، کە ویستیان مەقامی (حەیران)ی پێ ببەنەوە سەر ڕێچکەی ئادای عەرەبی، لە بیرمە بێگوێدان بەو هەموو خەڵکە (حەیران) بوو بە بوورکانێک و هەموو ئەو دەستە لەرزۆک و شتانەی ڕاماڵی، کە ویستیان هەیبەتی ئەو مەقامە ڕەسەنە کوردییە بشکێنن (ڕەسوڵ بێزار گەردی) هونەرمەندێکی بێ نازبوو، یەکەم هونەرمەندی کوردیشە لەو بوارە، توانیویەتی ئەدای حەیران لە مەقامی بەیات بشکێنێ و مەقامەکانی حیجاز و سەبا و نیوەشەوە بخاتە نێو ئەو میانە کوردییانەی، کە خۆی ئەدای دەکرد.



> ڕەسوڵ بێزار گەردی هونەرمەندێکی بێ نازبوو، یەکەم هونەرمەندی کوردیشە لەو بوارە، توانیویەتی ئەدای حەیران لە مەقامی بەیات بشکێنێ و مەقامەکانی حیجاز و سەبا و نیوەشەوە بخاتە نێو ئەو میانە کوردییانەی، کە خۆی ئەدای دەکرد




# ڕەسووڵ بێزار گەردی پاشای حەیرانی کوردە؟



ئا: هەندرێن

مامۆستا ڕەسووڵ بێزار گەردی بەدرێژایی تەمەنی هونەری، چەندین نازناو و پاشناوی پێبەخشراوە، لەوانە (پاشای حەیران) و (میری حەیرانی کورد) و (شێخی حەیرانبێژان) و (مامۆستای مەقام و حەیران) و چەندین نازناوی دی، ئەم نازناوانەش هەر لە خۆرا و تەنیا لەبەر هەواداریی و سۆزداریی پێی نەبەخشراوە، بەلکو چەندین هۆ و هۆکاری خۆیان هەیە، کە بوونەتە هۆی ئەوەی، کە ئەم کەڵە هونەرمەندە پێشەنگە لەم بوارەدا چەندین خەسڵەتی هونەریی و پێشڕەویی و دەستپێشخەریی هەبووە، بە بەراورد لەگەڵ حەیرانبێژانی پێش خۆی و سەردەمی خۆی و هەروەها حەیرانبێژانی دوای خۆشی. لە خوارەوەدا ئەم هۆ و هۆکارانە دەخەینەڕوو:

- هەموو گۆرانیبێژێک یان حەیرانبێژێکی سەرکەوتوو، پێش هەموو شتێک پێویستە خاوەن دەنگێکی خۆش و جۆشدار بێت. هەروەها پێویستە خاوەن گوێیەکی مۆسیقایی بێت، بۆئەوەی نۆتە و تۆنەکان بناسێتەوە، و دەنگی خۆی لەگەڵ ئەواندا بسازێنێت و لەسەر ئاستی ئەوان گۆرانی یان حەیران بچڕێت، دوایی پێویستە لەسەر حەیرانبێژ کە شارەزایی لە جۆرەکانی مەقام هەبێت، بەتایبەتی مەقامی بەیات، چونکە حەیران لەسەر مەقامی بەیات دەگوترێت. دوایین خەسڵەتیش ئەوەیە، کە حەیرانبێژ دەبێت خاوەن هەناسەیەکی درێژ بێت، بۆئەوەی بتوانێت بەندەکان (سەربەند و ناوبەند و دوابەند) بەتەواوی و لە شوێنی خۆی بەپێی ئاوازی دارێژراوی مەقامی بەیات تەواویان بکات. ئەم پێنج خەسڵەتانە هەموویان لە خودی هونەرمەند ڕەسووڵ بێزار گەردیدا کۆببوونەوە، کەوا لە هیچ حەیرانبێژێکی دیدا هەموویان کۆنەبوونەتەوە، هەیە کە چەند خەسڵەتێکی تێدا کۆببێتەوە، بەڵام هەر هەموویان نەخێر نەبووە، بۆیە وا بە ئاسانی ئەم هونەرمەندە نەبۆتە پێشڕەو لەم بوارەدا.

- یەکەم کەس بووە حەیرانی لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن چڕیوە و دواییش تۆماریکردووە، لە سەرەتاکانی ساڵانی چلەکانی سەدەی ڕابردوو یەکەم ئاهەنگی بە پەخشی ڕاستەوخۆ لە ئێزگەی بەغدا بەشی کوردی سازداوە.

- یەکەمین هونەرمەندی حەیرانبێژی کوردە، کە حەیرانی لەسەر قەوان تۆمارکردبێت.

- یەکەم کەس بووە، کە حەیرانی نووسیوەتەوە و لە چەندین کتێبدا بڵاوی کردوونەتەوە، بۆخۆی حەیرانی داناوە و دایڕشتووە.

- یەکەم کەس بووە حەیرانی لەگەڵ مۆسیقادا گوتووە.

- یەکەم کەس بووە حەیرانی لەسەر مەقامی سەبا و حیجاز و نیوەشەوە گوتووە، چونکە ئەوەی، کە ئاشکرایە حەیران لەسەر مەقامی بەیات دەگوترێت، ئەو هونەرمەندە ئەمرە ئەو جورئەت و بوێریی و توانایەی هەبووە، کە بتوانێت حەیران لەسەر مەقامەکانی دیش بڵێ. ئەمەش شارەزایی و لێهاتوویەکی چاکی دەوێت لە جۆرەکان و شێوازەکانی مەقام.

- یەکەم کەس بووە کە شیعری کلاسیکی کردبێتە حەیران، زۆر شارەزایانە ئەم کارەی کردووە، کە خەڵکی هەستی پێناکەن.

- یەکەم کەس بووە کە سروودی نیشتمانی و هۆنراوەی نیشتمانی بە حەیران بچڕێت.

- یەکەم کەس بووە، کە حەیرانی تێکهەڵکێش کردبێت لەگەڵ بەستە، حەیران و بەستەی ئاوێتەی یەک کردبێت، دوای هەر حەیرانێک بەستەیەکی گوتووە، بۆ زیادکردنی ئاواز و ڕیتمێک و چێژێکی نوێ و جیاواز بۆ حەیران.

- دەستپێشخەر و پێشەنگ بووە لە گواستنەوەی حەیران لە قۆناغی گوتنی لە کۆڕ و مەجلیسان بۆ قۆناغی گوتنی لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن، بەمەش حەیران پێینایە قۆناغێکی گرنگ لە بڵاوبوونەوە و گوتنەوەی لەگەڵ تیپە مۆسیقاییەکاندا...هتد، بەمەش لە پێشەنگی هەموو حەیرانبێژانی کوردستانەوە دێت.

- بێجگە لەوەی، کە حەیرانبێژێکی بەتوانا و بلیمەت بووە، حەیرانزان و حەیرانناس و حەیراننووسیش بووە.

- یەکەم هونەرمەندی کوردی شێوەزاری سۆرانی بووە، کە هۆنراوە و گۆرانی و لاوک بە شێوەزاری بادینی بنووسێتەوە و دواییش ئاوازی بۆ دابنێت و بیکاتە گۆرانی و بیچڕێت.

- یەکەم کەس بووە، کە سروودی بۆ ڕوخاندنی ڕژێمی پاشایەتی و دامەزراندنی حوکمی کۆماری لە عێراق چڕیوە بە ناوی (چرای ئازادی هەڵکرا) لە شیعری حەبیب عەلی میرانی و ئاواز وگوتنی خۆی ١٩٥٨.

- سەرەڕای ئەمەش شاعیرێکی بەسەلیقە بووە، ئاوازدانەرێکی بەهرەمەند بووە، و ئاوازی بۆ هەموو بەرهەمەکانی خۆی داناوە.

- یەکەم کەس بووە، کە گۆرانی بۆ (هەولێر) گوتووە لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو، لە هۆنراوە و ئاوازی خۆی، و لە کتێبی (بژار – ١٩٥٧) بڵاوکراوەتەوە.



# ڕەسووڵ گەردی خاوەن بەهرەیەکی خوایی بوو

سەرەتای ناسینم لەگەڵ مامۆستا ڕەسووڵ بێزار گەردی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦٨ کە تیپی هونەری مامۆستایان لە هەولێر، بە سەرپەرشتی هونەرمەند واحید مەرجان دامەزرا، منیش لەو تیپە بوومە ئەندام، لەوێ بۆ یەکەم جار چاوم بە مامۆستا ڕەسووڵ گەردی کەوت، هاتبوو بۆ پڕۆڤەکردن، بە جلوبەرگێکی کوردی جوان و خاوێن و هەوریەکی ڕێکوپێک، ئێمەش زۆر بەسەرسامی و بە چاوێکی پڕ لە ڕێز و خۆشەویستییەوە تەماشامان دەکرد و مامەڵەمان لەگەڵ دەکرد، ئەو توانی حەیران گشتگیر بکات و بیگەیەنێتە هەموو گوێچکەیەک، ئەویش بە پەخشکردنی لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی بەغدا، ئەمەش ئەرکێکی زۆر و بوێرییەکی زۆر و حەز و ئارەزوو و عەشقێکی گەورەی ئەو هونەرمەندە دەردەخات بۆ هونەری گۆرانیی و مۆسیقا، خاوەن بەهرەیەکی خوایی بوو.

توانی بۆخۆی ببێتە قوتابخانەیەکی هونەری ڕەسەنی کوردیی، بەتایبەتی هونەری حەیران، بە شێوەیەکی زۆرجوان و شارەزایانە مەقامی دەچڕی، پیاوێکی خۆش مەعشەر بوو، مەجلیسی زۆر خۆش بوو، لە هەموو بوارەکان بێ وێنە و دەگمەن بوو، ئیشی خۆی زۆر خۆش دەویست، لە گۆرانیی گوتنیش، بەتایبەتی لە حەیران، تا ئێستە جێگرەوەی نییە و پەیدانەبووە، ڕاستە هەوڵدان هەیە، بەڵام ئەوانە هەموویان شاگرد و قوتابی ئەون، کاتێک، کە گوێبیستی حەیرانەکانی مامۆستا ڕەسووڵ بێزار گەردی دەبین، دەمانبەنەوە کەشوهەوایەکی بێ وێنە، بۆیە حەقی خۆیەتی پێی بگوترێت میری حەیرانبێژان، وا هەستت دەکرد، کە دەنگی ئەو لەگەڵ سروشت تێکەڵ و ئاوێتەی یەکدی دەبوون، مامۆستا ڕەسووڵ جەماوەرێکی بەرفراوانی هەبوو، بچووبایە هەر شوێنێک جەماوەری هەبوو، خەڵکی خۆشیان دەویست.

ڕەسووڵ گەردی شاعیریش بووە و خاوەن چەندین نامیلکە و کتێبە و شیعری بۆ گۆرانییەکانی خۆی نووسیوەتەوە، هەروەها ئاوازدانەرێکی خۆڕسکیش بووە، ئاوازی بۆ هەموو بەرهەمەکانی خۆی داناوە، کۆچکردنی ئەو هونەرمەندە گەورەیە زەرەرێکی زۆر گەورە بوو بۆ هونەر و موزیک و بواری کەلەپوری کوردیمان، چونکە بەڕاستی ئەو هەڵگری ئەو ناسنامەیە بوو. ئێستە ئەوانەی هەوڵدەدەن حەیران بڵێن جیاوازییەکی زۆریان هەیە لەگەڵ گوتنی ئەو، هەمیشە هیواخوازی ئەوەین ئەو حەیرانبێژانەی ئەم سەردەمە هەوڵبدەن سوود لە ئەزموونی ئەو مامۆستایە گەورەیە وەربگرن، هەرچەندە زۆر ئەستەمە، بەڵام ئەو ڕێچکەیەکی بۆ ئێمەمانان بەجێهێشت، کە بتوانین بەردەوام بین لەسەر ڕێڕەوی ئەو هونەرە ڕەسەنە، چونکە ئەو هونەرە دوو تایبەتمەندی هەیە، حەیران و لاوک و مەقام مۆرکێکی کوردیی تایبەت بە کوردییان هەیە، دووەمیش لای هەمووان ئاشکرایە، کە حەیران تایبەتە بە شاری هەولێر و دەوروبەری.





شێرزاد سەرسپی



# ناوە درەوشاوەکەی حەیرانی کوردیی



نایف شێخانی

بە دڵنیاییەوە مامۆستا ڕەسووڵ بێزار گەردی لە بواری دەنگبێژیی، بە تایبەتیش لە بواری حەیران ناوێکی درەوشاوەیە، بە کۆچباربوونی ئەو بواری مەقام و حەیرانبێژیی کەلێنێکی گەورەی تێکەوت، دیارە بەخشینی ئەو هەموو نازناوانە بەو هونەرمەندە بەرزە نیشانەیەکی دیکەی ئاستی خۆشەویستی و ڕێز و حورمەتی گوێگران و هەوادارانی بەرفراوانی کوردستانە بۆ هونەری ڕەسووڵ بێزار گەردی، کە هەمیشە ئەو هونەرمەندانە لە ژیانی میللەتاندا زۆر دەگمەنن، تا بتوانن وەک ئەو، بەو شێوە بەرفراوانە بیسەران و هەواداران لە دەوری هونەرەکەیان کۆبکەنەوە و ئەو هەموو نازناوانە بەدەست بێنن.

لە ساڵی ۲۰۰۲ -وە، کارم لەسەر چەند حەیران و گۆرانییەکی ئەو هونەرمەندە کردووە، کە لە ئاوازی خۆی بوون، توانیمان بە موزیکی نوێ سەرلەنوێ تۆماریان بکەینەوە، هیوادارم لە ئایندەدا ئەگەر هاوکاریمان بکرێت، بتوانین درێژە بەو پرۆژەیە بدەین، بۆ نوێکردنەوەی ئەو بەرهەمانەی، کە موزیکژەنەکانیان کورد نەبوون و ئەو تەکنۆلۆژیایەی ئێستەیان لەبەردەست نەبووە، بۆ سەر لەنوێ تۆمارکردنەوەی ئەو بەرهەمانە و بەرهەمەکانی هونەرمەندانی دی.

مامۆستا ڕەسووڵ بێزار گەردی توانیویەتی سوود لە مەودای دەنگی خۆی وەربگرێت و ئەو ئاوازانەی، کە دایڕشتوون، وا هەست دەکەیت کە پڕ بە مەودای دەنگی خۆیەتی، ئەوەش بەهرەمەندی و سەلیقەیی ئەو هونەرمەندە دەگەیەنێت. لێرەدا لەوانەیە نەکرێت باس لە هەموو ئەو بەهرەمەندیانەی ئەو هونەرمەندە گەورەیە بکەین، هەر لە مەسەلەی تێکست نووسینی حەیرانەکانی بە سوودوەرگرتن لەو باکگراوندە دەوڵەمەندەی، کە لەو بوارەدا هەیبووە، هەروەها کۆمەڵێک هەوڵی جوانی هەبووە لە نووسینی هۆنراوە بۆ گۆرانییەکانی، لەگەڵ کۆمەڵێک ئاواز بۆ بەرهەمەکانی، لەوەشدا خاوەن بەهرە و سەلیقەیەکی تایبەت بە خۆی بووە. وەکو پێکهاتەی دەنگی ئەو هونەرمەندەش خاوەن پانتاییەکی بەرفراوان بووە و هەست بەو هارمۆنی و جێگیرییە دەکەیت، ئەو کە حەیران دەڵێت جیا لە حەیرانبێژانی دی هەست بە هەناسەبڕکێی و تەنگەتاوی ناکەیت، لە کۆتایی حەیرانەکان و دەربڕین و وەستانەکان هەست دەکەیت، کە گوێ لە بەهرەمەندێک و حەیرانبێژێک دەگریت، کە زۆر شارەزایە لە سەوڵ لێدانەکە و ئەو شەپۆلە دەنگیانە بە تەرازووییەکی جوان و تۆکمە دەیانبڕێت.





# ڕەسووڵ بێزار گەردی

# لە زاری خۆیانەوە

ئامادەکردنی هەندرێن خۆشناو

ماموستا ڕەسووڵ بێزار گەردی کە بەدرێژایی زیاتر لە پەنجا ساڵەی تەمەنی هونەریی، چەندین نازناو و پاشناوی پێبەخشراوە، لەوانە (پاشای حەیران) و (میری حەیرانی کورد) و (شێخی حەیرانبێژان) و (مامۆستای مەقام و حەیران) و چەندین نازناوی دی، ئەم نازناوانەش هەر لە خۆڕا و تەنیا لەبەر هەوداریی و سۆزداریی پێینەبەخشراوە، بەڵکو چەندین هۆ و هۆکاری خۆیان هەیە، کە بوونەتە هۆی ئەوەی، کە ئەم کەڵە هونەرمەندە پێشەنگ بێت، لەم بوارەدا بە بەراورد لەگەڵ حەیرانبێژانی پێش خۆی و سەردەمی خۆی و هەروەها حەیرانبێژانی دوای خۆشی.
بۆیە بیروڕای چەندین نووسەر و هونەرمەندی موزیکژەن و گۆرانیبێژی ناودار سەبارەت بەم کەڵە هونەرمەندە دەخەینەڕوو.

### د. عەزیز گەردی:

### هەموو کەسێک شانازی پێوە دەکرد، گەردییەک بگاتە بەغدا و لەوێوە لە ڕێگەی ڕادیۆوە گۆرانی بۆ هەموو دونیا بچڕێ

خوالێخۆشبوو ڕەســـووڵ بـێـزار گـەردی هونەرمەندی ناوداری کورد بەتەمەن زۆر لەمن گەورەتربوو، لەگەڵ ئەوەشدا من دوو جار ئەوم ناسی. جارێکیان لـەدوورەوە کە تازە قوتابی سەرەتایی بووم لە پەنجاکان لە گوندی بەحرکە، کە تـازە ڕادیـۆ هاتبووە دێ، هـەمـوو ئێواران بەتایبەتی ئێوارەی هاوینان لە دیوەخان و ماڵی ڕادیۆدارەکانەوە چریکەی حەیرانەکانی ڕەسووڵ بێزار گەردی بەرز دەبۆوە و گوندی پڕدەکرد.

دوو هۆ وایان کردبوو بەحرکە ئەوەندە عەوداڵی دەنگی مام ڕەسووڵ بێت. یەکەم گەردی خۆی بـوو، هەموو کەسێک شانازی پێوە دەکرد کە گەردییەک بگاتە بـەغدا و لـەوێوە لـە ڕێگەی ڕادیۆوە گۆرانی بۆ هەموو دونیا بچڕێ، دووەم گۆرانییەکانی بـەزۆری هـەر حەیران و بەستە بوون، لە ڕۆحی میللەتەوە هەڵقوڵاوبوون و تا ناخ لەگەڵ ڕۆحی لادێی دەگونجان. بەساڵاچووەکانی دێ هـەمـوو جـارێ کـە لـە دیـوەخـان و بن مزگەوت و سەرقەبرستان و سەرجێ جۆخێنان کۆدەبوونەوە باسی مام ڕەسووڵ-یان دەکرد، لە ژیـان و بەسەرهات و بەهرەکانی دەدوان. لەوساوە گەورەیی مام ڕەسووڵ لە مێشکی ئێمەی ئەوسا منداڵ چەسپابوو. وەکو مرۆڤێکی بەرز و هونەرمەندێکی لێهاتوو بیرمان لێ دەکردەوە. کە لە پایتەختەوە چریکەی دەگاتە هەموو دونیا و لەڕێی ڕادیۆ دێتەوە نێو دێکەمان.

لێرەدا بـەدەرفـەتـی دەزانــم بـۆ مـێـژوو شتێک لەبارەی مام ڕەسووڵ باس بکەم. مام ڕەسووڵ بێزار گـەردی پیاوێکی قسەخۆش و پۆشتە و پەرداخ و دڵکراوەبوو، حەزی لەجوانترین بەرگ

و خۆشترین خواردن دەکرد. هەمیشە بەدەستە بەرگێکی تازە و پاکوخاوێن و بە چەفیەیکی گەورە و ڕیشوودارەوە دەگەڕا. تابڵێی پیاوێکی سەخی تەبیعەت ودڵ فراوان و میوانپەروەر و بەخزمایەتی بوو، نەفسی زۆر بەرز بوو.

## ئەنوەر قەرەداغی:

### من دەتوانم ڕەسووڵ بێزار گەردی خوالێخۆشبوو بە باڵیۆزی حەیران دابنێم

من ئەوەندە دەڵێم کە لەم کەڵە هونەرمەندەوە گوێم بە حەیران ئاشنابووە، ڕەسەنایەتی و مۆرکی کوردی لە حەیرانەکانی ئەوەوە چووە ناخم، ئێستەش پێموایە، کە هەر باس لە ڕەسەنایەتی هونەری کوردیی بکەین، دەبێت حەیران و مەقامەکانی ئەم هونەرمەندە سەرچاوەیەکی گرنگ بن، بۆ ئەوەی بچینە نێو ئەو سۆزە جوانانەی، کە لە میلۆدی کوردیدا هەن، ئەگەر باس لە حەیران بکەین من دەتوانم ڕەسووڵ بێزار گەردی خوالێخۆشبوو بە باڵیۆزی حەیران دابنێم. تاکە کەس بووە، کە بتوانێت وەک پێویست حەیران بەرجەستە بکات بێ ئەوەی بیشێوێنێت، هەرچ نازناوێک بەم هونەرمەندە گەورەیە بەخشرابێت وەک پاشای حەیران، میری حەیرانی کورد، شێخی حەیرانبێژان، مامۆستای حەیران و مەقام، لەوە زیاتر شایستەی ئەوە، چونکە زۆر بە ئەمانەت و لێهاتووانە ئەو کلتوورە ڕەسەنەی پاراستووە و گەیاندۆتە ئێمەوە، کە پڕە لە ڕاستگۆیی و دڵسۆزیی و پاکیی و خوێندنەوە بۆ ڕۆژانێکی دێرین، کە زۆرێکمان سەرقاڵین بە گەڕان بە شوێنیدا، بۆیە کە گوێمان لە حەیران دەبێت لە هەر جێیەک بێت یەکسەر ئەم هونەرمەندەمان دێنێتەوە بەرچاو، سۆزەکەی دەمانوەستێنێت و تووشی تێرامانمان دەکات و لەگەڵ ئەو ڕاستگۆییەدا دەژین، کە لە دەنگی ڕەسووڵ بێزار گەردیەوە پێمان دەگات، بێجگە لە حەیران چەندین میلۆدی جوانی هەبوو کە ڕەسەنایەتیەکی تەواویان پێوەدیاربوو، کە ئاوازی خۆی بوون، ئەگەر بە شێوەیەکی ئەکادیمیانە مامەڵەی لەگەڵ بکرێت، ئەوا هیچیان کەمتر نین لەو شامیلۆدیانەی، کە لە جیهاندا ئەمڕۆ پێشکەش دەکرێن. ئەم هونەرمەندە نەفسێکی زۆر بەرز و عیزەت نەفسێکی بێ وێنەی هەبوو، چاوی بە هەژارێک دەکەوت بەزەیی پیادەهاتەوە و حەزی دەکرد چی لە گیرفانیدا هەیە بیداتێ.



لە ساڵی ١٩٧٤ هەر جارێک بچووباینە نێو ئەو ئۆردوگایانە کە پەناهەندە کوردەکانی خۆمانی تێدابوون و ئەو بارودۆخەی ئەوانی دەبینی، سەیرم دەکرد مام ڕەسووڵ دەسڕەکەی بە دەموچاویەوە ناوە و دەگریێت و دەیگوت من ئەم کوردە دەبینم دەسووتێم و ئاگر لە هەناوم بەردەبێت، بەردەوام لەگەڵ هەستی خەڵکیدا دەژیا و خەمەکانی خەڵک خەمی ئەو بوون، تا بڵێی مرۆڤێکی نموونەیی بوو. هونەرەکەی ئەو ڕەگی داکوتاوە لەنێو هەموو کوردستاندا، دەبا ئێمەش بەوەفا بین بۆ خۆی و بۆ ئەو هونەرەی، کە بۆی جێهێشتووین، هەزاران سڵاوی لێبێت مامۆستای حەیرانی کورد، حەیرانەکان و کۆی بەرهەمەکانی لەنێوماندا زیندووە و لەنێوماندا دەژیت و لەگەڵیدا هەر دەیڵێینەوە و دەیڵێینەوە.

## خالد سەرکار:

### کەسایەتی ئەو قەت لەبیر ناچێتەوە

ئاگاداربووم، کاتێک یەکێک حەیرانی دەگوتەوە، مامۆستا ڕەسووڵ بێزار گەردی زۆر ڕەخنەی لە کەموکورتییەکان دەگرت لە گوتندا، لە ڕووی هونەری بەرەنگاریەوەش ئەم هونەرمەندە جێگەی خۆی هەبوو لە گۆرانی نەتەوەیی، چەندین بەرهەمی لەسەر نەتەوە و نیشتمان و پێشمەرگە و خاکی کوردستان هەیە، و خۆشەویست بوو لەنێو هەمووماندا، بەتایبەتی لەنێو هونەرمەندان.

## ڕەنجبەر خۆشناو:

### ئەگەر هونەرمەند نەبووایە، ناوی لێ دەنرا پیاوە خاوێن و قۆزەکە

بەڕای من، هەموو ئەو نازناوانەی، کە بە ڕەسووڵ گەردی بەخشراون دەگەڕێنەوە بۆ چەند هۆیەک، توانای دەنگی و شارەزایی لە ئەدای تێکستەکانی حەیران، کە زۆر شارەزایانە و وەستایانە هەڵیدەبژاردن و بە دەنگە زوڵاڵەکەی گوێگرانی سەرسام دەکرد. هەرچەندە بوونی کێبڕکێ، زیاتر جۆش و خرۆش دەداتە بەرانبەرەکەی، بەڵام



مام ڕەسووڵ لێرەش خاڵێکی دیکەی قازانج کرد، بەوەی کە بەربەرەکاری هاوشانی نەبوو، هەر ئەو بووە پاڵەوانی مەیدانەکە. خورەوشتی بەرزی و پاکوخاوێنی ناخ و دەروونی مام ڕەسووڵ زۆر خاڵێکی گرنگە لە ژیانی ئەودا، پێم وایە ئەگەر هونەرمەند نەبووایە، ناوی لێ دەنرا پیاوە خاوێن و قۆزەکە.

هەستی نەتەوایەتی مام ڕەسووڵ لە ڕادەبەدەر بوو، بۆ شایەدی ئەو کاتە ئێمە لە تیپی موزیکی شۆڕش بووین لە ساڵی ١٩٧٤، دوای ڕێکەوتنە شومەکەی جەزائیر شۆڕش تێکچوو، من و مام ڕەسوول بێزار گەردی لە مەریوان بۆ شنۆ بە پاس بەرێکەوتین، هەرگیز لەیادم ناچێت، کاتێک گەیشتینە شنۆ، مام ڕەسووڵ هەر لەسینگی خۆی دەدا و هاواری دەکرد و دەگریا «هەی شۆڕشم ڕۆ، هەی کوردم ڕۆ» ئێمەشی هەموو بەگریان هێنا.

## تایەر تۆفیق:

## لە پاش ڕەسووڵ گەردی، حەیران لە کەسی دیکە حەرامە

مامۆستا ڕەسووڵ بێزار گەردی قوتابخانەیەکی تایبەتیە، بە تایبەتی لە حەیران، لە پاش ئەو حەیران لە کەسی دیکە حەرامە، وەکو بیستوومە و گوێم لێبووە. کاک ڕەسووڵ بە گوتنی حەیران ئێجگار بەرزە، خاوەن دەنگێکی خۆشە، و خۆشەویستی گەلە، جەماوەرێکی زۆری خۆی هەیە، زۆر کەس هەوڵیداوە لاسایی ئەو بکاتەوە، وەکو عارەب عوسمان، ئەویش دەنگی خۆشە.

## عەزیز شاهرۆخی:

## بە نەزەری منەوە ڕەسووڵ بێزار گەردی گەورەترین حەیرانبێژی کوردە

لە تەمەنی ١٧ – ١٨ ساڵیمدا کە ڕادیۆی بەغدا بەرنامەی کوردیی بڵاودەکردەوە، لە ڕووی ئەو ڕادیۆیەوە من دەگەڵ گۆرانیبێژانی ئەو سەردەمی ئاشنا بووم وەکو، مامۆستا تایەر تۆفیق، حەسەن جزیری، کە مەقامبێژێکی زۆر گەورەی بادینانی (بۆتانی) بووە، کابووکێی گوتووە و منیش گوتوومەتەوە، لە منرا بڵاوبۆوە.

بە نەزەری منەوە ڕەسووڵ بێزار گەردی گەورەترین حەیرانبێژی کوردە، نە لە پاش وی و نە لە پێش ویش حەیرانبێژی وامان نەبووە، من بۆخۆم حەیرانم گوتووە هەر لە ڕووی حەیرانەکانی وی گوتومەتەوە، هەروەک چۆن لاوکی (گەنج خەلیل)م لە ڕووی لاوکی (کاوێس ئاغا) گوتووە.

## عومەر دزەیی:

## حکوومەت کەمتەرخەمە بەرانبەر بە هونەرمەندە گەورەکانی خۆی

ڕەسووڵ بێزار گەردی چاپتەرێکی نەخشین و زۆر درەوشاوەیە لە مێژووی هونەری ڕەسەنی کوردیی، جگە لەوەی، کە دەنگێکی زوڵاڵ و خۆش و بێگەردی هەبوو، حەیرانیشی لە فەوتان و ونبوون ڕزگارکرد و لە قۆناغێکی تایبەتمەندیی ناوچەییەوە گواستیەوە بۆ قۆناغی پەخشکردن لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان. من هاوڕێیەتیەکی زۆر نزیکم لەگەڵ ئەودا هەبوو، زۆریشم خۆش دەویست، ئەویش زۆر منی خۆش دەویست، کەسێکی زۆر قسەخۆش و نوکتەباز و خۆش مەشرەب بوو، پیاو لە مەجلیسی ئەو و لە دانیشتن لەگەڵ ئەودا قەت تێرنەدەبوو، ئەوەی کە جێگەی داخە هونەرمەندێکی وەک کاک ڕەسووڵ و کاکە تایەر هەزار ڕەحمەت لە گۆڕیان بێت، کاتێک مردن خاوەن هیچ نەبوون، دوای ئەو هەموو ساڵانەی کە لە خزمەتکردنی هونەری کوردیی بەسەریان برد، لە ئەورووپا هونەرمەندی گەورەی کلاسیکیان هەبوو، وەک چایکۆفسکی و سیبیلیۆز، ئەمانە دەوڵەت مووچەی بۆ بڕیبوونەوە، بۆئەوەی خۆیان بۆ هونەرەکەیان تەرخان بکەن و کاری دیکە نەکەن.

بە بیروڕای من حکوومەت کەمتەرخەمە بەرانبەر بە هونەرمەندە گەورەکانی خۆی. کورد نابێت چاکەی ڕەسووڵ بێزار گەردی قەت لەبیربکات.

## عەدنان کەریم:

### من کە گوێ لە دەنگی مامۆستا گەردی دەگرم، شەرم دەکەم حەیران بڵێم

نازانم تۆنی دەنگم بۆ حەیران دەشێت یان نا. حەیران فۆرمێکە لە مەقامی بەیات، ئەوەی کە زۆر پێمخۆشە، یەکێک لەو حەیرانانەی مامۆستای گەورە ڕەسووڵ بێزار گەردییە، کە بە شێوازی مەقامی سەبا گووتوویەتی، من کە گوێ لە دەنگی مامۆستا گەردی دەگرم، شەرم دەکەم حەیران بڵێم، چونکە حەیران تەنیا لە زمانی ئەو دێت، لە دەربڕینەکەی ئەو دێت، ئەمە پاشخانێکی گەورەی ناوچەیەکی کوردستانە، کە حەیرانی دەشتی هەولێر و ناوچەی دزەییاتیە، لەوانەیە شێوازی مەقام بۆ من ئاسانتر بێت وەک لە حەیران.

لەوانەیە خەڵکی هەست بکەن، کە تۆنی دەنگم بۆ حەیران بشێت، بەڵام تۆنی دەنگ تەنیا ڕۆڵی سەرەکی نابینێت، با نەچمە ژێرفورسایی گوتنی حەیران و تانەی حەیرانبێژەکان و بڵێن حەیرانێکی خراپی گوتووە.

## غەفور مەخمووری:

### ئەو نازناوانەی دراوەتە پاڵ ڕەسووڵ بێزار گەردی، وەک پاشای حەیران پڕ بە پێستی خۆیەتی

حەیرانەکانی ڕەسـووڵ بێزار گـەردی بـەوە لە حەیرانبێژانی دی جیادەکرێنەوە، کە حەیرانەکانی لـە ڕووی فـۆرم و نـــاوەڕۆک و گوتنـەوە تـەواوکـەری یەکدین، زۆرێـک لە حەیرانبێژان، بەداخەوە پەیوەست نینە بە یاسا و ڕێساکانی گوتنی حەیرانەوە، ڕەسـووڵ بێزار گەردی زۆر وەستایانە پەیوەست بووە بەو یاسا و ڕێسایانە، هەم لە ڕووی گوتنەوە، هەم لە ڕووی داڕشتنەوە، هەم لە ڕووی بەخشینی وێنەجوانە هونەریی و کلتوورییەکان لە چوارچێوەی حەیرانەکانیدا، بەڵام ئەمانە لای ئەوانی دی کەمتر هەستی پێ دەکرێت. ڕەسووڵ بێزار گەردی لەم بوارەدا زۆر سەرکەوتووتر بووە، ئەوەشی زیاتر پاڵپشتی ئەو سەرکەوتنەی بووە، شارەزایی ئەو بووە لە بواری مەقامدا، چونکە حەیرانیش جۆرێکە لە مەقام.

لە ڕاستیدا ئەو نازناوانەی دراوەتە پاڵ ڕەسووڵ بێزار گـەردی، وەک میری حەیران، یان پاشای حەیران پڕ بە پێستی خۆیەتی، لەبەرئەوەی چ لە ڕووی دەنگەوە و چ لە ڕووی شێوازی گوتنەوە و چ لە ڕووی داڕشتنی حەیرانەوە دەستێکی باڵای هەبووە، یەکێک بووە لە حەیرانبێژە هەرە سەرکەوتووەکانی کـورد، ئـەو تێکستانەی کە دایڕشتوون و لە کتێبەکانیدا چاپیکردوون و بڵاویکردوونەوە حەیرانی تەواو کامڵن.

## بورهان خۆشناو:

### توانیویەتی حەیران لەسەر ئاستی هەر چوار پارچەی کوردستان بناسێنێت

مامۆستا ڕەســووڵ بـێزار گــەردی لـە ڕووی جـوگـرافیـەوە شـارەزاییـەکـی تـەواوی لەسەر ناوچەکانی هەولێر، بە تایبەتی و کوردستان بە گشتیی هـەبووە، بەمەش ئیلهامێکی جوانی بۆ هاتووە لە داڕشتنی حەیرانەکانی و بەکارهێنانی ئەو شارەزاییە لە تێکستەکانی دا، هەموو کەس نەیانتوانیوە ئەو کارە بکەن، مامۆستا ڕەسووڵ توانیویەتی مێژوویەکی زێڕین بۆخۆی تۆماربکات لە بواری حەیران و هونەر بە گشتیی، توانیویەتی حـەیـران لـەسـەر ئـاسـتی هـەر چـوار پـارچـەی کـوردسـتـان بناسرێنێت. ئـەمـەش شانازییەکی گەورەیە بۆ گەلی کورد و بۆ هونەرمەندانی کورد و بۆ ئەرشیفی گۆرانیی و موزیکی کوردیی، ئەرشیفێکی چاکی لە بەرهەمەکانی خۆی هەبوو، کە لەسەر قەوان تۆمارکرابوون، ئاوازدانەریش بووە، خۆی ئاوازی بۆ بەرهەمەکانی خۆی داناوە. زۆربەی تێکستی بەرهەمەکانیشی هەر هی خۆی بووە، چ لە بواری گۆرانیی و چ لە بواری حەیران.

خاوەن دەنگێکی زۆر زوڵاڵ و کوردییی و ڕەسەن و خۆش بووە، ئومێدەوارم پەیمانگە و کۆلێژی هونەرە جوانەکان و ئەو دەزگا هونەرییانەی، کە تایبەتن بە بواری گۆرانیی و موزیک، خوێندنەوە و توێژینەوەی چاک لەسەر بەرهەمەکانی ئەو کەڵە هونەرمەندە بکەن، بەتایبەتی لەسەر مەقامە کوردییەکان، وەکو لاوک و حەیران و هۆرەی جافایەتی و قەتار و ئەڵاوەیسی.

کاریان لەسەر بکرێت، بۆئەوەی نەوەکانی داهاتوو بتوانن بـە شێوازێکی جـوان و هونەرییانەتر دووبارەیان بکەنەوە، نەوەک بیشێوێنن.



## وریا ئەحمەد:

## هەر چەندە ساڵ جارێک لەسەر ئەرکی خۆی کتێبێکی چاپ دەکرد

مامۆستا ڕەسووڵ بێزار گەردی جگە لەوەی کە وەستایەکی بێ وێنەبووە لە حەیران، توانی زۆر بوێرانە و ئازایانە ئەو ئەرشیفە دەوڵەمەندەی ناوچەی هەولێر لە حەیران بگەیەنێتە بەشی کوردیی لە ئێزگە و تەلەڤزیۆنی بەغدا و بیانپارێزێت و بیانگەیەنێتە گوێی هەر گوێگرێک لە هەر شوێنێکی ئەم کوردستانەن، ئەمەش کارێکە زۆر مایەی شانازییە و کارێکی زۆر گەورەیە، حەیرانبێژەکانی دی هەرکەس و لە گوندی خۆی و لە ناوچەی خۆی و لەناو عەشیرەتەکەی خۆی حەیرانی گوتووە و ناسراوبووە. ئەگەر بیریکەینەوە لەو کاتەی ڕەسووڵ بێزار گەردی ئەو کارەی کردووە، گۆرانی گوتن شتێکی خەوش و نەنگی بووە، خەڵکی بە چاوێکی سەیر، سەیری هونەر و هونەرمەندانیان کردووە، بۆیە ئەو کارەی زۆر بوێرانەبووە، بە ڕای من ئەو کەڵە هونەرمەندە و ئەوانی دیش، دەبێت پەیکەریان بۆ سازبکرێت. کە یەکەم جار ئازایانە هاتوونەتە مەیدان و پێشەنگ بوون. ئەو هونەرمەندە لەگەڵ ئەوەی تا پۆلی شەشی سەرەتایی خوێندبوو، بەڵام ئافەرین، کە بیری لەوە کردبۆوە بەرهەم و حەیرانەکانی خۆی بە کتێب چاپ و ئەرشیف بکات و تۆماریان بکات، هەڵبەتە لەسەر ئەرکی خۆی، هەر چەند ساڵێک کتێبێکی چاپ دەکرد، بەمەش نەمری بە کارەکانی خۆی بەخشی. ئەمەش پێشەنگیەکی دیکەی ڕەسووڵ بێزار گەردییە.

## فەرهەنگ غەفوور:

## ڕەسووڵ گەردی ناسنامەی ڕەسەنی میلۆدی کوردییە

ڕەسووڵ بێزار گەردی لە ڕۆژگارێکی زۆر زووەوە درکی بەو بەرپرسیاریەتییە مێژووییە کردووە، کە حەیران ناسنامەی نەتەوەییمانە، ناسنامەی هونەری ڕەسەنی کوردییە، ناسنامەی ڕەسەنی میلۆدی کوردییە، ئەگەر لاپەڕەکانی مێژووی هونەری کوردی هەڵدەینەوە، جوانترین لاپەرە لاپەڕەی ڕەسووڵ بێزار گەردییە، کە بە میری حەیران ناسراوە، کورد بە گشتی و هەولێریش بەتایبەتی یەکێک لەو شتانەی کە شانازی پێوەدەکات میلۆدییەکانی حەیرانی کوردیی و دەست و پەنجە و قوڕگە زێڕینەکەی ڕەسووڵ بێزار گەردییە، ئێمە کاتێک، کە گوێبیستی حەیران دەبین بە دەنگی ئەو مامۆستایە، تام و چێژی حەیرانەکانی ئەو جیاوازی هەیە لەگەڵ هەموو ئەو حەیرانانەی کە لەو سەردەم گوێمان لێ دەبێت.

## سابیر عەبدولڕەحمان:

## ڕەسووڵ گەردی توانی حەیران بە شێوە ڕەسەنەکەی هەولێر جێگیر بکات

ڕەسووڵ بێزار گەردی توانی بەردی بناغەی هونەری حەیران لە ئێزگە و تەلەفزیۆن دامەزرێنێت، خاوەن بوێریەکی زۆر بوو، کە توانی ببێتە یەکەم کەس لەو سەردەمە حەیران لە ئێزگە و لەگەڵ مۆسیقادا بڵێ و تۆماربکات.

ئەوە چاکە و فەزڵێکی زۆر گەورەی ئەو هونەرمەندەیە بۆ هونەری کوردیی، بۆ حەیران بەتایبەتی. ئەو سەردەمی حەیرانبێژ زۆربوون، بەڵام کەس ئەو بوێرییەی نەبووە بتوانێت لەگەڵ مۆسیقا حەیران بڵێت. ئەو لە حەیران گوتن دا ستایلێک و شێوازێکی تایبەتی هەبوو، چەندین کەس هەوڵی لاسایی کردنەوەیان داوە و دەدەن، بەڵام نەیانتوانیوە وەک ئەو بەو توانا و شارەزاییەی حەیران بڵێنەوە.

ئەو توانی حەیران بە شێوە ڕەسەنەکەی هەولێر، کە کانگەی حەیرانە، جێگیر بکات و بۆمان بپارێزێت و وەک ئەمانەتێک دەستاودەست بکات بۆ نەوەکانی دوای خۆی. حەیرانەکانی بە شێوەیەکی وا دەگوت، کە گوێگر لەگەڵیان بلاوێتەوە. لەرینەوەیەکی تایبەتی لە دەنگیدا هەبوو، خوای گەورە ئەو لەرینەوەی خەڵقکردبوو تەنیا بۆ ئەو و بۆ حەیران.

سیفەتێکی زۆر تایبەتمەندی هەبوو، ئەو سیفەتە بۆ هونەرمەند زۆر پێویستە، ئەویش ئەوەبوو، کە یەک عانەی لە کەس وەرنەدەگرت، ئاهەنگی تایبەتی بۆ پارە ساز نەدەکرد، بە ئارەقەی نێوچەوانی خۆی سەربەرزانە ژیا.



# ڕەسووڵ گەردی لە دیدارێکی چڵ و سێ ساڵ بەر لە ئەمڕۆ

نازم دلبەند

شەویکی هێجگار ساردی زستانی (١٩٨٠/١/٣١) بوو، بەفر شاخە سەرکەشەکانی کوردستانی گرتوتەوە، کاتیش دەوری سەعات حەوت و هەژدە سانیەی تەواوە، کاک (جیهانبەخش محەمەد کەبابچی) خاوەنی تۆمارگای (خەیام) خەریکی ئامادەکردنی ڕیکۆردەرەکەیە، بەمەبەستی تۆمارکردن، کاک (فەخرەدین تایەر)یش ئامادەی دانیشتنەکەیە و بەتەمایین گەشتێک بۆ نێو جیهانی حەیران بکەین ئەگەر بێتەوە یادتان هەر ناوچەیەک لەناوچەکانی کوردستان جۆرێک لەخاسییەتی دەنگ و ئاوازی تایبەتی خۆی هەیە، ئەگەر بچینە شارەزوور (هۆرە) دەنگی تایبەتی ئەم ناوچەیەیە، بادینان ئەوە (محەمەد عارفێ جزیری) و (حەسەنێ جزیری) و چەندانی دیکە توانیویانە خاسییەتی ئەم ناوچەیە بپارێزن، ئەگەر بگەڕێینەوە دەشتی گەرمیانی کەرکووک ئەوانیش ڕیچکەی تایبەتی خۆیان لە (قەتار و ئەڵلا وەیسی) دەبیننەوە، مامۆستا (عەلی مەردان) لەم مەیدانەدا دەوری کاریگەری هەبووە، بەڵام لەهەولێر-ی ئازیز، دەشتی پان و بەرینی (قەراج) هەمیشە دەنگێکی خۆشمان دەهێنێتەوە یاد، کە هەر یەکێک لەئێمە پێی خۆشەو گوێی لێدەگرێ، بەتایبەت ئەم کوڕە شوانانەی، کە بەهاران دەبنە ئاشنای مەڕومالات و بەرخۆڵان شمشاڵ دەژەنن و حەیران دەڵێن بۆ (بەژنی باریک) حەیران بەسەر کێژۆڵە ئەسمەرێ هەڵدەدەن.

ئەو ئانوساتەیە، کە حەیرانبێژی کورد (خارە ڕەسووڵ گەردی)مان دێتەوە یاد و هەر لەو ئانوساتەش دایە ئەوەتا ئەمشەوە لەماڵی (خارە ڕەسووڵ گەردی)ن و هەمووشمان دەزانین بەتەنیا دەژی و هەندێک جار خۆش و هەندێک جاریش ئێجگار ناخۆش.

لەکاتی تۆمارکردنی ئەم چاوپێکەوتنەدا بەڵێنمان پێدا تا ئەو لەژیاندا مابێت لەهیچ شوێنێک بڵاوی نەکەینەوە. خودی خۆشی ڕەزامەندی لەسەر دەربڕی پێشتان ڕادەگەیەنم کە ئەمڕۆ (١٩٨٠/١/٣١) مامۆستا ڕەسووڵ گەردی تەندروستی باشەو بەرەو باشتریش دەڕوات و چاوەڕوانی بەرهەمی زیاتری لێ دەکرێ، دەمەوێت ئەوەش بڵێم ساڵانێکی زۆرە ئەم دیمانەیە بەتۆمارکراوی لەوڵاتی (سوید) لەلایەن کاک (فەخرەدین تایەر) کە ئێستە ئەو لە ژیاندا نەماوە پارێزرابوو، بەڵام من دیمانەکەم سازداوە هەڵبەت ئەمەش وەفایەکی گەورەیە بۆ پاراستنی ئەو ڕۆحییەتە گەورەیەی (مام ڕەسووڵ) و شایانی ڕێزی منیشە بۆ کاک (فەخرەدین).

جا بفەرموون لەگەڵ ئێمە پریاسکەی دڵی (خارە ڕەسووڵ) بکەینەوە.

**- شەوباش مامۆستا.**

+ شەوباش گیانەکەم بەخێربێن سەر هەردووچاوم.



ڕەسووڵ گەردی، نازم دلبەند



**چاوەکانت ساغ بێت ئێمەش بەخێرهاتنی تۆ دەکەین، چونکە ئەو ماڵە، ماڵی هەموو هونەرمەندێکی کوردە حەز دەکەم لەو بەیەک گەیشتنە باسی ڕۆژگارێک بگێڕینەوە، تۆ بەر لەوەی بچیە ئێزگە حەیرانت دەگوت؟**

+ پێش ئەوەی بەخێرهاتنم کردن، مادام ئەو شریتە پاشی من لێ دەدرێ، سەلامێکی گەرموگوڕ لەنێو دڵەوە بەبێ هیچ گەردێکی لێ پەیدا بێ بۆ ئەو خۆشەویستانەی، کە لە پاشەمن دەمێنن گێیان لەو قسانەی من دەبی ئەو سەلامەم بەهەموو لاوان و ئیختیاران و گەورە و گچکە دەسپێرم هەتا وەکو منیان یاد بکەوێتەوە

ئەوجا فەرمووو.

**- زۆر، زۆر سوپاس گوتم پێش ئەوەی بچیە ئێزگە یان هیچ ئامێرێکی تۆمارکردن هەبێت حەیرانت دەگوت؟**

+ لەوەختی خۆم، کە گچکە بویمە، کە عومرم گەیشتیتە (٧و٨) ساڵی لەو وەختەوە من هەر کەسەک بەسەر پێیلکەیەک بەسەرکەتیە ئەمنیش بەسەر ئەو پێپلکەیە، کە حەیرانە بەرم نەداوە و لەوەختی خۆی گێم لەو حەیرانبێژە قەدیمانە دەبوو.

**- ئەو حەیرانبێژە قەدیمانە کێ بوون؟**

+ سەیدەکۆر هەبوو هەزار ڕەحمەتی لێ بێ، باوکی ئەو سەید کەریمەی ئێستە، دۆروزوڕنای لێ دەدا، حەمەدی بەگی هەبوو، زاهیر هەبوو، زاهیر بەناوبانگ بوو.

**- ئەوانە کامیان لەژیاندا ماون؟**

+ پێموایە هیچیان نەماون جوامێر بوون.

**- ئەوە ساڵی چەند بوو؟**

+ وا تێدەگەم ئەمن گوێم لەو شتانە دەبوو، ساڵی (٢٨، ٢٩، ٣٥) بوو.

**- تۆ ئەوساکە حەیرانت دەگوت؟**

+ بەرێ، قوتابی بووم لە پۆلی سێی سەرەتایی. -

**لەکامە قوتابخانە بووی؟**

+ وەڵلاهی قوتابخانەیەک هەبوو لەجێی ئێستەی دوکانی کاکە جیهانبەخش (ئەوساکە دوکانەکەی کاک جیهانبەخش لەشوێنی چێشتخانەی پرتەقاڵەی ئێستاکە بوو).

**- ناوی چ بوو ئەگەر بزانی؟**

+ وەڵلاهی لەبیرم نەمایە ڕاستیت ناوێ بەران دەزانــم سدیقە فەنــدی (سدیق یـونس) لـەوێ دەرسی دایتە من.

**- دەرسی نەشید؟**

+ نەشید.

**- باشە ئەو مامۆستایە تەئسیری لەسەر تۆو هەبوو؟**

+ ئەوبوو دنخافەندی بوو، دنخافەندی خەڵکی سلێمانی بوو، لەو وەختە، کە فرقەی نەشید هەبوو عەینی وەکو ئێستە، پێشان تەڵەبە هەموو سبەینان، لەحەوشەی مەکتەب ڕێز دەبوون، یەکێک نەشیدی دەگوت ئەوانی دیکە دەیانگێڕاوە، ئەوجا من ئەو نەشیدانەم دەگو وەکو (پیرەمەگرون موقەدەسی پێشکەوە پێشکەوە، ئەی وەتەن چەند خۆشم ویستی)

**- ئەگەر بەبیرت بێ ئەو سروودانەی کە تۆ دەتگوت لەحەوشەی قوتابخانە هیچیانت لەبیرماوە؟**

+ بەخوا بڕێکم لەبیرماوە و بڕێکم لەبیر نەماوەو.

**- دەتوانی یەک سروودمان لەم دانیشتنە بۆ بڵێی؟**

+ (لەو کاتەدا سروودی پیرەمەگرون موقەدەسی گوت)

پیرەمەگروون موقەدەسی
دۆستی دائیمی کوردی
بەم مەنزەرەی شیرینییەوە
دافعی سەد ئاهو دەردی
قامەتی بەرزی تۆ
دامەنی سەوزی تۆ
نیشانە و ڕەمزی تۆ

**- زۆر سوپاس خارە ڕەسووڵ ئەگەر ئەوەشت لەبیرمابێ ئەو سروودانە ئاوازی کێبوون؟**

+ بەخودای نازانم ناوەڵڵا.

**- ئەو مامۆستایەی ئەو سروودەی پێ دەگوتن پێی نەدەگوتن ئاوازی کێیە؟**

+ ئەو وەختەی مامۆستا، ئەو ئاواز و ماوازە کەس نەیدەگو، ئەوە ئاوازی کێیە، ئەوە تازە ئەو شتانە هاتونە کایەوە و بویتە باو، بەرێ ساحێبی هەبووە، ئەوەی گوتیتی ئەوجا نازانم هی کێیە دوایی تەشجیعیان کردم، موهەندیسەک هەبوو ناوی (یونس)ە فەندی بوو ئەو، ئەو گۆرانییەی فێرکردم (لەو کەلە دەنگی سازدێ).

**- گۆرانییەکی فۆلکلۆرییە زیاتر؟**

+ ئا، ئەوەی فێرکردم چووینە سەری گۆرانیی دیکە هەبوو (هەوری لار بوو دەچمە سەر ناڵەشکێنێ).

> **چەند ئاوازێکم بۆ گۆرانیبێژەکان داناوە، بەناوی خۆم نەنووسییە، چونکە لەنێژگە ئەگەر ئاوازەکان بەناوی من بێتە خوارەوە دەبێ ئەمن پارەکە وەربگرم، ئەوجا من حەزم دەکرد پارەکەی بدەمە وان**

**- ئەوە هی ئەو زەمانی؟**
- ئا ئەو زەمانی ئەو گۆرانیانە هەبوون.
**- ساڵی سی و پێنج؟**
- پێش سی و پێنجی بوو
**- پرسیارێک، ئاشکرایە ساڵی (١٩٣٥) چەند کۆمپانیایەکی ئەوان تۆمارکردن لە عێراق هەبوون (بەیزافۆن) و (چەخماخچی) و (أبو كلب) و چەند کۆمپانیایەکی دیکە تۆ وەک دەنگخۆشێک ڕۆژێک لەڕۆژان بیرت لەوە نەکردەوە، کە بچی لەو کۆمپانیایانە گۆرانی تۆمار بکەی؟**
- ئەو هەرامەم نەبوو، ئەو شەنگەم نەبوو، ئەو وەختە منداڵ بووم، بەران ئاخیری هەر تەسجیلم کرد، چار قەوانم ئێستە هەیە لەکۆمپانیای چەخماخچی) و (أبو كلب)ی قەدیم.
**- چەند پارەت وەرگرت بۆ ئەم چار قەوانە؟**
- سەت دینار، پێشی من مامۆستا تایەر تۆفیق، مامۆستا عەلی مەردان، کاک شەماڵ، نەسرین و حەسەن و ئەوانە لە کۆمپانیاکەی تەسجیلیان کردبوو، هەر بەمنیشیان دەگۆ وەرە لەگەڵمە تۆمار بکە من نەمکرد لەسەر پارەی لەگەڵ شەریکەکە پێک نەهاتم.
**- یانی ئەوساکە ئاشنایەتیت هەبوو لەگەڵ محەمەد عارفی جزیری و حەسەنی جزیری و نەسرین شێروان؟**
- ئا، ئا
**- ئاشکرایە ست ئەڵماس و دایکی جەمال و مریەم خانیشت دیبوون؟**
+ ئەوانەم دیتبوو.
**- هیچ بیرەوەرییەکت لەگەڵ ئەوانە هەیە؟**
- لەگەڵ ست ئەڵماس و نەسرین شێروان و مریەم خان-یش بیرەوەریم هەیە، بەڵام هەندە شت هەیە ئێستە بیڵێم جوان نییە. بیرەوەری ئەو وەختە تەمەن هەندە شت هەیە ئێستا بیڵێین ئایا لەکن خەڵکی جوانە؟ تەبعەن ئینسان دەوری گەنجی هەموو شتێک بەکاردێنێ ئەو وەختی گەنجی ئەو وەختی، کە دادەنیشتن تەبعەن مەجلیسەکە خۆش دەبوو، هەر گۆرانی گوتن هەبوو لەو وەختە باو نەبوو دابنیشن لەجێیەک بە (قومار) کردن ڕابوێرن سبەینە بکەنەوە بەگۆرانی گوتن ئەو لاوکی دەگۆ ئەو حەیرانی دەگۆ ئەو قەتاری دەگۆ.
**- ئەوە لەگەڵ کێ؟**
+ وەڵڵاهی من دانیشتوومە لەگەڵ هەموویان لەگەڵ (ست ئەڵماس)یش لەگەڵ مریەم خانێ.
**- ئەوانە خەڵکی کوردستانی تورکیا بوون؟**
+ بەڵێ ئەوانە بادینی بوون، بەڵێ بادینی هەموو ئی وێندەرێیە، هەتا کاک حەسەن و محەمەد و ئەوانیش هی ئەوبەرینە.
**- باشە شتێکی دیکە تۆ وەک گۆرانیبێژێکی کۆن لەگەڵ دایکی جەمال هیچت نەبووە؟**
+ ناوەڵڵا.
**- نەتدیوە؟**
+ ناوەڵڵاهی، بەخودای وەختی من هەبوو، بەران من نەمدی نەچوومە لای.
**- ئێستە زانیمان چار قەوانت تۆمارکرد بۆ کۆمپانیای (چەخماخچی) دەتوانین بزانین ئەو گۆرانیانە چی بوون؟**
+ بەخوای سێیانیان حەیران بوون، یەکیشیان نیوە شەو بوو.
**- باشە دەتوانی یەک لەو حەیرانانەمان بۆ بڵێی ئێستە بۆی هەیە دەنگی ئەوساشت زۆر گەنجانەتر بووبێ لە ئێستە؟**
+ بەخودای حەیران ئەرێ وەڵڵا دەتانم یەکیان ئەوەیە، کە ئێستە جارجاریش لەمەحەتەی ئێران لێی دەدەن.
**- کیژۆڵە ئەسمەرێ؟**
+ ئا کیژۆڵە ئەسمەرێ و لەقەڵاتان لەقەڵاتی دوێنێ.
**- دەتوانی بەندێکمان لەو حەیرانە بۆ بڵێ کە لەساڵی (١٩٣٥) لەکۆمپانیای چەخماخچی تۆمارت کردووە؟**
+ ئینشاڵڵا بۆتان دەرێم.




ڕەسووڵ گەردی، حەسەنی جزیری، عەلی مەردان



(مامۆستا ڕەسووڵ گەردی کۆپلەیەک لەحەیرانی لەقەڵاتان لەقەڵاتی دوینێی بۆ گوتین)
ئەی هاوار
بابە دەڕێم ئەوڕۆ سبەینێ
لەقەراتان لەقەراتێ دوینێ
ئای دەڕێم لە قەراتان لەقەراتێ دوینێ
ئەوجا ئەمن دەمگۆ لەبۆ من لێ بدەن خەندەکان
لەگەر نۆینێ
لۆێ لەبۆی نەمایمە
ئەمن سەد حەیف و مخابنێ
دونیایێم دەمینێ
لەبۆ کیژۆرە (زرار)یان دەڕۆن
لەبۆ سەختێ ڕەشوانێ
دەستێ پەبازنیان شل بووینە
لەبەر هەروەشان و داوەشانێ
هەی مارم کاول بێ دەڕێم
پێی بەخرخاریان شل بووینە
لەبەر ڕەفتینێ و ڕۆینێ
ئای ئای ئای
لەگێچان لەگێیە زوری
ئەوڕۆ سبەینێ دەڕێم لەگێچان
لەگێچە زوری
بەژنێ باریک کارمامزە
دەلەوەڕێتەوە لەدەشتێ کاولە قەراجی
دەو شۆڕو دەوشۆڕان خەندەکێ
مامە خەلیفەی ئازێ کەندێ بندیانان ئێواران و سبەینان
ئـاوێ خـۆی دەخـواتـەوە لـە جـۆگـەی کـاولـە مەخمووری
لۆیە لەبۆی نەمایمە چاوی بەبێ دەرمان گەلەک جوانن
دەبریا ئەمن بواران ببامە خەرجە ستێنێ ماچان
لە کیژۆرە سیانان
لەدۆرە دزەی ئەوەلێ
هەموو سبەینان وەکێ بەرزەکێ
تەنکۆکە دادەنیشێ لەمابەینێ دوو داران
لەبۆ نەخشێ بکاتن لە مافورێ
هەی هاوار و سەد ناشرین
دەڕێم بەخودای سەبرۆکە سەبرۆکە
بەقامکێ بە ئەنگوستیلە
بە پەنجەیێ بە خەنە
بە زولفەکێ سێ ڕیزە

> **جەمیل بەشیر دەیگۆ نەنگۆ لۆ نایەن فێرە عودتان بکەم، عودەکەتان چ لێکرد؟ دەمانگۆ وەڵڵا عودەکەمان فرۆشتەوە**

بەربووینەوە سەر خەناوکەی گەردەنێ
هەی هاوار ماڵوێران بەخودای
لەمن دەبرێتەوە گوفکێ مافورێ
**- زۆر سوپاس نازانم تۆ ئێستە ئەو حەیرانەت گۆت لەگەڵ ساڵی (١٩٣٥) جیاوازی هەبوو دەتوانم بڵێم ئەوساکە دەنگت خۆشتربوو؟**
+ نە ئێستە خۆشترە بەهەموو تەبیعاتێک.
**- ئەو حەیرانەت بۆ ئێزگەی کوردیی تۆمارکردیە؟**
+ بەخوای هەندەکم تۆمارکردیە و هەندەکم تۆمار نەکردیە، ئێ کورە ئەوێ تۆمارکراوە لێی نادەن.
**- باشە با لەم کۆمپانیایەش بچینە دەرەوە، ئاشکرایە ئێزگەی کوردیی، کە کرایەوە بەشێوەیەک بوو، کە گۆرانیبێژان (کەریم کابان حەسەنێ جزیری) و زۆر لەگۆرانیبێژان ڕۆژی نیو سەعات گۆرانیان ڕاستەوخۆ دەگوت؟**
+ کەریم کابان لەحەیاتێ خۆی ڕاستەوخۆ لەئێزگەی کوردیی گۆرانی نەگۆتییە حەفلەی نەبووە هیچ.
**- کەریم کابان لەچەند چاوپێکەوتنێک ئەوەی گوتووە، ئێمەش لەسەر زاری ئەو بۆ مێژوو دەیگێڕینەوە، باشە هەر چۆنێک بێت تۆ بەشداریت کردووە؟**
+ ئەوەی، کە بەشداری هەبێ ئەوەی بەراستێ ئەمن پێت بڕێم، مامۆستا عەلی مەردان بوو، مامۆستا تایەر تۆفیق، فەوزیە محەمەد، نەسرین شێروان، حەسەن جەزراوی، ئەمن بووم، ئەحمەد مەحموود بوو، خلاس و براوە، کەریم کابان، کە دەرێ حەفلەم کردووە حەفلەی نەکردووە هاتووە تەسجیلی کردووە و ڕۆیشتووە.
هەتا لەوانەش ئێمە دوو، سێیەک حەفلەمان نیو سەعاتێ بوو، ما باقی دیکە ئەو سێ چارەکەی دیکە چارێگەک بوو بەس، ئەمن و تایەر و حەسەن جەزراوی و عەلی مەردان و ئەمە ئەو چوارە، نیو سەعات بوو، ما باقی دیکە ئەوان چارەگەکیان هەبوو، بەو دواییەی ئەحمەد مەحموود هات، مەحموود وەندی بەم دواییەی ئەمری خوای کرد، هات چەند گۆرانییەکی تەسجیل کرد، حەمە سالح دیلان هات چەند گۆرانییەکی تەسجیل کرد، کەریم کابان هات چەند گۆرانییەکی تەسجیل کرد.
**- تایەر تۆفیق لەگەڵتان بوو؟**
+ ئەدیکو تایەر، حەفلەی هەبوو نیو سەعات.
**- باشە شتێکی دیکە، وەک گۆرانیبێژێکی کۆن**

**ئاشنایەتیت لەگەڵ (سێوە)ی خوالێخۆشبوو چۆن بوو؟**
- وەڵڵاهی لەگەڵ (سێوە)ی وەکو باب و ئەولاد وابووین لەگەرە من زۆر حەفلەی کردوە لە کۆیە) کە ئەمن چوومە (کۆیە) لەساڵی (٤٣) ئەو گۆرانیبێژ بوو، ناسراو بوو، (مەلا ئەسعەد) هەبوو، کوڕێک هەبوو ناوی (باقی) بوو، ئەویش دەستی لێ دەدا، کوڕێک هەبوو، ئەفەندی، ئەویش ئەفەندی بوو نازانم شتەکی وابوو، هونەرمەند بوو، ئەویش دەنگی خۆشبوو، کوڕەکی دیکەش هەیە.
**- مەلا ئەحمەد؟**
- مەلا ئەحمەد-یش بەو دواییەی هات، مەلا ئەحمەد، ئا، کوڕەکی دیکەش هەیە، ناوەکی خۆشی هەیە.
**- باشە ئەوە ساڵی (٤٣) لەو ساڵانە مامۆستا باکوری دەوری هەبوو لەو ئاهەنگانە؟**
- مامۆستا باکوری (بەپێکەنینەوە) ئەولاد بوو منداڵ بوو.
**- منداڵ بوو، بەڵام وابزانم زۆر بەهرەی مۆسیقای لا هەبوو؟**
- ئاخر بەهرەی زۆر بوو، دوای ئەو وەختەی ئەمن دەرێم ئەو منداڵ بوو ئەو وەختەی ئەمن دەرێم عومری باکوری (٦ + ٧) ساڵان بوو، ئەو وەختەی چ هەرامەی نەبوو.
**- یانی مامۆستا باکوری دەبینین لەتۆ پیرترە؟**
+ ئاخر ئەو دڵی وەکو من تەڕ نییە، ئەمن دڵم تەڕە، تێگەیشتی، دوایی مامۆستا باکوری، کە دەرچوو ئەوجا لە (کۆیە) مۆسیقا و شتێکی باشی پێراگەیاند، کۆزێکی جوانی دانا.
**- تیپی مۆسیقای باواجی دامەزراند؟**
+ کۆزێکی جوانی دانا، کۆز مەعنای ئەوەیە بەهەموو شتێکی یانی خزمەتێکی باشی کرد.
**- یەکەم ڕۆژ، یەکەم مانگ، یەکەم ساڵ، کەی بوو تۆ چوویە ئێزگەی کوردیی لەسەر شریت کام گۆرانیت تۆمارکرد؟**
+ ساڵی ١٩٤٧ بوو
**- نازانی چ ڕۆژەک بوو؟**
+ وەڵڵاهی ئەوجا ئەوە ئەگەر ئەو ڕۆژانەم بزانیبا، کە ئەو سوئالەم لێ دەکرا هەمووم دەنووسییەوە بەرام برێم چ ڕۆژەک بووە، بەران دەزانم لە ٤٧ی بوو، چووم گۆرانیم تەسجیل کرد و هاتمەوە، تەقریبەن مودەتێکی پێچوو، ئەوجا منیان قەبوڵکرد، گوتیان بابە ئەگەر بێتە ئێزگە بەتایبەتی نیو سەعاتی حەفلەی غینائی دەدەینێ.



**- ئەوسا ناڵێم مامۆستا ڕەسووڵ، کە لەسەر شریت تۆماریان دەکرد، ئەو گۆرانییە دەماوە؟**
+ شریت نەبوو.
**- دەڵێم، کە یەکەم گۆرانیت تۆمارکرد، لەئەرشیفی ئێزگەی ماوە؟**
+ وەڵڵاهی ئەو وەختی ئەمن چووم شریت نەبوو، شریتێک بەو دواییەی هات وەکو مووی سەری باریک بوو.
**- سیم بوو؟**
+ سیم بوو، دەنا نەبوو. ئیستیوانەی گەورە گەورە هەبوو.
**- ئەوانە نا، لە کۆمپانیا قەوان هەبوو، تۆماریان دەکرد؟**
+ لە ئێزگەش قەوان هەبوو، قەوانی گەورە گەورە هەبوو، ئاخر برام ئەوانەم باش ئاگا لێیە، سیمیش هەبوو، ئەویش بەو دواییەی هات، ئەدی لۆ دەرێم نیو سەعات، نیو سەعاتەکەش تەنیا عالەم گوێی لێ دەبوو، خلاس دەبوو.
**- چ ساڵەک بوو گۆرانیت تۆمارکرد، ئێستە لەئێزگەی کوردیی مایە؟**
+ مومکینە، پاشی (٤٨و٤٩) سیم هات، سیم پەیدابوو.
**- نازانی یەکەم گۆرانیت، کە تۆمارکرد، چ گۆرانییەک بوو؟**



لەمیعە تۆفیق، ڕەسووڵ گەردی، عەفیفە ئەسکەندەر، نەسرین شێروانی



+ بەخودای ئەمن ئەو سارە، کە چوومە ئێزگە (کچێ خەجێ، هەوری لارم، دەچمە سەر ناڵەشکێنێ، شەمامە و شلێرە، دەچمە ڕەواندز، پێم لێ نێ پێم لێ مەنێ، تەنک تەنک، های نێزام بەخۆم نێزام)م تەسجیل کرد.

**- دەتوانی یەک پارچە لە گۆرانیی (کچێ خەجێ)مان بۆ بڵێی، کە فۆلکلۆرە و ئێستە زیندووکراوەتەوە و (تیپی هونەری هەولێر) بۆ تەلەفزیۆنی تۆمار کردۆتەوە، وابزانم مامۆستای هونەرمەند (وریا ئەحمەد) ئامادەی کردووە و دابەشی کردووە (سەلاح محەمەد)یش دەیڵێتن؟**

+ ئاخر ئەمن لێرە بەمامۆستا (وریا)م گۆت، ئەتو مادام ئەو گۆرانییەتان تۆمار دەکرد ئەوە فۆلکلۆرە، ئەو ڕۆژەش کۆبوونەوەیەک هەبوو لە (قاعە)ی ئەمن نەفسی قسەم کردەوە.

**- ئەوە ڕۆژی چەند ئەو کۆبوونەوەیە کرا ئەگەر بەبیرت بێت؟**

+ وەڵلا نازانم ڕۆژی چەند بوو (٦)ی مانگ بوو، نازانم شتەکی وابوو.

**- ٦ی مانگی یەکی ساڵی (١٩٨٠)؟**

+ ئا ئەو ڕۆژ بوو (٦)ی مانگ بوو ئەمن ئەو ڕۆژی باسم کرد، ئەو گۆرانییانەی کە تۆماری دەکەنەوە کۆنە، مامۆستا ئەتو وازەند مەکە چ گۆرانییەک نییە، فۆلکلۆرە کۆنەکان لەئێزگە نەبن، گۆرانیبێژ تەسجیلی نەکردبن، گێ بگرن بزانن ئایا ئەو خۆشترە، یان ئەوان دەرێن (تەتەور)مان مەسەلەن بەو گۆرانییەکە کردیە.

**- باشە ئێستە تۆ یەک پارچەمان بۆ بڵێ؟**

+ باشە، باشە ئەو (تە گە ورە) تێم بگەینە ئەوەلەن شیعرەکانی هەموو غەڵەتە، هی گۆرانییەکە نییە قاعیدە و دانانەکە و هەڵستانەکەی، کە ئێوە پێی دەڵێن ئاواز تێکەیشتی، هیچی لەسەرەخۆی نییە ئاخر خۆ پرسکردن هیچ عەیبەکی تێدا نییە، ئەسڵەن بە پرسکردن ئینسان وەکی دەچنە سەر زێیەکی کابرا دەپرسی ئەرێ بڕ لە کێیە بپەڕمەوە، خۆ مل لە زێیەکە نانێ، لە زێیەکە بخنکێ، دەبێ بپرسیتن  ئەوجا نازانم ئەوانە شەرمیان پێیە بپرسن.

**- ئا، بەلام ئەوانیش شارەزاییان هەیە لەم بوارە؟**

+ ئێ دەبێ بپرسن، ئاخر شارەزایەکەی چییە؟ شارەزایەکەی ئەوەیە، کە یەکەک تشتێک بکا ئەو تشتە  تاس دەرێ بشکێ، بەڵام نەزرینگێ، دەبێ تشتەکە بەجوانی بهێنن.

**- باشە با بزانین لەساڵی (١٩٤٨) وەک خۆت دەڵێی یان با بڵێین (٤٧) یان لەچلەکان ئەو گۆرانییەی تۆ تۆمارت کردووە بۆ ئێزگەی کوردیی بەغدا؟**

+ (زاهیر بابەجان) هەبوو لە کۆیە ئەمن هەر جارەی ئەو گۆرانییەم دەگۆت لەخۆ دەچوو تێکەشتی.

**- دەتوانین گوێمان لەپارچەیەک لەو گۆرانییە بێ؟**

+ مومکینە لە ٣٩، ٤١ لۆ ئەو کوڕەم گۆتییە لە کۆیە

**- ئەو گۆرانییەت دەگۆت؟**

+ ئەو گۆرانییانە ئەوجا، کە پێت دەرێم فۆلکلۆرەکانی کۆن، هیچی نەماوە، یان مامۆستا عەلی مەردان، یان مامۆستا تایەر، یان مەسەلەن ئەمنی قوڕ بەسەر، یان گۆرانیبێژی دیکە هێشتبی، بەران چییە گوتوویانە، بەرێ مۆسیقا خۆشەکە (تەتەوری) پێ بکا زیادی کەمەنجە و ئالاتی جوان جوان و نای و دووزەلە و شمشاڵ و ئەوانەی بەکەر بکەوی، نەک (ئۆکردۆیون) و (مۆکردیۆن) و نازانم چی و ئەو بەزموڕەزمە.

**- بەلام مامۆستا ڕەسووڵ ئەتو وەک شارەزایەک لە گۆرانی و حەیرانی کوردیی، لەگەڵ ئەو پێشکەوتنەبە، کە ئەمڕۆ تیپە مۆسیقاکانی کوردستان دەبینین وەک تیپی موسیقای سلێمانی و تیپی هونەری هەولێرو تیپی باواجی کۆیە و تیپەکانی دیکە ئێمە لەگەڵ ئەو پێشکەوتنەین، چونکە دونیای هاوچەرخانە ئەوەی دەوێ؟**

+ بۆچی ئەوانەی کۆنن، ئەمەش گێمان کرایتەوە، ئەمەش گێمان کرایتەوە ئەگەر مۆسیقاریش نەبین ئەما گێی مۆسیقامان هەیە، ئەمە گۆرانییەکانی کۆنی لە جێیان گێمان لێ بووە بە مەنجەرێک (تێنگە تێنگیان) لێهێناوە، ئێستە ئەوە بەکاردەینن پێیان باشترە لە هەزار تەتەوری ئێستە، ئەمە فۆلکلۆرە

دەبێ نەیگۆڕین لەبۆ ئەژدادی ئەژدادمان بمێنێ، باشترە، ئەوجا ئەگەر ڕاست دەکەن.

**- بەلام ڕۆحییەتی فۆلکلۆرەکە ماوە لەگۆرانییە تازەکانیش؟**

+ (مامۆستا ڕەسوول گەردی لەگەڵ ڕایەکەی مندا نییە و هیچ وەلامێکی نەدامەوە و دەستیکرد بەگوتنی گۆرانی خەجێ).

کچێ کەپرەکت لۆ بکەم کچێ خەجێ

> **لەگەڵ ست نەڵماس و نەسرین شێروان و مریەم خان-یش بیرەوەریم هەیە، بەڵام هەندە شت هەیە ئێستە بیڵێم جوان نییە**

ـنار توتنێ لەناو توتنێ
ـوێمە کەپرێ کچێ خەجێ بەلکی زەیتونێ
ـســەر سینگت بکەم کچێ خەجێ
حلێی مردنێ
ـکەپرەکت لۆ بکەم کچێ خەجێ لەقولەی دەربەندی
ـوێمە کەپرێ خاوەو گیا بەندی
ـیەوە سەرمارێ کچێ خەجێ
ـزاوا بەندی

**- مامۆستا ئەوەی ئێمە ئاگادارین، تۆ لەساڵی (١٩٥٠) گۆرانییەکت تۆمارکردووە ئەو گۆرانییە ئێستە نوێکراوەتەوە بەناوی (بریندارم) هونەرمەند (عومەر دزەیی) دەیڵێت، بەڵام لەو حاڵەتەدا مافی تۆ خوراوە، کە لای کاک (جیهانبەخش) لەتۆمارگا گوێمان لێ بوو، هیچ گۆرانێکی تیا نەکراوە لەسەر تێلی تەلەفزیۆن و ئەرشیفی ئێزگەی کوردیی ناوی تۆی پێوە نییە؟**

- ئێ باشە ئەوە حەقی ڕەوایە

**- ئایا تۆ ساڵی چەند ئەو گۆرانییەت تۆمارکرد؟**

- لەساڵی (٥٠) ئەوجا ئەو وەختی ئەمن، کە تۆمارم کردیە بەخوای نازانم چ سارەک بووە، چونکی ئەمن، کە لە ئەوەلەوە گوتیتم بمزانیبایە ئەو شتانە وەکو ئێستە دەنووسم، بەران ئەو وەختە برایان بەخودای ئینسان ئەوەی نەدەهاتە خەیار، کە ئەو شتانە بنووستەوە، بەران لە دەفتەری ئێزگە نووسرایە.

**- بەڵام بەهۆی برادەرێکەوە چووینە ئەرشیفی ئێزگە نووسراوە لە ساڵی (٥٠) تۆمارت کردیە؟**

- نە پێشی(٥٠) تەسجیلم کردیە.

**- ئەو گۆرانییە لە شیعر و ئاوازی خۆت بوو؟**

+ ئاها لە دەفتەری ئێزگە وادێ ئەمما مومکینە ئەوە ئەمن دەرێم دەفتەرەک هەبوو، پێشی وی، ئەو دەفتەرەیان بزر کردیە، ئەوجا تاریخەکەیان هینایە پێش، ئەمما پێشتر لەپێشی هەموو گۆرانییەکان ئەوەم تەسجیل کردیە.

**- بریندارم بریندارم؟**

+ خۆی کاک عومەر منداڵ بووە، لێرە تەڵەبە بووە، لە ئیبتیدائی، کە من ئەو گۆرانییەم گوتییە.

**- تۆ ئێستە گوێ لەو گۆرانییە دەگری؟ گوێت لێ بووە کە کاک (عومەر دزەیی) دەیڵێ؟**

+ ئا گێم لێ بووە، بەران چ بڕێم.

**- باشە ڕات چییە؟**

+ وەڵڵاهی ڕەئیم ئەوەیە من بەو کابرایەی کە لە بۆی تەسجیل کردبوو ناوی (صدقی)یە، نازانم (مسریە) ئەوەی ئەوەکەی بۆ لێ دەدا پێمگۆ بەعەرەبی (أنت هذا الاغنية ما كنت ویای سجلت لیش هذا سویت) گوتی: (ولاهی كاكە ڕە سول هو هذا هلگت سار قديم أنا فكری دماغی ما كان برأسی وأنا سامح هذا مسوی بعدين ما جاب علی بالی) نازانم چ (صدقی)یەکی پێدەڵێن.

**- دڵگیر نەبووی، کە یەکەمجار گوێت لەم گۆرانییە بوو؟**

+ چۆن، ئینسانێک ئەگەر مارەکی بخورێ، یان بدزرێ، لەبەر چاوی خۆی ببینتەوە، چۆن ئەوجا هەر ئەوە؟ زۆر شتم هەیە، لێم دزراوە.

**- دەتوانی یەک بەند لەگۆرانیی بریندارم بڵێی، بزانین جیاوازە لەگەڵ ئەوەی گۆرانیبێژ (عومەر دزەیی)؟**

+ ئەتو ناڵێی لە دەفتەری ئێزگەی هەبووە، ئەدی گوێت لێنەبووە؟

**- بەڵێ من لە تۆمارگاکەی کاک (جیهانبەخش) گوێم لێ بووە، بەڵام یەک پارچە؟**

+ (دەستی کرد بەگۆرانییەکە بەم شێوەیە بوو)
بەتۆ یار پەیدا نابێ
پەیدا بێ فایدەی نابێ
سەد ساڵ خونچە بپشکوی (وەی شل)
بێ گوڵ بەهار قەت نابێ (وەی شل)
لێمان ون بووە چاو کەژاڵم
زوڵف شۆڕ و گەردەن بەخاڵم
کابرات بەقوربان دەکەم بریندارم بریندارم

**- سوپاس مامۆستا با بچینە نێو جیهانی خوالێخۆشبوو ڕەسول گەردی، بیورن حەسەن زیرەک (هەمووومان پێکەنین)؟**

+ خۆشە، خۆشە، خۆشە، ئەو هەوایە خۆشە (بەپێکەنینێکی زۆری هەموومان) وەمان پێدەڵێن با لە ڕووبین وەمان پێبڵێن خۆشە

**- وەک ئێمە زانیومانە تۆ ئاشنایەتییەکی بەهێزت لەگەڵ حەسەن زیرەک هەبووە، دەتوانی باسی ئەو ئاشنایەتییەمان بۆ بگێڕیتەوە؟**

+ بەخوای کاکە حەسەن زیرەک ڕەحمەتی خوای لێبێ خوا لە هەموو شتەکی بوریە، خۆی دەنگی خۆش بوو، ئینسانەکی زیرەک بوو، قابیلیەتی، کە هاتە عێراق لە ساڵی تەقریبەن (٥٧) بە هەمووی یەک ساڵ لەعێراق ماوە لە (٥٨) ڕۆیشت، کە سەوورە کرا ئەو ڕۆیشت، لێرە چەند مانگێک لەو



> مامۆستا عەلی مەردان قیمەتی تەواو نابی بەران هیچ کەسی فێر نەکرد



هەولێرە لەکنە من بوو.

**- ئەوە ساڵی (٥٧) لەلای تۆ بوو؟**

+ ئا، بەرێ، دوایی پاشان چووە بەغدایێ لە بەغدایێ لەکن (کاکە حەمە) ئیشی دەکرد.

**- لە کێ؟**

+ لەئوتێلی.

**- ئوتێلەکە ناوی چ بوو؟**

+ بەخوای پێم وایە (شیمالی کبیر) شتەکی وابوو.

- ئەو (کاک حەمە)یە ئێستە لەژیاندا ماوە؟

+ بەخوای پێموایە نەماوە نەمردووە، بەران کوڕی کابرایەکی بەناوبانگە ئوتێلچی بوو. لای ئەو ئیشی دەکرد، دوایێ بردمان بۆ ئێزگە.

**- ئەگەر بزانی کێ بردی؟**

+ بەخودای بەمن و بەکاک تاهیر و بەشەماڵ و بەهەموومان خەریک بووین، گوتمان ئەو کابرایە دەنگی خۆشە و بردمان لە ئێزگە چەند گۆرانییەکمان بۆ تەسجیل کرد.

**- بەڵام، ئێمە وەک زانیومانە خوالێخۆشبوو مامۆستا (رەفیق چالاک) و چەند برادەرێکی دیکە دەستیان لەوە هەبوو خوالێخۆشبوو حەسەن زیرەکیان بردبێتە ئێزگە؟**

+ بەخوای مامۆستا (رەفیق چالاک) لای ئێمە (موزیع) بوو ئەوبوو (عادل عورفان) بوو دوو (موزیع)مان هەبوو پاشی (عادل عورفان)ی ئەوجا (حوسێن قەرەداغی) و جەماعەت و هیتر و هیتر ئەوانە هاتن.

**- ئێ با بێینە سەر حەسەن زیرەک؟**

+ مەمکینە کەس ئاگای لەوە نییە، من هەندە جەریدە و مەریدەش دەبینم (کابرایەک مەسەلەن لۆ خۆی پاڵ پێوە دەنێ دەڵێ: ئەمن واو حەسەن زیرەک وا وەلحاڵ وا نییە) ئەوە کاک تایەر-یش دەزانێ و مومکینە کاک شەماڵ-یش دەزانێ و هەموو هاتنەکەی حەسەن زیرەک بۆ ئێزگە، کە گۆرانییەکانی تەسجیل کرد ئەوهابوو، ساڵەکیش لەئێزگە نەماوە.

**- چەند گۆرانی تۆمار کرد، ئەگەر بزانی؟**

+ بەخودای لەو وەختە مومکینە دە، پازدە، بیست گۆرانییەکی تۆمارکرد، هەر ئەوەندە بوو.

**- یانی ئێستە دە، پازدە گۆرانییەکی لەئێزگە هەیە؟**

+ مومکینە ئێستە برێم بەهەمووی ناگاتە بیست، سییەکی.

**- بەڵام من تەماشام کرد (٦٠) گۆرانی هەیە؟**

+ شەست گۆرانییەکە، هەمووی، ئێزگە شریتی لەعالەمێ وەرگرتیە.

**- حەسەن زیرەک کوڕ و دانیشتنی دەرەوەی هەبووە؟**

+ ئا، ئا ئەوانەی هەبووە برێم شەست گۆرانی لەوێ تەسجیل کردیە، ئەمن هەر بە بیست، سییەکی تێ دەگەم، کە تەسجیلی کردیە، بەڵام گۆرانییەکان هی ناو ستۆدیۆن؟ زیاتر دەنگ و سەدای مۆسیقاژەنەکانی ئێزگەی لێ دێ؟ ئەمن هەر ئەوەندەم دێتە خەیاڵ، گۆرانییەکانی دیکە مومکینە کردیتی من ئاگام لێ نەبو، خۆ ئەمن (٢٤) سەعات لەئێزگەی نەبویمە، من ئەو وەختەم لە یادە، کە ئەو گۆرانیانەی تەسجیل کردوە.

ئەو ماری لەبەغدایێ بوو، لە (حەیدەر خانە) خانییەکی هەبوو جارجار لەگەڵ کاک تایەر-یش دەچووینە لای. هەتا ئەمن و کاک تایەر چەند کتێبێکمان تەبع کرد، دامانە کاک حەسەن زیرەک گوتمان بۆمان بفرۆشە (بەپێکەنینەوە) پارەکەش رۆیشت هەزار رەحمەتی لێبێ، کتێبەکانیش (ئەحمەد شێخاڵی) ئەوی کورسە ئەویشی لەگەڵێ چووبوو، رۆیشت ئێتر حەسەن زیرەک نەهاتەوە.

**- تۆ باسی کتێبت کرد، تا ئێستە چەند کتێبت چاپکردووە؟**

+ ئەوەلجار (بژار)م تەبع کرد.

**- ساڵی چەند؟**

+ ساڵی (٥٤ یا ٥٥) ئەوهایە.

**- ژمارەی ئەو چاپکراوانەی تا ئێستە چاپت کردوون نازانی چەندە؟**

+ پاشی ئەو (گوڵە مێلاقەی کوردستان) لەدوای وی (شێلان و شلێر) ئێستەش دوو کتێبم بەدەستەوەیە، یەکەکیان لەم زوانە تەبعی دەکەم، کە (پەنگر)ە ئەوی دیش ناوی (دارە شەکرانە) چونکی ئەوە خۆم گوتومە، ئەوجا هەر شاعیرەکیش و هەر گۆرانیبێژێکیش دەبێ هەموو شتەکی خۆی بەڕاست نەزانێ دەبێ هەڵەی هەر تێدابێ، ئەمما ئەمن ئەوەی لە زارم هاتبێتە دەرێ لە قەدیمەوە ئەو ئیشەم باش کردیە، جارێ لەوەختی (بژار) ئەوەی گوتومە لە ئێزگە هەمووم لە ناو کتێبەکەی (بژار) داناوە، بەوە دەزانم کە زۆر لە گۆرانیبێژان شتەکانی منیان بردووە.

**- ژمارەی گۆرانییەکانت ئێستە لەئێزگە خۆی لەچەند دەدات؟**

***«ئەو وەختێ ئەمن چووم شریت نەبوو، شریتێک بەو دواییەی هات وەکو مووی سەری باریک بوو»***

ـحوـای خۆیان دەرین (٥٠٠ تا ٦٠٠) جا نازانم.
**ـحی بەرای تۆ؟**
ـمن نازانم، ئەوەندەی دەزانم زۆر گۆرانی من ـشـکرایتەوە.
**ـمشکرایتەوە؟**
ـەگەرمییەوە) زۆر.
**ـتۆ ئاشنایەتیت لەگەڵ (ژیان ئەحمەد) هەبوو؟**
ـەتە ئیزگە.
**ـساڵی چەند بوو؟**
ـەخوای نازانم.
**ـرۆژی لە رۆژان چاوپێکەوتن، یان دانیشتنتان ـەگەڵ ژیان ئەحمەد نەبووە؟**
ـ ـنیشتنم لەگەڵی نەبووە، بەران کە هاتنە ئیزگە ـری و داکی بوون.
**- ـلیکی ناوی چ بوو؟**
- ـزانم.
**- خەڵکی کوێ بوون؟**
- بەخوای وا تێبگەم خەڵکی دەوروبەری قەڵادزێ ـ ئەو ناوەی بوون، یان وێندەرێ یان (هەریرو ـتـس) ئەو دوو جێیەی شک دەبەم.
**- وەکو چاوپێکەوتن یان دانیشتن؟**
- قسەم لەگەڵیان کردییە، پارەم تەبەروع کردن، ـعزانی فەقیرن هاتینە ئیزگە، دوایـی دیتم گۆرانیبێژ دەرچوون.
**- باشە نازانی ساڵی چەند بوو؟**
- خۆشی ناوی راستی (بەڵقیس)ە ناوی (ژیان) ـیە، واش زەند دەکەم ساڵی (٥٧، ٥٨، ٦٠ ، ٦١) ـوو.
**- یانی هیچی لێنازانی؟**
- هیچی لێنازانم، زۆر لەگەریان هەستایمەو ـانیشتیمە، بەران نەمنووسیتەوە، کە چ رۆژەک بووە، دوایی ئاشنایەتیان لەگەڵ (جەمال جەلال) ی پەیداکرد ئیتر کورێک هەبوو ناوی (عومەر) بوو لەکنەمە (موزیـع) بـوو، ئیتر گۆرانیی و ـۆرانیان دەست پێکرد و هەتا شعرەکی منیشیان کردیتە گۆرانیی.
**- تۆ گوتت ئاشنایەتیم لەگەڵ ژیان ئەحمەد لە ئیزگە هەبووە، گوتت خەڵکی قەڵادزێیە؟**
- یان قەڵادزێیە، یان هەریر و باتاس ئەوەی قسەی لە بۆ من کردیە ئێستە لێرە نییە، ئەو باش دەزانی خەڵکی کێیە و چۆن هاتووە و چۆن چووە، ئەو قسەکەی بۆ من کردووە (بەران ئەمن ناتوانم قسەکەی بکەم) حەز دەکەم ئەو قسە بـەدەوی ئەوبی بەدەوی من نەبی.



**- باشە با بچینە لایەکی دیکە، چونکە دەڵێی من هیچی لێنازانم، ئێمە شتێک دەزانـین کە مەسەلەیەکی زۆر خۆش لە نێوانی تۆ و مامۆستا تایەر تۆفیق و مامۆستا باکوری هەیە، ئەویش فێربوونی ئالەتی (عودە) گوایە مامۆستا باکوری بەنیاز بووە تۆ فێرە ئالەتی عود بکات، ئایا ئەمە چۆن بـوو تـۆ فێربووی، ئەنجامەکەی بەچی گەیشت، ئەگەر بکرێ ئەوەمان بۆ بگێریتەوە؟**
+ بەراستی ئـەوەی پێم خۆشبێ لەناو ئالەتی مۆسیقا ئالەتی عودە دوایی کەمانچەیە، دوایی پاشی ئـەوانە، کە لـەو دوانـەش پێم خۆشتربێ شمشاڵە، کە لەدڵم بچەسپێ شمشاڵی شوانانە.

> ❝ کەریم کابان لەحەیاتی خۆی راستەوخۆ گۆرانی لەئیزگەی کوردی نەگۆتییە! ❞

**- کـاک (جیهانبەخش) کە لـە کەڵمانایە و ئەم چاوپێکەوتنە تۆمار دەکات حەزم دەکرد خۆی قسەی بکردایە، بەڵام بەئیشارەت پێم دەڵێ پێی بڵێ: بۆ؟**
+ شمشاڵی کوردیی ئاوازەکانی سەرف کوردییە، هیچ نەیبەزاندووە، بەهیچ مەعنایەک هەتا ئێستە پێموایە هـەرچی شمشاڵی لێدابێ ئـاوازەکانی نەبەزاندییە و سرف کوردییە، ئاوازەکانی ئایا لاوکە، حەیرانە، ناسر و مارمارە، ئایشە گوڵە، وەرانە، قەل و زەردە گولەیە، لاس و خەزاڵە بە نزمی وانـە دەردەچـێ. ئێستە (مع الاسـف) ئەو شتانە هەمووی ناویان لێنایە بە مەقامات، ئەوە مەقامی فلان شتە و ئەوە مەقامی فلان شتە، لەکنەمە مـەسـەلـەن لـە دیوانـەکی گـەورە دادەنیشتین، کابرایەک زۆر گۆتنی چاکی دەگۆت، بەندی لاس


نەسرین شێروانی، رەسوول گەردی،



و خەزاڵ، یان مەم و زینی دەگوت، یان حەسەن و مریەم، یان مەسەلەن خەج و سیامەندی دەگو، هەتا ڕۆژ دەکراوە لە دیوەخانی هەر دەیانگو، ئەوجا ئەو شمشاڵە لەگەری دەڕۆیشت، بۆیە کە گێم لێ دەبی دەزانم ئەو ئاوازە سرف کوردییە، بۆیە من شمشاڵم پێخۆشە.

**- بەڵام تۆ مەسەلەکەی مامۆستا (باکوری)ت لەبیرکرد؟**

+ ئەوجا هی مامۆستا باکوری-یش من و کاک تایەر لە بەغداوە، کە تۆغیانمان بووە، یانی پاز پازانێمان لەسەر ڕووبـاران دەکـرد. ئێمە دەمانویست عـود فێربین عـودمـان دەکـڕی و دەمانفرۆشتەوە.

**- ئەوە ساڵی چەند بوو؟**

+ ساڵی تەقریبەن (٤٧ و ٤٨ و ٤٩ و ٥٠) و ئەوانە.

**- کاتی خوالێخۆشبوو (جەمیل بەشیر)؟**

+ ئا، ئا وەختی (جەمیل بەشیر)ی ئەوجا هەموو جاری جەمیل بەشیر دەیگو ئەنگو لۆ نایەن فێرە عودتان بکەم، عودەکەتان چ لێکرد؟ دەمانگو وەڵڵا عودەکەمـان فرۆشتـەوە، لـەو وەختـەوە ئێمە ویستمان فێرە ئەو عودە بین هەر هێنامان و بردمان ئەوجا لێرە ئەمن پێشی نەخۆشی ڕۆژەکی گۆتم مامۆستا باکوری زۆر حەز دەکەم ئەوەی چوو، چوو، بەران حەز دەکەم ئێستە زۆر زگم بەخۆم دەسووتی لەلای کەمە فێرە عود ببم بەتەواویش نەک هەر بە (گۆترە) ئەگەر بە (گۆترە) فێر ببم دەست لە (عود) بدەم، مومکینە بە مانگێک فێربم، بەران وام ناوێ، گوتم دەمەوێ بەنۆتە فێربم لەسەر شێوەیەکی چاک و عیلمی، هەستام چووم لە (ئەجهیزەی دەقیقەی بەغدا) دوو، سێ لەوەی نۆتەم کڕی، لەگەرە خۆم هێنام چوومە موسڵیش لەموسڵیش عودێکی چاکم کڕی بە (٦٥) دینار.

**- ئەمزانی ئەوە چ ساڵێک بوو؟**

+ بەخوا نێزیکەی ئەوەش بۆ (١٠) ساڵی دێ.

**- یانی ساڵی حەفتا؟**

+ ئا، عودەکەم کڕی هەر بەدارێم وەکرد، یەک، دوو جار مامۆستا هات، ئەوەکەی لۆ نوسیمەوە کاک باکووری گوتی:

ئەوە وەهایە، ئەوە وەهایە، بۆم نەچووە سەری، ئیدی عودەکەم هەر بەداری وەکرد، لەو ڕۆژانە

***"حەسەن زیرەک، خۆی دەنگی خۆش بوو، ئینسانەکی زیرەک بوو، کە لە ساڵی تەقریبەن (٥٧) هاتە عێراق، یەک ساڵ لەعێراق ماوە لە (٥٨) ڕۆیشت، لێرە چەند مانگێک لەو هەولێرە لەکنە من بوو"***

مامۆستا باکووری لێم پەیدابوو لەو ڕۆژە نزیکانە لەوەی پێنج، شەش ڕۆژ پێشتر، لەساری تازە لەو مانگی یەکە. گوتم:

مامۆستا باکووری ئەگەر فێری عودم دەکەی بە (نۆتە) دەمەوێ دەرسم بدەیتێ، ڕۆژێ بەڕۆژێ دەست دەیە مەستەرەیەکیش ئەگەر برێی وا لێی دە وا لێم دە لەئەنگوستم بدە.

گوتم: هەتاوەکینی فێری نم، ئەمما ئەتو لە بۆ من لێ بدەی برێی ئەوەی وا لێی دە وا لێی دە برۆ ئەمن ناچمە سەری وەڵڵا ئیتر تێر پێکەنین و ئینشا الله زوو، زوو سەرت لێ دەدەم ئەوە دە، دوازدە ڕۆژە ڕۆیشتیتەوە سەری لێنەدایمە (بەپێکەنینەوە) دە، دوازدە ساڵی دیش فێربین هەر باشە.

**- باشە ئەوەش تەواو تۆ لە دەشتی هەولێر ژیای؟**

+ ئەمن لەدێی (قەڵادگە) لەبن هەولێرێ.

**- ساڵی چەند لەدایکبووی؟**

+ بەڕاستی موالیدی ڕاستم (٢٦)ە.

**- ئەی باشە تۆ ئاشنایەتیت لەگەڵ خوالێخۆشبوو کاوێس ئاغا هەبوو؟**

+ بەخوا ئەمن نەمدیوە.

**- نەتدیوە؟**

+ وەختی من هەبووە، بەران ئەمن نەمدیوە، ئەمن ئەو وەختە لەگەڵ حەیرانبێژان ئاشنایەتیم هەبووە.

**- باشە ئەو حەیرانبێژانەی کە ئاشنایەتیت لەگەڵیان هەبوو مەندێکت گوت، بەڵام کە گەیشتییە ژیانی گەنجێتی ئاوا تەمەنی (١٥ و ١٦) ساڵی؟**

+ کاوێس ئاغا نەما.

**- قەیناکە کاوێس ئاغا نەما، مەبەستم کاوێس ئاغا نییە ئەو حەیرانبێژانەی لەو تەمەنە، کە ئاشنابوون و حەیرانت لەگەڵ دەگوتن کێ بوون؟**

+ هەر ئەوانەی، پێشتر گوێم لێ ببوون، هەر ئەوانە بوون.

**- بەس ئێمە لەدەشتی هەولێر چەند حەیرانبێژێک دەبینینەوە وەکو (عوسمان حەیران) ئەو کۆمەڵە تۆ ئاشنایەتیت لەگەڵیان نەبوو؟**

+ نا، ئەو حەیرانبێژانەی ئەمن دەرێم، مامۆستا حەیرانبێژ هەر ئەوە نییە بەژنێ، بارێک دەرێ حەیران جوغرافییەکی کوردەوارێت دەێنێتە بەرچاوی، ئەو حەیرانەی گوتووە، جێی ئەو کوردستانە فراوان دەکاتەوە، کە کێندەرێ خۆش بووە، حەیرانەکەی خۆی شوبهاندووە

بەکارمامزەکی وا چاورەشی جوان بردیتی، بردیتی لەو جێیەی کوردستان کێندەرێ خۆش بووە وەکو تاریخێک، باسی ئەو جێیانە دەکات، کە جێیەکانی کوردستان کێندەرێ خۆشە، کوێستانەکانی، مەسەلەن دەرێ:
سوکەرێژی خەیلانیان، مێرگە چەتۆی شێخ مەموندیان، کۆسپەی بێجانێ، چارچەری هەرکیان مەسەلەن قەراج کێندەرێ خەندەکی مامەر خەلیفەی ئازی کەندی بن دیانان ئەو جێیانە تاریخەکە دەیهێنتە پێش وەکو جوغرافیای جێیە خۆشەکانی کوردستان دەهێنیتە پێش چاوی لەکێ ڕاوی کردیە لەکێ لە عاردی دا، بەران شەرتی ئەوەیە ئەوی حەیران تێ ئەگا ئەوە حەز دەکەم ئەو قسانە لە (عەزیز گەردی) سوئال بکەن، ئەم حەیرانە کێندەرێی کوردستان دەهێنتە بەرچاو، باسی کێندەرێ دەکا.

**- مامۆستا تۆ چ بیرەوەرییەکی تاڵ یان شیرینت لەگەڵ قەڵای هەولێر هەیە بەتایبەت لەگەڵ گۆرانی لەقەڵاتێ هاتە خوار؟**

- ئەو هەڵبەستە ئی من نییە، ئەو هەڵبەستە هی (جاهید)ە.

**- بورهان جاهید؟**

+ بورهان جاهید

**- بەڵام من لەم مەسەلەیەم کۆڵییەوە گوایە لەسەر ئارەزووی تۆ ئەم هەڵبەستەی داناوە؟**

+ نا، خۆی ئەمن شیعری ئەو برادەرەم زۆر وەرگرتییە، هی (مەلا مەسعوود)م زۆر وەرگرتییە، هی (پیربال مەحموود)م زۆر وەرگرتییە، هی (مەدحەت بێخەو)م زۆر وەرگرتییە.

**- هی (حەبیب عەلی میران)؟**

+ هی (حەبیب عەلی میران)یم زۆر وەرگرتییە، پاشی من گۆرانیبێژەکان، کە من ئەو گۆرانییانەم گوتییە تازە ئەوان پێدا دێنەوە و دەیکەنەوە گۆرانیی، من لەسەر هیچ خواستێکی خۆم شیعرم لەشاعیران وەرنەگرتووە.

**- باشە هیچ ئاوازت بۆ گۆرانیبێژان دانەناوە؟**

+ بەخودای، ئەوەی دامنابی، ئەوەی کردبێتم.

**- باشە هیچ گۆرانیبێژێک تەکلیفی لێ نەکردووی ئاوازی بۆ دابنێی؟**

+ بەخودای یەک، دوو ئاوازم بۆ (مەحموود وەندی) ڕەحمەتی داناوە، چەند ئاوازێکیشم بۆ گۆرانیبێژەکان داناوە، لەبەر ئەوەی بەناوی خۆم نەنووسییە، چونکە ئێستە لەئێزگە ئەگەر ئاوازەکان بەناوی من بێتە خوارەوە دەبێ ئەمن پارەکە وەربگرم، ئەوجا من حەزم دەکرد پارەکەی بدەمە وان هەر بەناوی ئەوان دەمهێنا خوارێ، تا پارەکە ئەوان وەریبگرن، حەزم کردبیە یارمەتیان بدەم.



**- ئەو گۆرانیبێژانە کێ بوون؟**

+ وەڵڵاهی هەر کەسەک بن، حەز ناکەم ناویان بدەم بەخۆیان دەزانن.

**- باشە مامۆستا عەلی مەردان، کە برادەرێکی گیانی بەگیانی بوو لەگەڵتا، هیچ ئاوازێکی بۆ دانەناوی؟**

+ بۆ من نا.

**- ڕۆژێ لەڕۆژان پێت نەگوتووە؟**

+ ناوەڵڵا، پێم نەگوتووە و ئێستەش پێی نالێم، چونکی مامۆستا عەلی مەردان قیمەتی تەواو نابی بەران هیچ کەسی فێر نەکرد، دەنگخۆشیش بهاتبایە لە ئێزگە شتەکی بگۆتبایە ڕاستەن ڕای دەگرت وەکو (وڵاخەکی خۆشرەو) لغاوەکەی بگرێتەوە، دەیگۆ ئەتو نازانی بڵێی وا مەڵێ، وەنەبوو فێری بکا بڵێ وا مەڵێ وا بڵێ، کابرا بچیتە ڕێ، هەتا چەند جار من و کاکە تایەر ڕووبەڕوو پێمان گوتووە.

**● ئەم دیدارە کەمترین دەستکاری کراوە، هەوڵدراوە وەک خۆی ڕەسووڵ گەردی چۆن قسەی کردوە، هەروا دابڕێژرێتەوە، مەگەر لەو شوێنانەی هیچ مانایەکی بەدەستەوە نەدایێت.**



ڕەسووڵ گەردی، جیهانبەخش کۆیی



# بەرگدرووەکەی ڕەسووڵ گەردی

ئامادەکردنی: سەکۆ

وەستا برایم مەعرووف، ئەو بەرگدرووە بووە، کە لەکاتی خۆی کورتەک و شەرواڵی بۆ هونەرمەند ڕەسووڵ بێزار گەردی دووریوە، ئەو جگە لەوەش هاوڕێیەکی نزیکی بووە، ئێستەش دوکانی بەرگدروویی هەر ماوە، بۆ زانینی چەند لایەنێکی ژیانیی و چۆنیەتی ئاشنابوونی بە ڕەسووڵ گەردی و دروینی جلوبەرگەکانی سەردانیمان کرد و ئەو چەند پرسیارەمان لێ کرد:

**- تۆ لە ساڵی چەندەوە جلوبەرگی ڕەسووڵ گەردی-ت دووریوە؟**

+ لە ساڵی ١٩٧٥-وە

**- ئەی پێش تۆ لە کوێی دەدووریی؟**

+ پێش من وەستا نوورەدین هەبوو لای ئەوی دەدووریی، بەڵام دوای ئەوەی ڕۆژێک لەگەڵ کاک جیهانبەخش هاتە لای من و یەکدیمان ناسی، داوای لێکردم لەمەودوا من قاتەکانی بۆ بدوورم.

> “
> **زۆربەی حەیرانەکانی خۆی بەدڵ بوو، بەڵام کێژۆڵێ ئەسمەرێ زۆر زۆر بەدڵ بوو، لاف و گەزافی پێ لێ دەدا**
> ”

**- چ جۆرە قوماشێکی هەڵدەبژارد؟**

+ زۆر حەزی لە قوماشی ئینگلیزیی بوو، حەزی لە قوماشی باش بوو، دەچووە بەغدای دەیکڕی، چ قوماشێک باش و گران بووایە ئەوەی دەکڕی، کەسێکی زۆر بە زەوق بوو.

**- جۆری ئەو بەرگەی بۆت دەدووریی چییان پێ دەگوت؟**

+ کورتەکی چاکەتیان پێ دەگوت، بەڵام یەخەکەی جیاواز بوو، خۆی داوای دەکرد، یەخەی کراسیی بوو.

**- یانی ستایلەکەی خۆی داینابوو؟**

+ خۆی داینابوو دەیگوت ئەو جۆرەم دەوێت، یەخەی کراسیی و شانیشی چاکەتی بێت.

**- زیاتر چ جۆرە ڕەنگێکی هەڵدەبژارد و پێی جوان بوو؟**

+ زۆربەی ڕەنگەکان، بەڵام زیاتر حەزی لە ڕەنگی زەیتوونیی و ڕەساسیی بوو، لەگەڵ جۆری مورەبەعات.

**- کاتێک بەو جلوبەرگەوە، کە خۆت دووریوتە و لە شاشەی تەلەفزیونەوە دەیبینی چ هەستێکت لا دروست دەکات؟**

+ ئێستە کە دەیبینم زۆر دڵم پێ خۆشە، هەمیشە ڕەحمەتی بۆ دەنێرم.

**- زووزوو قاتی بە ڕادان دەدا؟**

+ زووزوو دەهات پارچە قوماشێکی دەهێنا و دەیگوت بۆم بدوورە، وام لێهات بێزار ببووم، پێم دەگوت بۆت نادوورم، ئەویش دەهات بەجێی دەهێشت و دەڕۆیشت.

**- قەت وابووە لەسەر ئەوە لێک زویر بین؟**

+ نا، قەت لێک زویر نەبووینە، پیاوێکی زۆر قسەخۆش و بە گاڵتە و گەپ بوو.

**- پارەت لێ وەردەگرت؟**

+ لێم وەردەگرت، جاریش هەبووە، لێم وەرنەگرتووە، بۆ پارە و بۆ هەموو شتێک، کەسێکی زۆر سەخی بوو، دەچووینە کنی لە ماڵێ هەرچی هەبایە لە پێشی دادەنایێن.

**- قاتت بە چەندی بۆ دەدووریی؟**

+ باشم لە بیر نییە، بەڵام دەوروبەری پازدە تا حەڤدە دینار بوو.

**- ئەو دەفتەرەت نەماوە کە قیاسیت لێ نووسیوە؟**

+ بەداخەوە نەماوە، هەمووی کۆن بوو، فڕێم داوە، بۆیە بەهیچ جۆرێ قیاسەکەیم بیر نەماوە، ئەوەندە دەزانم هەر جارێک قوماشی هێنابێت چوار مەتری دەهێنا.

**- هاتووچۆی ماڵەوەیت دەکرد؟**

+ زۆر، هەموو جارێک خۆی تەلەفونی دەکرد، دەیگوت بۆ دیار نیت.

**- یەکێ لە شتە جوانەکانی پۆشتەیی و پاکوخاوێنیی بوو، وابوو؟**

+ هیچ ماڵێک، وەک ماڵەکەی ئەو پاکوخاوێن نەبووە، نەیدەهێشت بە پێڵاوەوە بەسەر بکەوی،



...ە پێلاوەکەت لەبەر دەرگا دانێی، نەعلەکی
...بوو، لەپێت دەکرد.

**...ت لەگەڵ خواردبوو، حەزی لە چ جۆرە ...رنێک بوو؟**

...ۆرجار لە ماڵەوە دەعوەتم کردووە و بە ...کەوە نانمان خواردووە، زۆر حەزی لە ...ەنی کوردەواریی بوو، وەک بامیە، ساوار، ...ە و گەنمەکوتا، ئەگەر لە دەرەوەش بووایە ...ر حەزی لە تەشریب بوو، بەتایبەتی تەشریبی ...ێن قاورمەچی

**کەسێکی زۆرخۆر، یان کەمخۆر بوو؟**

...ۆرخور نەبوو، بەڵام حەزی لە دانیشتن بوو. ...دەستی بە گوتنی حەیرانان دەکرد.

**ئەگەر بیرت بێت زیاتر چ حەیرانێکی خۆی پێ ...خۆش بوو؟**

...ۆربەی حەیرانەکانی خۆی بەدڵ بوو، بەڵام ...ێژولی ئەسمەرێی زۆر زۆر بەدڵ بوو، لاف و ...ەزافی پێ لێ دەدا زۆرجار ئەگەر گوێ بیستی ...ەکێک بووایە حەیرانی بگوتبا دەیگوت ئەوەش ...ەوی لێ دا.

**- ئەدی چەفییەکانی کێ بۆی دەدوورین؟**

- هەورییەکی دەکری و دەیبردە ماڵی ژنێک، ...ورینگەی بۆ دەکرد، نزیکەی بە دە دیناری، ڕۆژێک هات گوتی ئەو ژنە ماکەرە ئیشەکەم بۆ ناکات گرانی کردییە.

**- باری دارایی چۆن بوو؟**

+ بڵێم چۆن بوو، بەڕاستی زۆرجار پارەی لەمن قەرز دەکرد، بەڵام کەسێک بوو حەقی کەسی لە کنەخۆ نەدەهێشتەوە، کە مەعاشی وەردەگرت دەیداوە، پیاوێکی سەر بڵند بوو، بە قیتوقۆزیی بە ڕێگەدا دەڕۆیشت و سەلامی لە خەڵکیی دەکرد.

**- چیت بیرماوە و حەز دەکەیت بیگێڕیتەوە؟**

+ ڕۆژێک قوماشی هێنا، منیش گوتم نادوورم، گوتی باشە با لێرە بێت، قەیناکە، مام سەید ئەحمەد ئوتوچی هەبوو، بەرانبەرمان بوو، گاڵتەی لەگەڵ ڕەسووڵ گەردی دەکرد، پێی دەگوتم ئەگەر بۆی بدووری لێت عاجز دەبم، ئەویش دەیگوت قەیناکات با لێرە بێت، من و تۆ پێک دێین، ئەتو مەدوورە، بەڵام من ڕۆژێک دێم بێرەدا تێدەپەڕم گۆرانییەکی لەسەر ئەو دوورمانەی دەڵێم، ئەتووش لەگەڵم بڵێوە، هات مام سیدی-ش بەرانبەرمان راوەستا بوو، ڕەسووڵ گەردی-ش هات و دەستی پێکرد و گوتی:

دروا دروا، کورتەک دروا
سەید ئاگای لێ نییە کورتەک دروا
منیش لە گەڵیم دەگوتەوە



وەستا برایم مەعرووف، بەرگدرووی ڕەسووڵ گەردی

# ئەلبوومی وێنەکانی



ڕەسووڵ گەردی لەکاتی پێشمەرگایەتی



حەمە جەزا، ڕەسووڵ گەردی



تایەر توفیق، حەسەن زیرەک، عەلی مەردان، ڕەسووڵ گەردی



ڕەسووڵ گەردی، شەماڵ سائیب



حەیدەر بەقاڵ، ڕەسووڵ گەردی



ڕەسووڵ گەردی، جەماڵ شادان



ڕەسووڵ گەردی و هەردوو کوڕەکەی (سەفین)، (کەیفی)

# ئەلبوومی وێنەکانی



ڕەسوول گەردی، عیسا بەرواری



مشکۆ، ڕەسوول گەردی



باکووری، ڕەسوول گەردی



فوئاد ئەحمەد، عومەر چاوشین، ڕەسوول گەردی



؟، ڕەسوول گەردی، حسێن، ؟



ڕەسوول گەردی لەکاتی پێشمەرگایەتی



حەسەن جزیری، ڕەسوول گەردی

# ئەلبوومی وێنەکانی


مشکۆ، تایەر توفیق، ڕەسووڵ گەردی


ژنە پێشمەرگە (مارگرێت)، ڕەسووڵ گەردی


ڕەسووڵ گەردی، نەسرین شێروانی، عەلی مەردان، ؟


عەزیز محەمەد، ڕەسووڵ گەردی


حەیدەر بەقاڵ، ئایشەشان، ڕەسووڵ گەردی


ڕەسووڵ گەردی لەگەڵ هەوادارانی


ڕەسووڵ گەردی، تایەر توفیق، خوداد عەلی



- **مەلا ئەحمەدی هۆرینی و چالاکیی بزووتنەوەی ناشتیخوازانی ناوچەی شێروانە (١٩٠٠– ١٩٧٠)**

پ.ی.د. ئەحمەد باوەڕ

- **گوندێ شوش**

خەتاب سەعدی شوشیی

# مەلا ئەحمەدی هۆرینی و

# چالاکیی بزووتنەوەی ئاشتیخوازانی ناوچەی شێروانە

# ١٩٠٠ -١٩٧٠



دکتۆر ئەحمەد باوەڕ

## پێشەکی:

بەوپێیەی ساڵانێک و ماوەیەکی زۆرە کەلار و دەوروبەری بەناوەندی ناوچەی گەرمیان دادەنرێن، بەلام لەوکاتەشەوە، کە هۆزێکی وەک جاف لە ژیانی کۆچەرایەتی و بەتایبەتی گەرمیان و کوێستان کەوتوون، لەگەل ئەوەشدا و بەدیاریکراوی لە (٢٧ی نیسانی ١٩٢٧) بەدواوە، کە قانوونی لیوا، قەزا، ناحیە، دێهات و ناوچەکان لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی مەلیک فەیسەلی یەکەم و عێراقی پاشایەتی بلاوکرایەوە . ئیدی لێرە بەدواوە کەسێکی وەک کەریم بەگی جاف و براکانی لەبنەماڵە و میرزادەکانی جاف لە کەلاری ئەودەمانەدا نیشتەجێ دەبن، شان بەشانی ئەوەش کەوتوونەتە سەر بیرۆکەی ئەوەی، کە چۆن چەند ناوەندێکی خزمەتگوزاریی گرنگ و پێویست بۆ خۆیان و دانیشتوانی کەلار دەستەبەر بکەن، هەر لە دامەزراندن و هەوڵدان بۆ کردنەوەی یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی خوێندن لە ساڵی (١٩٣١-١٩٣٢).

بە درێژایی ساڵانی دواتریش دەکەونە دەستەبەرکردن و دابینکردنی سەرچاوەی ئاوی خواردنەوە، بنکەی تەندروستیی، فەرمانگەی پۆستە و گەیاندن و تەلەفۆنات، مەکینەی ئاش و کۆمەڵێک سەرچاوەی گرنگی دی. سەبارەت بەدامەزراندنی مزگەوت و کردنەوەی وەک ناوەندێکی ئایینیی بۆ خواپەرستی، گومانم لەوە نییە، کە تەمەنی مزگەوت و بونیادنانی یەکەم مزگەوت لە شوێنێکی ئاوەدانی وەک کەلاری ئێستە زیاتر دەگەڕێتەوە بۆساڵانی کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمی زایینی. یەکەمین مەلای مزگەوتیش، کە لە قۆناغی سەرەتا لە ناوچەی هەورامان و سنووری شارۆچکەکانی تەوێڵە و بیارەوە هاتبێتە ناوچەی گەرمیان و کەلار، خوالێخۆشبوو مەلا محەمەدی جوانرۆیی (١٨٦٨-١٩٣٨) بووە، کە ساڵانێکی زۆر لە ناوچەی گەرمیان و لیوای کەرکووک و سنووری قەزای خانەقین ماوەتەوە، تەنانەت لە ساڵانی دواتریش هەر لە کەلاری کۆن ژیانی هاوسەرگیریی پێکەوەناوە و لە ساڵی (١٩٣٨) لە شاری خانەقین کۆچی دوایی کردووە و لە گۆرستانی (پاشاکۆپری) نێژراوە .

دوابەدوای ئەویش کۆمەڵێک کەسایەتیی ئایینیی و زانا و مەلای زۆر شارەزای وەک ئیمام و خەتیبی مزگەوت و وەک پیشەی وانە گوتنەوە ڕوویان لە ناوچەکە کردووە و لە کەلاری ناوەندی گەرمیانی ژێر دەسەلاتی بەگزادەکانی جاف، بۆماوەیەکی زۆر لە کەلار ماونەتەوە، کاروباری ئایینیی و ئیمامەت و گوتاربێژیان بۆ دانیشتوانی گەرمیان بەگشتیی و کەلار بەتایبەتی ڕایی کردووە، شانبەشانی ئەوەش بە درێژایی مێژوو، بوون بە بەشێکی گرنگ و دانەبڕاو لە دانیشتوانی ئەم ناوچەیە و تێکەڵ بە دانیشتوان و خەڵکەکەی بوون لە نێویاندا: مەلا ئەحمەدی کەلار (١٨٨٠-١٩٥٩) کە لە دەروبەری ساڵی (١٩٠٦) هەر بەرەبەنی و لە تەمەنی گەنجیدا هاتووەتە کەلار، تا ئەوکاتەی لە ساڵی (١٩٢٧) کەلاری بەجێ هێشتووە، بۆماوەیەکی زۆریش لەسەر داوا و ڕاسپاردەی حاجی ئیبراهیم بەگی کوڕی سلێمان بەگی جاف (١٨٨٧-١٩٥٢) دەچێتە گوندی (دەککە)ی حاجی ئیبراهیم بەگ لە سنووری قەزای خانەقین، ئیدی لێرە بەدواوە بە (مەلا ئەحمەدی دەککە) شۆرەت و ناوبانگی ڕۆیشتووە، بەلام لە ماوە و ساڵانی مانەوەیدا لە کەلار کە نزیکەی (٢٠) ساڵی تەواو وەک مودەڕیس و گوتارخوێن و قازی جاف تیایدا ماوەتەوە .

**لە ڕووی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە ئەوەی زیاتر جێی سەرنجە، مەلا ئەحمەدی هۆرینی لەناوچەی (بنکوورە)ی سەر بە ناحیەی قۆرەتووی شاری خانەقین، دووجار ژیانی هاوسەرگیریی پێکەوە ناوە**

جگە لەوەش لە کەلاری ئەوکاتانەدا و لە دووکاتی جیاوازدا هەر لە کەلار ژیانی هاوسەریی پێکەوە ناوە .

پاشان کەسایەتی و پیاوانی ئایینیی دیکەی وەک : مەلا مستەفای عەلی تایشەیی (١٨٩٥-١٩٦٩) مەلا ئەحمەد عەبدولعەزیزی هۆرینی (١٩٠٠-١٩٧٠) مەلا محێدینی مەلا سەعیدی زەڵزەڵەیی (١٨٩٥-١٩٥٩) مەلا ئەحمەدی شەمێرانی، مەلا ئەوڕەحمانی کەرکووکی، مەلا محەمەدی فەقێ ڕەشید سەمینی کەلار (١٩٢٩-١٩٨٠) مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا محەمەد ڕەشیدی قنگربان (١٩١٢-٢٠٠٢) دێن.

بەلام ئەوەی لەم کورتە نووسینەدا دەمانەوێت لەبارەیەوە بدوێین و ڕۆشنایی زیاتری بخەینە سەر مەلا ئەحمەد عەبدولعەزیزی هۆرینییە (١٩٠٠-١٩٧٠) ئەو کەسایەتی و پیاوە ئایینییەی، کە لە ساڵی (١٩٥٤) بەدواوە لەشارۆچکەی

خەسرەوئاباد (قزرەبات) لەسەر داواکاریی و ڕاسپاردەی داود بەگی جاف، کە لەو دەمانەدا ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقی سەردەمی پاشایەتی بووە، هاتووەتە کەلار، تا بەرپابوونی شۆرشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨، دواتریش هەر لە کەلاری ئەودەمانەدا ماوەتەوە، پاشان چووەتە شارۆچکەی جەلەولاو لە ساڵی (١٩٧٠) لەوێ کۆچی دوایی کردووە.

## تەوەری یەکەم: سەربووردەی کەسێتی و ژیانی هاوسەرگیریی

مەلا ئەحمەد عەبدولعەزیزی ئیسماعیلی هۆرینی بەپێی هەموو ئەو دۆکۆمێنت و نووسراوانەی لە کەس و کار و بنەماڵەکەیانەوە وەرمانگرتوون، دەیسەلمێنن، کە مەلا ئەحمەدی هۆرینی لە ساڵی(١٩٠٠) دا، لە گوندی هۆرینی

> عەبدولڕەحمان بەزازی سەرۆک وەزیرانی عێراق ڕوو لە کۆمەڵانی خەڵکی ئامادەبووی شارۆچکەی جەلەولا دەکات، کە بەزۆری کورد بوون، پێیان دەڵێت: «خوا یاربێت لەم ڕۆژانە هەواڵێکی زۆر خۆش و خێر بەڕێوەیە، پەنا بەخوا خۆتان لە ڕادیۆ و سەرچاوەکانی ڕاگەیاندنەوە گوێبیست دەبن لەگەڵ برایانی کوردمان»

سەر بە(ناحیەی مەیدانی) بناری بەمۆ هاتووەتە دونیاوە، بەپێی ڕەگەزنامە عێراقییەکەی کە لە ساڵی (١٩٤٨) دەری کردووە، دایکی ناوی (جەواهیر قادر) بووە، بەزۆری باب و باپیر و بنەماڵەکەشیان هەر لەم ناوچەیەدا سەرگەرمی کاروباری کشتوکاڵیی، ئاژەڵداریی و باخداری بوونە، وەک ئەوەی هەر لە قۆناغی گەنجی و لە هەرەتی لاوییەوە کەوتۆتە گەڕان، سەرەتا بەمەبەستی فێربوون و درێژەدان بەخوێندنی ئایینیی سەردانی شاری سلێمانی کردووە و لە مزگەوتی گەورەی ئەو شارە دەستی داوەتە خوێندن پاشان هەر بەمەبەستی درێژەدان بەخوێندن زۆرێک لە شاروشارۆچکەکانی ئەودەمانەی باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان گەڕاوە لەوانە: تەوێڵە، بیارە، سنە و ناوچەی سابڵاغ، بۆ ماوەیەکی زۆریش لە ناوچەی هەورامان، لە شارۆچکەی (بیارە) ماوەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بووە بە موریدی شێخانی نەقشبەندی، لە نێویاندا: شێخ عوسمان نەقشبەندی، دوای تەواوکردنی قۆناغەکانی خوێندن و وەرگرتنی ئیجازەی زانستیی مەلایەتی گەڕاوەتەوە ناوچەکەی خۆیان، بۆ ماوەیەک لە گوندی (باوە مەحموود)ی نزیک شاری خانەقین نیشتەجێ بووە.

بۆماوەی چەند ساڵێکیش وەک کارمەندی کۆمپانیای نەوتی شاری خانەقین کاری کردووە، پاش دەست هەڵگرتنی لەم کارەی هاتووەتە، ناوچەی (بنکوورە)ی سەر بە ناحیەی قۆرەتوو، لە گوندەکانی وەک: سەوزبڵاغ و ئاوایی گەورە. لە دەوروبەری ساڵی (١٩٤٩) بەتایبەتی دوای ئەوەی مەلا سەید حەکیمی خانەقین (١٨٩٢-١٩٥٧) وەک مەلا و ئیمامی مزگەوتی (غێدان) ئەم گوندە بەجێ دەهێڵێت، ئیدی مەلا ئەحمەدی هۆرینی لەسەر ڕاسپاردەی شێخ وەهابی کوڕی شێخ حەمیدی تاڵەبانی (١٨٨٧-١٩٧٢) کە ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرانی سەردەمی پاشایەتی و بەرپرسیاری یەکەمی ناوچەکە بووە، مەلا ئەحمەدی هۆرینی دەچێتە ئاوایی (غێدان) و بۆماوەی سی ساڵی تەواو لەم گوندە ماوەتەوە و بەرنوێژی و ئیمامەتی تێدا کردووە، بەماوەیەک دواتریش مەلا سەید عەبدوڵڵای کفری (١٩٠٥-١٩٨٦) کە بەڕەسەن خەڵکی ناوچەی موکریان و گوندی (بەردەزەرد)ی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بووە، جێگەی دەگرێتەوە، تاوەکو ئەوکاتەی هەر لە ناوچەی بنکوورە دێتە گوندەکانی: گاکوڵ و باریکە، درێژە بەکاری مەلایەتی و بەرنوێژی دەدات .

لە ڕووی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە ئەوەی زیاتر جێی سەرنجە، مەلا ئەحمەدی هۆرینی لەناوچەی (بنکوورە)ی سەر بە ناحیەی قۆرەتووی شاری خانەقین، دووجار ژیانی هاوسەرگیریی پێکەوە ناوە.

یەکەمیان: لە دەوروبەری ساڵی (١٩٣٦) کە ناوی (ئامینە عەزیز ڕەشید) بووە، بەپێی شوناسنامەی باری شارستانی لەساڵی (١٩٠٠) هاتۆتە دونیاوە و تەنیا یەک کچی لێی هەبووە بە ناوی (توبا)وە، لەساڵی (٢٠١٢) کۆچی دوایی کردووە، کە خێزانی کەسێکی تورکمان بووە بەناوی محەمەد شەوکەت، خەڵکی شارۆچکەی (خورماتوو) بووە لە گەرمیان، دواتریش هاتووەتە شارۆچکەی جەلەولا، کە ئەوکاتە کارمەندی (حانووت)ی سەربازیی بووە، لەنێو لیوای (٢٠)ی سەربازگەی جەلەولاو، دوومنداڵی لێی هەبووە بەناوەکانی (محەمەد و سوعاد).

هاوسەری دووەمی مەلا ئەحمەدی هۆرینی ناوی (ڕابعە)

بووە، لە دەوروبەری ساڵی (١٩٣٩) هاوسەرگیریی لەگەڵ کردووە و کچی ڕەشید چاوش بووە، کەسێک لە هێزەکانی پۆلیس لە سنووری ناحیەی (باوەنوور- دەربەندیخان) بەڕەسەن خەڵکی گوندی (سەوزبلاخ)ی سەر بەناوچەی (بنکوورە) بوونە، دوای ساڵانێکی زۆر و پاش کۆچی دوایی مەلا ئەحمەدی هۆرینی ئەم هاوسەرەشی لە ساڵی (٢٠١٢) لە شاری دهۆک کۆچی دوایی کردووە، تەنیا خوشکێکی هەبووە بە ناوی (کافیە) و دایکیشیان ناوی (شاپەسەند) بووە.

کافیە خانم ماوەیەک لەگەڵ محەمەد ئەمین عارفی دەربەند فەقەرە لەشاری خانەقی ژیانی هاوسەرگیریی پێکەوە ناوە، بەڵام منداڵیان نەبووە، وەک دەگوترێت هەردووکیشیان لە ناوەندی هەشتاکانی سەدەی بیستەمی ڕابردوودا هەر لە شاری خانەقین کۆچی دواییان کردووە.

مەلا ئەحمەدی هۆرینی لەماوەی ژیانی هاوسەرگیریدا، نۆ منداڵی هەبووە، چوار کوڕ و پێنج کچ بەناوەکانی: سەلاح (١٩٤٠) کە بەزۆری قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی لە شارۆچکەی قزرەبات و ناوەندی و دواناوەندی لە قوتابخانەی (نەجیبیە) لە شاری بەغدا، دواتریش کۆلێژی شەریعەی زانکۆی بەغدای لەساڵی (١٩٦٤-١٩٦٥) تەواوکردووە، پاش دامەزراندنی وەک مامۆستا لە شار و شارۆچکەکانی جەلەولا، کفری، بەعقوبە و دهۆک مامۆستایەتی کردووە، وەک کاروباری ئیداریش بەڕێوەبەری قوتابخانەی ناوەندی و دواناوەندی بووە، ماوەیەکیش سەرپەرشتیاریی پەروەردەیی بووە. لە بەڕێوەبەرایەتی ئامادەیی (یازدەی ئازار) لە ناحیەی جەلەولا. ماوەیەکیش کراوەتە جێگری بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی گشتیی پەروەردەی دهۆک. لە ساڵی (٢٠٠٦) خانەنشین کراوە.

کوڕی دووەمی مەحموود لە ساڵی (١٩٤٥) هاتووەتە دونیاوە، پەیمانگەی مامۆستایانی سەرەتایی لە شاری بەعقوبە لە ساڵی (١٩٦٨-١٩٦٩) تەواوکردوە، تاوەکو کاتی خانەنشین بوونی لە ساڵی (٢٠٠٨) لە جەلەولا، ڕەمادی، کەلار و دەربەندیخان مامۆستایەتی کردووە.

برای سێیەمیان سەباح لەساڵی (١٩٦٤) هاتووەتە دونیا، پەیمانگەی مامۆستایانی دهۆکی تەواوکردووە، سەرەتا وەک مامۆستا لە ناحیەی (شیلادزێ) دامەزراوە، پاشان هاتوتە نێوشاری دهۆک، لە قوتابخانەی (ولات) مامۆستا بووە، تاوەکو ئەوکاتەی لەساڵی (١٩٩٨) کۆچی دوایی کردوە.

محەمەد-یان لە ساڵی (١٩٦٦) دا هاتوتە دونیاوە و پەیمانگەی تەکنیکی زەعفەرانییەی لە شاری بەغدا تەواوکردوە، ئێستەش فەرمانبەری وەزارەتی ئاوەدان کردنەوەیە.

کچەکانیشی: خەدیجە (١٩٤٩) پەیمانگەی مامۆستایانی کەرکووکی لە ساڵی (١٩٦٨-١٩٦٩) تەواوکردووە. فاتمە (١٩٥٢) کۆلێژی ئەندازیاری بەشی کارەبای لە زانکۆی مووسڵ تەواوکردووە (١٩٧٨-١٩٧٩). حەلیمە (١٩٥٧) بۆ جاری یەکەم پەیمانگەی مامۆستایانی دهۆکی لە ساڵی (١٩٨٢) تەواو کردووە، دواتریش کۆلێژی پەروەردەی زانکۆی مووسڵ بەشی زمانی عەرەبیی لە ساڵی (١٩٩٤-١٩٩٥) خوێندووە.

نەسرین وەک خۆی دەڵێت لە ساڵی (١٩٥٣) لە جەلەولا هاتووەتە دونیاوە، بەهەمان شێوە ئەمیش کۆلێژی زانست

**مەلا ئەحمەد عەزیزی هۆرینی وەک پیشەی مەلایەتی تاساڵی (١٩٥١) هەر لە ناوچەی بنکوورە، بەتایبەتی لە (ئاوایی غێدان) ماوەتەوە**

بەشی (کیمیا)ی لە زانکۆی مووسڵ لە ساڵی (١٩٧٩-١٩٨٠) تەواوکردووە و وەک مامۆستا لە قوتابخانەی (گەلاوێژ) لە شاری زاخۆ دامەزراوە، پاشان هاتوەتەوە نێو شاری دهۆک.

زەینەب-یان لە ساڵی (١٩٤٦) دا هاتۆتە دونیاوە، تەنیا قۆناغی سەرەتایی تەواوکردووەو هەر لە گوندی کەلاری کۆن بووە بەهاوسەری مامۆستا (جەمال ئیبراهیم وەنداوی) کە خەڵکی کفری بووە، ماوەیەک لە کەلار مامۆستابووە.

هەموو منداڵەکانی مەلا ئەحمەدی هۆرینی تا کاتی ئەم نووسینە هەموویان لە ژیاندا ماون، تەنیا سەباح-یان نەبێت، کە لەساڵی (١٩٩٨) دا کۆچی دوایی کردووە، خێزانەکەشی (ڕابعە خانم) لە ساڵی (٢٠١٢) لەشاری دهۆک کۆچی دوایی کردووە.

## تەوەری دووەم: لە پیشەی مەلایەتییەوە تاوەکو کۆچی دوایی

مەلا ئەحمەد عەزیزی هۆرینی وەک پیشەی مەلایەتی تاسالّی (١٩٥١) هەر لە ناوچەی بنکوورە، بەتایبەتی لە (ئاوایی غێدان) ماوەتەوە، دواتریش لەسەر ڕاسپاردە و داوای عەبدوڵلا بەگی کوڕی کەیخەسرەو بەگی کوڕی مەحموود پاشای جاف (١٨٩٠-١٩٤٤) هاتووەتە مزگەوتی مەحموود پاشا (١٨٤٥-١٩٢١) لە شارۆچکەی (قزرەبات) کە لەوەدەمانەدا یەکێک بووە لە ناوەندە زانستیی و مزگەوتە دیار و ئاوەدانەکانی ئەوکاتەی باشووری کوردستان، لە ڕووی وانەگوتنەوە و ڕاگرتنی فەقێ و خوێندکارەوە، ئەوەی جێی وەبیرهێنانەوەیە ئەم مزگەوتە لە سالّی (١٨٩١) لەلایەن مەحموود پاشای جافەوە دروستکراوە.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا کۆمەڵێک مەلای خوێندەوار و شارەزای وەک: مەلا مەعسوم هەورامی نەقشبەندی، مەلا محەمەدی وانی لە باکووری کوردستانەوە، مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی (١٩١٣-٢٠٠١) تیایدا ئیمامەت و وانەیان گوتۆتەوە، بۆ لایەنی خوێندن و وانەگوتنەوەش بەردەوام خوێندکار و فەقێی لێ نەبڕاوە و لە هەموو شوێن و ناوچە جیاجیاکانی کوردستان و تەنانەت خوارووی عێراقیشەوە ڕوویان تێکردووە و سالانێکی زۆر تیایدا ماونەتەوە، هەروەها خوێندنی ئایینیان لەم مزگەوتە تەواو کردووە، هەر لەو دەمانەشەوە، کە هەریەک لە مەلا مستەفای عەلی ئایشەیی لە (ناحیەی شێروانە)ی سەر بە قەزای کفری و مەلا سەعیدی کوڵەجۆ (١٨٨٩-١٩٦٢) لە (ناحیەی قەرەتەپە)ی سەر بەهەمان قەزا و لە سالّی (١٩٤٧) لە ڕێگەی بەڕێوەبەرایەتی گشتیی ئەوقافی لیوای کەرکووک-ەوەو لەسەر پێشنیاز و ڕاسپاردەی پەرلەمانتاری ناوچەی گەرمیان (کفری) داود بەگی جاف لە کەلار و کوڵەجۆ وەک مەلای مزگەوتی ئەو شوێنانە دادەمەزرێن و مانگانەی پێویستیان بۆ دەبڕدرێتەوە.

کەچی سالّێک دواتر و لە سالّی (١٩٥٤) مەلا مستەفای ئایشەیی وەک ئیمام و گوتارخوێنی مزگەوتی گەورەی کەلار هەر لەسەر ڕاسپاردە و داواکاریی بەگزادەکانی جاف، لەلایەن کەسێکی وەک داود بەگی جافەوە، وەک دەگوترێت بەهۆی هەندێک کێشە و بارودۆخی کۆمەڵایەتی ئەوکاتەوە لە کەلار دووردەخرێتەوە و دەچێتە گوندی (کانی پەمووی) سەر بە ناحیەی (قۆرەتوو) لە قەزای خانەقین و تا کاتی کۆچی دوایی لە سالّی (١٩٦٩) هەرلەوێ دەمێنێتەوە، تەنانەت ژنێکی خواناسی وەک خاتوو زێبای کچی شێخ عەبدوڵلای شێخ حەسەنی قەلاتەبزان، کە دەبێتە خێزانی شێخ مەحموودی شاکەل (١٨٤٥-١٩١٢) هاوکات دەبێتە دایکی شێخ عەلی، واتە غالیب شاکەلی شاعیر (١٩٠٨-١٩٤٨) کە لەوەدەمانەدا دانیشتووی کەلاری کۆن دەبێت، وەک ژنێکی قسە ڕۆیشتووی ڕێز لێ گیراوی نێو دانیشتوانی ئەوکاتەی کەلار و لای بەگزادەکانی جاف، دژی ئەوەدەرکردن و بەزۆر دوورخستنەوەی مەلامستەفای کەلار دەبێتەوە و لەسەری دێتە دەنگ و ناڕەزایی خۆی لەوبارەیەوە دەردەبڕێت.

دواتر لەبەرنەبوونی مەلا و گوتارخوێنی پێویست لە کەلار و هەر لەسەر داواکاریی و ڕاسپاردەی داود بەگی جاف مەلا ئەحمەدی هۆرینی لە شارۆچکەی قزرەباتەوە دەگوازرێتەوە کەلار و تاوەکو کاتی بەرپابوونی شۆڕشی (١٤ی تەممووزی ١٩٥٨) بگرە ماوەیەک دواتریش هەر لە کەلار دەمێنێتەوە، سەرەڕای کاری ئیمامەت و گوتاردان، وانە بە هەموو ئەوخوێندکارانەش دەڵێتەوە، کە وەک (فەقێ) لەناوچە جۆراوجۆرەکانی گەرمیان و کوردستانەوە ڕوویان لە گەرمیان و کەلاری ئەوەدەمانە کردووە، کە زیاتر بە مەبەستی درێژەدان بەخوێندن تیایدا ماونەتەوە، وەک شوێنی نیشتەجێبوونیش داود بەگی جاف خانوویەکی مالّی ڕەزا بەگی برای (١٨٨٦-١٩٤٢) بۆ تەرخان کردوون، سەرەڕای دەستەبەرکردنی زەوی و زاری کشتووکاڵیی پێویست بۆچاندنی گەنم و جۆی سالانە و سەرچاوەی ژیان لەگەڵ پێدانی زەکات و یارمەتییەکی ناوبەناوی بەگزادەکانی جاف.

منداڵەکانیشی لە ڕێگەی قوتابخانەی سەرەتایی کەلاری ئەوکاتەوە دەخاتە بەرخوێندن، وەک ئەوەی ناوی بەشێکیان تا ئێستەش لە تۆمارە فەرمییەکانی نێو یەکەمین تۆماری قوتابخانەی سەرەتایی کەلار بەرچاودەکەون.

بەلام بۆلایەنی بازاڕکردن و کڕینی پێداویستی دی ڕۆژانەش، دانیشتوان و خەڵکی کەلار و دەوروبەری بە زۆری پشتیان بە بازاڕی شار و شارۆچکەکانی وەک: کفری و خانەقین و جەلەولا بەستووە، بێ لە وانەش لە کەلاری ئەوکاتەدا چەند عەتار و دوکاندارێکی وردەواڵە فرۆشی پێویست هەبوون، کە بەزۆری پێداویستی دانیشتوانی کەلار و دەوروبەریان لە شتومەکی جۆراوجۆری ڕۆژانە پڕکردۆتەوە لە نێویاندا دوکانی: حاجی مەحموودی عەلی محەمەد، سەمین شوان، مەجید ئەولکەریم، حاجی

ئەحمەدی خدری بانی مۆردی و حاجی عوسمانی حاجی حەسەنی خدر .

جگە لە چوونە شار و بوونی قوتابخانەی کەلار سوود وەرگرتنی بووە لە کتێبخانە تایبەتییەکەی خوالێخۆشبوو محەمەد سەعید بەگی جاف (١٩٢٦-١٩٩٦) کە لەودەمانەدا وەک دەگوترێت پڕبووە لەسەرچاوەی دەوڵەمەندی جۆراوجۆر بەزمانەکانی کوردیی، عەرەبیی و فارسیی، سەرەڕای گۆڤار و ڕۆژنامەی جۆراوجۆر، لەوانە: گۆڤاری گەلاوێژ، گۆڤاری دەنگی گێتی تازە و پەیام بەزمانی کوردیی، کە بەپێی گێڕانەوەی مامۆستا سەلاحی کوڕەگەورەی مەلا ئەحمەدی هۆرینی بێت، کە دەڵێت: وەک خێزان هەموومان بۆخوێندنەوە سوودمان لەو کتێبخانە دەوڵەمەندەی محەمەد سەعید بەگی جاف وەردەگرت و دەمانخوێندنەوە .

بەجۆرێک مەلا ئەحمەدی هۆرینی تا سەروبەندی بەرپابوونی شۆڕشی (١٤ی تەمموزی ١٩٥٨) لە کەلار، وەک ئیمام و گوتارخوێنی مزگەوتی کەلار دەمێنێتەوە، واتە تاوەکو ئەوکاتەی بنەماڵە و بەگزادەکانی جافی کەلار بەهۆی بەرپابوونی شۆڕشی تەمموز و کۆتایی هێنانی فەرمانڕەوایەتی پاشایەتی لە عێراق و داهاتنی سیستمی کۆماریی، دەبنە چەند بەشێک و هەندێکیان ئاوایی کەلار بەجێ دەهێڵن، بەشێکیان لەگەڵ داود بەگی جاف و کوڕەکانی دەچنە ئێران، بەشێکی دیکەشیان لەگەڵ محەمەد سەعید بەگی جاف دەچنە شاری بەغدا و بۆ ماوەیەک لەوێ نیشتەجێ دەبن. بەڵام بەشی سێیەمیان، کە زۆربەیان بریتی بوون لە ماڵی مستەفا بەگی جاف (١٩٢٥-١٩٩٧) شەوکەت بەگی ئەحمەد بەگی جاف (١٩٢٤-١٩٨٤) و ماڵی حەمەڕەشید بەگی حەسەن بەگی جاف (١٩١٣-١٩٧٧) ئەوڕەحمان بەگی فەتاح بەگی جاف لە گوندی (حەسەن مەحە)ەوە، دەچنە شاری خانەقین و بۆ ماوەیەک لە گەڕەکی (مەزرەعە) نیشتەجێ دەبن.

بەڵام ماڵی مەحموود بەگی ڕەزابەگ (١٩٢٥-١٩٧٥) کە ماوەیەک لە گوندی خەیاڵی ناوچەی (بنکوورە) دەبن لە ساڵی (١٩٧٥) پاش کۆچی دوایی مەحموود بەگ ئەمانیش دەگەڕێنەوە کەلار و لە کەلاری کۆن نیشتەجێ دەبن .

لەساڵانی دواتر تەنیا ماڵی مەحموود بەگ و حەمەڕەشید بەگ نەبێت ئەوانی دی هەر هەموویان دەچنە وڵاتی ئێران، دوای چەند ساڵێک داود بەگی جاف لە خەستەخانەی میهری شاری تاران لە (٦ی حوزیرانی ١٩٦٦) کۆچی دوایی دەکات، دواتریش لە ڕێگەی مەرزی نێودەوڵەتی (خەسرەوی-خانەقین)ەوە، دەهێنرێتەوە گەرمیان و لە گۆڕستانی بەگزادەکانی جاف لە گوندی (سەیدخەلیل) دەنێژرێت .

ئەوانی دیکەشیان تا سەروبەندی بەرپابوونی شۆڕشی گەلانی ئێران و دەسەلات گرتنە دەستی کۆماری ئیسلامی ئێرانی و لە سێدارەدانی سالاری کوڕی داود بەگی جاف (١٩٤٤-١٩٧٩) لە چوارچێوەی ئەو زنجیرە لە سێدارەدانەی، کە ئایەتوڵڵا محەمەد سادق خلخالی (١٩٢٩-٢٠٠٣) . لە دژی بەرپرسانی سەردەمی شاهنشاهی جێبەجێی کرد، لە سێدارەدانی سالاری داود بەگی جاف-یش بە هۆکاری سەرکوتکردنی کۆمەڵانی خەڵک لە ناوچەی هەورامان و شاری پاوە جێبەجێکرا .

ئەوانی دیکەیان بەپێی گێڕانەوەی دکتۆر حەسەنی کوڕی کەریم بەگی جاف لە ڕێگەی حکوومەتی عێراق و لە ناوچەی شلێر و ناوخوانی شاری سەقز، بەچەند

**مەلا ئەحمەدی هۆرینی لەماوەی ژیانی هاوسەرگیرییدا، نۆ منداڵی هەبووە، چوار کوڕ و پێنج کچ**

فڕۆکەیەکی هەلیکۆپتەری عێراقی لە کۆتاییەکانی ئازاری ١٩٧٩، پاش لە ناوچوونی یەکجارەکی دەسەڵاتی شاهنشاهی گەڕانەوە شاری کەلار، دواتریش چوونە شاری بەغدا، وەک ئەو مەرجەی، کە حکوومەتی عێراقی (بەعس) بۆی دانابوون .

لە کۆتایی ساڵی (١٩٥٨) بەدواوە مەلا ئەحمەدی هۆرینی بەمەبەستی گواستنەوەی ڕاژە و خزمەتی مەلایەتی، سەردانی شاری بەغدای کردووە و لە ڕێگەی سەرۆکایەتی دیوانی ئەوقافی ئەوکاتەی بەغداوە، لە کەلار نەقڵی ناحیەی جەلەولا دەبێت، دواتریش ماڵەکەی دەگوازێتەوە و لە (گەڕەکی سکەک) ناحیەی جەلەولا نیشتەجێ دەبێت، واتە بەشێوازێکی فەرمی لە ساڵانی (١٩٥٩- ١٩٦٣) دەبێتە ئیمام و گوتارخوێنی مزگەوتی گەورەی جەلەولا، کە بە مزگەوتی (ئیمام ئەبی حەنیفە) ناسرا بووە.

زۆربەی ژیانی ڕۆژانەی هەر لە مزگەوت بەسەربردووە،

تەنانەت نانی نیوەڕوانیشی وەک نەسرینی کچی باسی لێوە دەکات بەزۆری لە ماڵەوە بۆی براوەتە ئەوێ، وەک کەسێکی زاهید و خواناس خواردنی ڕۆژانەی زۆر سادە و ساکار بووە، بۆ نموونە زۆرجار هەربەنان و ترێ ڕۆژانەی بەسەر بردووە، وەک جل و بەرگیش بە بەردەوامی تەنیا دووقاتی هەبووە، هاوینە و زستانە. وەک دەگێڕنەوە لەو ڕووەوە کەسێک بووە زۆر بەسادەیی ژیاوە، گوێی بەخۆشی و لەزەتی ژیان و دونیا نەداوە، تا ئەوکاتەی لە ناوەندی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو، بۆ ماوەیەک دووچاری نەخۆشی دەبێت و بەو هۆیەوە بەزۆری لەماڵەوە دەبێت تا ئەوکاتەی، بەیەکجاری و بەمووچەیەکی مانگانەی زۆرکەم، کە تەنیا نۆ دینار بووە، لەلایەن وەزارەتی ئەوقاف خانەنشین کراوە.

خوالێخۆشبوو مەلا ئەحمەدی هۆرینی لەکات و ساڵانی مانەوەیدا لە سنووری گەرمیان پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵێک کەسایەتی ناوچەکە و عێراق هەبووە، لەوانە

## سەرەتای سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ناشتیخوازان لە ناوچەی شێروانە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٥٠

عەبدولڕەحمان عارف سەرۆک کۆماری عێراق، کە ماوەیەک لە شارۆچکەی جەلەولا فەرماندەی لیوای سەربازیی بووە، سەرەڕای باسکردن لە کەسێکی دیکەی سەربازیی وەک تەها شەکەرچی، کە لە بەرانبەر کۆمەڵانی خەڵکی ناوچەکە، کەسێکی زۆر لووت بەرز بووە، وەک لە یادەوەریی و نووسراوەکانیدا دەردەکەوێت.

یەکێک لەو ڕووداوە مێژووییانەی، کە هەر لە ڕێگەی نووسراو و یادەوەرییەکانی ئەم کەسایەتییەوە، جێی سەرنجن، ئەوەیە، کە سەردانی سەرۆک وەزیرانی عێراق عەبدولڕەحمان بەزازی (١٩١٣-١٩٧٣) کردووە، لە مزگەوتی گەورەی جەلەولا، ئەویش کاتێک لە ڕێگەی بنکەی سەربازیی شارۆچکەی جەلەولاوە لە کۆتایی مانگی حوزەیرانی (١٩٦٦) بەمەبەستی دانووستان و گفتوگۆکردن لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی کورد، سەردانی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش و مەلا مستەفای بارزانی دەکات لە ناوچەی (ناوپردان) دواتریش لەڕێگەی گەڕانەوەیدا، کە پێدەچێت لە دەوروبەری کۆتایی حوزەیرانی (١٩٦٦) بووبێت، بۆ نوێژی عەسر سەردانی مزگەوتی گەورەی جەلەولا دەکات و پاشان چاوی بە مەلا ئەحمەدی هۆرینی و کۆمەڵێک کەسایەتی و خەڵکی جۆراوجۆری شارۆچکەکە دەکەوێت، سەرەڕای گرتنی وێنەیەکی مێژوویی بەکۆمەڵ لەگەڵ جەماوەری ئامادەبوودا، کە لەبەردەم دەرگای سەرەکی مزگەوتی گەورەی شارگیراوە.

دواتریش عەبدولڕەحمان بەزازی سەرۆک وەزیرانی عێراق بەخۆشییەوە ڕوو لە دانیشتوان و کۆمەڵانی خەڵکی ئامادەبووی شارۆچکەی جەلەولا دەکات، کە بەزۆری کورد بوون پێیان دەڵێت: «خوا یاربێت لەم ڕۆژانە هەواڵێکی زۆر خۆش و خێر بەرێوەیە، پەنا بەخوا خۆتان لە ڕادیۆ و سەرچاوەکانی ڕاگەیاندنەوە گوێبیست دەبن لەگەڵ برایانی کوردمان»

وەک ئەوەی بەچەند ڕۆژێک دواتر لە (٢٩ی حوزەیرانی١٩٦٦) بەیاننامە مێژووییەکەی عەبدولڕەحمان بەزازی سەرۆک وەزیرانی عێراق بەمەبەستی کۆتایی هێنان بەشەڕ و چارەسەرکردنی دۆزی گەلی کورد لە عێراق بڵاودەکرێتەوە . هەرچەندە ئەمەش شتێکی ئەوتۆی بۆ گەلی کورد لێ شین نابێت.

بۆ دەست نیشانکردن و ساغکردنەوەی ناوی ئەو کەسانەی لەو وێنە مێژووییەی عەبدولڕەحمان بەزاز، کە لە بەردەرگای سەرەکی مزگەوتی گەورەی جەلەولا گیراوە، کە بریتین لە کۆمەڵێک کەسایەتی شارۆچکەی جەلەولا و قزرەباتی. لەلایەن بنەماڵەی مەلائەحمەدی هۆرینی بەتایبەت (مامۆستا سەلاح هۆرینی) کە خۆیشی یەکێک بووە لەوانەی لە هەمان کات و بۆنەدا ئامادەی ڕێورەسمی هاتنەکەی عەبدولڕەحمان بەزاز بووە، ناوی بەشێک لەو کەسانەمان بۆساغکرایەوە، کە لە وێنەکەدا بەرچاو دەکەون.

داواکارم هەر خوێنەرو هەر کەسێک، کە زانیاریی زیاتری لایە سەبارەت بەم وێنەیە و لەبارەی ئەو کەسانەی لە وێنەکەدا بەرچاودەکەون، ئاگادارمان بکاتەوە، ئەوەش خزمەتێکی گەورەیە بۆڕاستی و بۆمێژوو.

ئەوانەی لە وێنەکەدا دیارن سەرەڕای عەبدولڕەحمان بەزاز سەرۆک وەزیرانی عێراق و مەلا ئەحمەدی هۆرینی ئەمانەن کە (یەکەم جارە بڵاو دەبێتەوە)

مزگەوتی گەورەی جەلەولا (ئەبوحەنیفە) وەک لە بارەیەوە دەگوترێت لە کۆتایی چلەکانی سەدەی بیست



لەڕاستەوە: شەوکەت عەبدولوەهاب، عەبدولڕەحمان بەزاز سەرۆک وەزیران، حاجی ڕەشیدی حاجی فەرەج (پشتەوەی شەوکەت عەبدولوەهاب) حاجی خەلیل حاجی ئیسماعیل، مەلا ئەحمەدی هۆرینی، حاجی شوکر داود، مەلا مەعصومی نەقشبەندی ئیمام و خەتیبی مزگەوتی قزرەبات، منالی مەلا مەعصوم پێم وایێت ناوی عومەر بووە، حاجی حوسێن هادی، حاجی سەعدوڵلا ڕەشید (عگال بەسەر) حاجی عەبدوڵلا حاجی جاسم (چاکەت و پانتۆل لەبەر) جومعە خودادادی بازرگان، مەلا وەلی بانگخوێنی ئەوکاتەی مزگەوتی جەلەولا .

دا و لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی پاشایەتیدا لە ساڵی (١٩٥٠) بونیادنراوە و بە فەرمی بـەڕووی کۆمەڵانی خەڵکدا کراوەتەوە. بەڵام یەکەم مەلاو گوتاربێژی مزگەوت لە ساڵانی (١٩٥٠-١٩٥٧) سەید تاهیری بەرزنجی و دواتر شێخ عەبدولقادر عەبدوڵلا عەبدولقادر بووە، کە لە ساڵانی (١٩٥٧-١٩٥٩) کراوەتە ئیمام و گوتاربێژی هەمان مزگەوت، واتە بەپێی ئەو خشتە و نووسراوە هەڵواسراوە فەرمییەی نێو مزگەوتەکە بێت، کە سەبارەت بەماوەی خزمەت و ئیمامەتی مەلاکانی ئەو مزگەوتەی شارۆچکەی جەلەولا ڕێکخراوە، مەلا ئەحمەدی هۆرینی دەبێتە سێیەمین مەلای مزگەوتی گەورەی شارۆچکەکە، بەدوای ئەویشدا، هەریەک لە شێخ عەبدولقادری باجەلان (١٩٦٣-١٩٧٢) شێخ ئەحمەدی بابا ڕەسول (١٩٧٢-١٩٧٥) پاشان شێخ عەبدولخالق، واتە ئەبو زەهـرەی میسری (١٩٧٥-١٩٧٦) دێن .

بـەجۆرێک مـەلا ئـەحـمـەدی هـۆرینـی لـە سـەروبـەندی خانەنشین بوونی بـەدواوە، زیاتر لە ماڵـەوە خەریکی خوێندنەوە و عیبادەت بووە، تا ئەوکاتەی لە شەوی جەژنی ڕەمەزانی (١٣٩٠ک) بەرانبەر بە (٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٠) هەر لە جەلەولا کۆچی دوایی کردوە و هەر لەوێش نێژراوە، لەگەڵ ئەوەشدا کتێبخانەیەکی دەوڵەمەندی لەدوا بەجێماوە، کە بەپێی گێڕانەوەی بنەماڵەکەی و هەروەها مامۆستا نەسرینی کچی زیاتر لە هەزار کتێبی جۆراوجۆرو دەستنووسی ناوازەی تێدا بووە، کە زۆربەیان کەوتوونەتە دەست بەشێک لە هاوەڵان و مەلای مزگەوتەکانی ناحیەی جەلەولا.

## تەوەری سێیەم: مەلا ئەحمەدی هۆرینی و دامەزراندنی بزووتنەوەی ئاشتیخوازان لە ناوچەی شێروانە ١٩٥٩

سـەرەتـای سـەرهەڵدانی بزووتـنـەوەی ئاشتیخوازان لە ناچەی شێروانە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٥٠ بەڵام یەکەمین کۆنگرەی خۆی لە شاری بەغداو لە ساڵی (١٩٥٤) گرێ داوە و لەگەڵ ئـەوەشـدا چەند کەسایەتییەکی کوردی وەک ئیبراهیم ئەحمەد، شێخ لەتیفی شێخ مەحمودی حەفید، محەمەد ئەمین زەکـی بـەگی مـێژوونووس و وەزیر، شاعیری ناسراو عەبدوڵلا گۆران، لەگەڵ مامۆستا مەسعوود محەمەدی کوڕی مەلای گەورەی کۆیە تیایدا بەشدار بوون، بەڵام کۆنگرەی دووەمـی هەر لە شاری بەغدا، کە بە سەرپەرشتی عەبدولکەریم قاسم و لەژێر دروشمی (ئاشتی و پارێزگاری لە کۆمار - السلم وصیانە الجمهوریة) لە ڕۆژانی (١٦-١٧ی نیسانی ١٩٥٩) کارەکانی بەڕێوەچووە، بەجۆرێک لەم کۆنگرەیەدا کەسایەتییەکی

ناسراوی چەپی وەک: عەزیز شەریف بە سەرۆکی ئەنجوومەنی نیشتمانیی بۆ پشتیوانانی ئاشتی لە عێراق هەڵبژێردرایەوە، شانبەشانی ئەوەش دەستەیەک لە رووناکبیرانی چەپ بوونە هاوکاری سەرەکی.

لە (٧ی کانوونی دووەمی ١٩٥٩) عەزیز شەریف سەرۆکی ئەم بزووتنەوەیە توانیویەتی ئیمتیازی بڵاوکردنەوەی گۆڤارێکی هەفتانەی سیاسی بە ناوی نیشتمانەکەمان (وطننا) وەک زمانحاڵ بۆ ئەم رێکخراوە تازەیە وەربگرێت، هەرچەندە دواتریش ناوەکەی گۆڕاوە بۆ ئاشتی (السلم) هاوکات بە شێوازێکی فەرمی لەلایەن عەبدولکەریم قاسم خۆیەوە رێگە بەکار و چالاکی وەک بزووتنەوەیەکی جەماوەریی دراوە، بەوەی ئەم بزووتنەوەیە گرێدراوە بەبوون و کیانی هەموو هاولاتییەکی عێراقییەوە، گرێدراویشە بە هەموو کەسێکی ئاشتیخوازەوە لەسەرتاسەری جیهان، ئیدی لێرە بەدواوە ئەم بزووتنەوە جەماوەرییە لە عێراق و لە هەموو ناوچە جیاجیاکانی باشووری کوردستان-یش، بەهەموو شار و شارۆچکەکانییەوە، دەتوانێت درێژە بەکار و چالاکییەکانی بدات، تەنانەت دەشتوانێت لق و لیژنەی تایبەت بکاتەوە و هەموو کەسایەتی و رەگەزێکی باش بە نێر و مێوە، بێ گوێدانە هیچ ئینتما و بیروڕایەکی ئایینی، سیاسیی و کۆمەڵایەتی لە دەوری چالاکی و رێکخستنەکانی کۆبکاتەوە، هەرچەندە زۆرێک لە کۆمەڵانی خەڵک لەو قۆناغەدا وای بۆدەچوون، کە بزووتنەوەی پشتیوانانی ئاشتی لەعێراق و باشووری کوردستان، زیاتر بریتییە لە باڵێکی حزبی شیوعی عێراق، کەچی بە پێچەوانەوە ئەم بزووتنەوە جەماوەرییە هەموو بیروڕا و بۆچوونێکی جیاوازی لەخۆ گرتبوو، سالانێکی زۆریش بوو لە کار و چالاکی بەردەوام بوو، یەکێک بوو لەو لیژنانەی، کە سەر بە بزووتنەوەی پشتیوانانی ئاشتی لە سنووری گەرمیان و قەزای کفری و بەتایبەتی لە ناحیەی شێروانەی ئەوکاتە، کە هەر لەساڵی (١٩٥٩) کرابووەوە، بە سەریەکەوە دەستەیەکی هەشت کەسی بۆ هەڵبژێردراوە، بە سەرۆکایەتی ئەحمەدی فەتاح رۆستەم (١٩٢٩-١٩٧٥) ی دانیشتووی کەلاری کۆنی ئەوکاتە و ئەندامێتی چەند کەسێکی هاوکاری لەوانە: محەمەد سەعید بەگی کوڕی حمە بەگی جاف ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق (١٩٢٨-١٩٣٠) جوامێر عەبدولقادر، لەگەڵ کەسێکی هەڵەبجەیی بەناوی عەبدولکەریم مارف کەریم محەمەد (١٩٣٢-٢٠٠٥) کە لەو ماوەیەدا خێزانەکەی خەڵکی کەلاربووە، خۆیشی لە کارگەیەکی نزیک گوندی گردە گۆزینەی سەر بە کەلاری ئێستە کاری کردووە، بەوهۆیەشەوە، بە زۆری سەردانی ناوچەی شێروانە و کەلاری کردووە، سەرەڕای کەسێکی وەک فەتاح عەزیز سەید مراد (١٩٤٣-١٩٨٤) کە ماوەیەک فەرمانبەری بەرید و تەلەفۆنات و دواتریش لە حەفتاکانی سەدەی بیستەم بووە بە فەرمانبەری ناوەندی دابەشکردنی قوتابخانەکان، لەگەڵ عەلی سەلیم بەگ (١٩١٨-١٩٨٩) کە لە ساڵانی پێشووتر ماوەیەک لە حزبی هیوا و دواتریش لە ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان باڵی (جەلالی) کاری کردووە، جگە لە ئیمام و گوتاربێژی مزگەوتی کەلاری کۆن. واتە مەلا ئەحمەد عەبدولعەزیزی هۆرینی، لەگەڵ شێخ رەشید شێخ حەسەن (١٩٢٧-٢٠٠١) کە بەڕەسەن خەڵکی گوندی بەڵخەی ناوچەی قەرەداغی دانیشتووی کەلار بووە .

کاتێک شۆڕشی (١٤ی تەممووزی ١٩٥٨) لە عێراق سەرچاوە دەگرێت، ئیدی کاری رێکخراوەیی و چالاکی کۆمەلانی خەلکیش دژ بەسیستمی پاشایەتی بەشێوازێکی چڕوپڕ دەستی پێکردووە، کەسێکی وەک مەلا ئەحمەد عەبدولعەزیزی هۆرینی ئیمام و گوتاربێژی مزگەوتی کەلار-یش یەکێک بووە لەوانەی، ناوبەناو لەو جۆرە چالاکیانە بەشداری کردووە، بۆ نموونە جارێکیان لەگەڵ هەریەک لە شێخ عەتای کوڕی شێخ جەمالی تالەبانی (١٩٢٥-٢٠٠٠) و حسین عەلی محەمەد بەیاتی بەڕێوەبەری قوتابخانەی کەلاری سەرەتایی (١٩٥٦/٩/٢٤-١٩٥٨/٩/١٥) کە هەردووکیان پێکەوە، دوو کادیری چالاکی ئەوکاتەی حزبی شیوعی عێراقی ناوچەی گەرمیان و سنووری قەزای کفری بوون.

لە کەلاری ئەودەمانەدا بەخوێندنەوەی گوتار لە خۆپیشاندانە جەماوەرییەکان بەشداری هەبووە، ئەمەش لە کاتێکدا بوو، کە هێشتە بنەماڵە و بەگزادەکانی جاف لە گەرمیان و کەلار مابوون و ناوچەکەیان بەجێ نەهێشتبوو.

ماوەیەک دواتر، وەک چالاکی رێکخراوەیی و خۆناساندنیان لە ناوچەی شێروانەی سنووری گەرمیان، لیژنەی شێروانەی پشتیوانانی ئاشتی بەیاننامەیەکی نووسراویان وەک (لیژنە و رێکخراوی ئاشتیخوازانی شێروانە) بڵاوکردۆتەوە، لێرەش بەدواوە دووکەسی دی ناوچەکەیان هاتۆتە پاڵ، بەم جۆرە لە کەلار و ناوچەکە وەک ئەندام و چالاکی کاری رێکخراوەیی ژمارەیان بوو بە دە کەس، کە ئەوانیش هەریەک لە: محەمەد ساڵح عەزیز سەید مراد (١٩١٢-١٩٨٧) برای فەتاح عەزیزی

سەید مرادی کەلار، کە لە ساڵانی دواتردا بۆ ماوەیەک موختاری کەلاری کۆن بووە، لەگەڵ خوێندکارێکی قوتاغی ئامادەیی (خانەقین) حەسەن کەریم جاف (١٩٤٣) کە وەک نوێنەری یەکێتی قوتابیانی کوردستانی سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان واتە دکتۆر حەسەن کەریم بەگی جافی ئێستە بووە، ئەویش لێرە بەدواوە، بووە بە یەکێک لە ئەندامانی نوێی (لیژنەی ئاشتیخوازانی ناوچەی شێروانە) لە سنووری گەرمیان.

یەکەمین چالاکی و هەڵوێست و کاری رێکخراوەییان بەناوی (لیژنەی ئاشتیخوازانی ناوچەی شێروانە) بەتایبەتی نووسین و دۆکۆمێنتی نووسراو، کە پێکهاتووە لە بڵاوکردنەوە و راگەیاندنی بەیاننامەی نووسراوی گرنگ، کە بۆ ئەو کاتەی ناوچەی گەرمیان و سنووری ناحیەی شێروانەی سەر بە قەزای کفری لە گۆڕەپانی سیاسی عێراق و ناوچە کوردنشینەکانی باشووری کوردستان، بە بۆچوون و لێکدانەوەی ئێمە بۆ ئەو هەلومەرجە کۆمەڵایەتییەی گەرمیان و ناوچەی شێروانە بابەتێکی نوێ و سەرنج راکێش بووە، چونکە لە ناوچە و شوێنێکی دوورە دەستی وەک کەلار و شێروانەی ئەوکاتە، کە ناوچەیەکی تارادەیەک پەراوێز کەوتووی دوورە دەستبوون لە ناوەندی شار و دامودەزگای حکومی و ناوەندی کاری رێکخراوەییەوە، هەنگاوێکی زۆر دڵخۆشکەربووە.

کارێکی لەوبابەتە بەزۆری دووکەسایەتی خوێندەوار و رووناکبیریی ناسراوی ئەودەمانەی لەپشتەوە بووە، ئەوانیش بە لێکدانەوەی ئێمە هەریەک لە: محەمەد سەعید بەگی جاف و مەلا ئەحمەد هۆرینی ئیمام و گوتاربێژی مزگەوتی کەلار بوون، بەتایبەتی رووناکبیرێکی وەک محەمەد سەعید بەگی جاف، کە لەوکاتەدا، بە شایەتی زۆرێک لە کەسایەتی و کۆمەڵانی خەڵکی ناوچەکە نووسەر و زمانزان و رووناکبیرێکی دیاری باشووری کوردستان بووە، وەک دەشگوترێت لەو دەمانە و ساڵانی پێشتریش، خاوەنی کتێبخانەیەکی زۆر دەوڵەمەند بووە. بەردەوام نووسین و بابەتی جۆراوجۆر و وەرگێردراوی لە گۆڤار و رۆژنامە بەناوبانگەکانی وەک: گەلاوێژ، دەنگی گێتی تازە، هیوا، هەتاو، رووناهی و برایەتی بڵاوکردووەتەوە.

ساڵانی دواتریش ئەندامی دەستەی نووسەرانی رۆژنامەی برایەتی بووە لەشاری بەغدا، کە جێی سەرنجی زۆرێک لە خوێنەران و دەستەی رووناکبیری کورد بوون، ئەو وەک نووسەر و کەسایەتیەک لەنێو خانەوادە و بەگزادەکانی جافی کەلار و ناوەندی رووناکبیریی کوردیی خاوەنی پێگەیەکی کۆمەڵایەتی و بیروڕایەکی چەپ بوو. تارادەیەک لە رێکخستنەکانی حزبی شیوعی عێراقی نزیک بووە و بە بەردەوامی هاتووچۆی شاری بەغدا و ماوەیەکیش حەمە بەگی جافی باوکی کردووە.

داکۆکی کارێکی دیاری مەسەلەی کورد بووە، لەنێو پەرلەمانی عێراق، پاشان داود بەگی جافی مامی بەهەمان شێوە ئەندامێکی کارای نێو ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقی سەردەمی پاشایەتی بووە، بە جۆرێک کەسێکی وەک داود بەگی جاف هەر لە ساڵی (١٩٣٦)ەوە تا کاتی بەرپابوونی شۆڕش (کودەتا)ی (١٤ی تەممووزی ١٩٥٨) بەسەریەکەوە لە نۆ خولی پەرلەمانی عێراق نوێنەری لیوای کەرکووک (کفری) بووە لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی سەردەمی پاشایەتیدا .

**لەبەرنەبوونی مەلا و گوتارخوێنی پێویست لە کەلار و هەر لەسەر داواکاریی و ڕاسپاردەی داود بەگی جاف مەلا ئەحمەدی هۆرینی لە شارۆچکەی قزرەباتەوە دەگوازرێتەوە کەلار**

وەک دەبینی لە رۆژگارێکیشدا محەمەد سەعید بەگ ئەو دەقی نووسین و چیرۆکی نووسەرانی ئەوتۆی جیهانی بەتایبەتی لەزمانی فارسییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردیی و لە زۆرێک لە گۆڤار و رۆژنامە کوردییەکانی ئەودەمانە بڵاوکردوونەتەوە، کە بۆ ئەوکاتە و ئەو هەلومەرجەی کوردستان و ئێستەشی لەگەڵدا بێت، هەنگاونانێکی گەورەی بێ وێنە بوون، بە ئاڕاستەیەکی رووناکبیریی گەشەکردووی دەوڵەمەند.

بۆیە زۆر دڵنیام لەوەی، کە دەقی ئەم نووسین و بەیاننامەیەی، کە لەم نووسینەدا، لە ناوەرۆک و وردەکارییەکانی دەدوێم، لەسەر چەند خاڵێکی گرنگی دەوەستم، دواتریش دەقەکەی بە تەواوی و وەک خۆی بە رێنووسی نوێ بڵاودەکەمەوە، کە گومانی تێدا نییە، لە نووسینی هەریەک لە محەمەد سەعید بەگی جاف و مەلا ئەحمەدی هۆرینی بووە. هەر لە رێگەی ئەوانیشەوە گەیەندراوەتە گۆڤاری (هەتاو) و شوێنانی دی، بە

مەبەستی بڵاوکردنەوەیان، کە مامۆستا گیوی موکریانی (١٩٠٤-١٩٧٧) لە ساڵانی (١٩٥٤-١٩٦٠) لە شاری هەولێر بڵاوی کردۆتەوە.

لەخوارەوەی نووسین و بەیاننامەکانیشیان چەند کەسێکی دی ناوچەکە لە سنووری ناحیەی شێروانە و کەلاری کۆنی ئەودەمانە دا ناوی تەواویان و پیشەی ڕۆژانەیان زۆر بە ڕوونی دەست نیشانکراوە، سەرەڕای هاتنی ناوی لاوێکی خوێندکاری نێو بەگزادەکانی وەک: حەسەنی کەریم بەگی جاف، کە لەو ماوەیە، وەک خۆی باسی دەکات، لەو دەمانەدا خوێندکاری قۆناغی چوارەمی ئامادەیی (بەشی وێژەیی) دواناوەندی شاری خانەقین بووە، وەک (نوێنەری یەکێتیی قوتابیانی کوردستان) ناوی لە ڕیزی واژۆکەرانی نووسین و بەیاننامەکەی لیژنەی ئاشتیخوازانی ناوچەی شێروانەدا هاتووە .

دەقی نووسینی بەیاننامەکەیان بە ناوونیشانی: «بانگی ئاشتی بۆ دانیشتوانی ناوچەی شێروانە» بڵاوکراوەتەوە، کە بە کوردییەکی جوان و پاراو نووسراوە، وەک ئاماژەی بۆکراوە ناوەرۆکی نووسینەکە کۆمەڵێک لێکدانەوە و باری سەرنجی کۆمەڵایەتی، سیاسیی و ئاشتەوایی جیهانی بەڕوونی تیا بەرجەستەکراوە، کۆمەڵانی خەڵکی عێراق و باشووری کوردستان و تەنانەت ناوچەکەشی لێ بە ئاگا هێنراوەتەوە، تا ئەوکاتەی لە ڕێگەی ناوەندەکانی ڕاگەیاندن و بەتایبەتی گۆڤار و ڕۆژنامەکانی وەک: ژین و گۆڤاری هەتاو، ناوبەناویش لە ڕۆژنامەی (خەبات)ی زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان بڵاوکراونەتەوە.

ئەنجامدان و بڵاوکردنەوەی ئەم بابەتەش وای کردووە (لیژنەی ئاشتیخوازانی ناوچەی شێروانە) خۆناسین و سنوور بەزاندنێکی زیاتر و بەرفراوانتر بەخۆیەوە ببینێت، وەک ئەوەی بە بۆچوونێکی بەرفراوانی ئاشتی خوازانەوە داوایان لە تەواوی مرۆڤایەتی و میللەتانی جیهان کردووە، بۆ ئەوەی ئاشتی و ئاسایش لە هەموو شوێن و جێگایەکی جیهان بەرقەرار بێت و سێبەری ئاشتی باڵ بەسەر تەواوی وڵات و مرۆڤایەتیدا بکێشێت، واتە ئاشتی و بەرقەرارییەک، کە لە سایەی دیموکراتیەت و کۆماری نوێ و سیستمی نوێی کۆماریی، کە لە سایەی دەستەڵاتی عەبدولکەریم قاسم-دا هاتۆتە دی، بە جۆرێک دەستگرتن و بە تەنگەوە چوونی ئەمانەوە ئاستی زانستیی و خوێندەواریی لە وڵاتەکەماندا پێش بکەوێت و لە ڕووی کشتوکاڵ کردن وسامانی پیشەسازییەوە زیاتر دەچێتە ڕیزی وڵاتە پێشکەوتووەکانی دونیاوە، وەک لەم بارەیەوە و لەبەشێکی بەیاننامەکەیاندا هاتووە: «بۆ ئەوکەسانەی پڕ بەدڵ حەز لە ئاشتی و برایەتی ئەکەن بۆ ئەوانەی بەرامبەر بە شەڕ هەڵگیرسێنەرەکان ڕق هەڵسان و بێزاری خۆیان دەر ئەبڕن بە دەنگی بەرز بانگیان ئەکەین هەوڵبدەن و تێ بکۆشن بۆئاشتی چونکە بە هەوای سەرکەوتنی ئاشتییەوە لە جیهاندا جمهورییەتە دیموکراتیەکەمان لە دەست دوژمنانی سەربەستی بۆ ئەپارێزێت و پلەی زانست و خوێندەواریمان بەرز ئەبێتەوە و نیشتمانی خۆشەویستمان لە کشتوکاڵ کردن و پیشەسازیدا ئەچێتە ڕیزی وڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهان» .

بەشێکی دیکەی ناوەڕۆکی بەیاننامەکە ڕووبەڕووی ئەو سیاسەتی هاوپەیمانییەی بەغدای سەردەمی پاشایەتی دەبێتەوە، کە لە ساڵی (١٩٥٥) لەکاتی دوازدەیەمین حکومەمەتی نوری سەعید (٣ی ئابی ١٩٥٤- ١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٥) هاتۆتە کایەوە، بە بەرپابوونی شۆڕشی (١٤ی تەمموزی ١٩٥٨) و کۆتایی هێنان بە دەسەڵاتی پاشایەتی و سەرهەڵدانی سیستمی کۆماریی و دەسەڵات گرتنە دەستی عەبدولکەریم قاسم، هەروەها لە (٢٤ی ئازاری ١٩٥٩)دا، بەپێی بڕیارێکی فەرمی حکوومەتی عێراق لە ئەندامێتی هاوپەیمانی ناوبراو کشاوەتەوە و بە یەکجاری بارەگا سەرەکییەکەشی لە شاری بەغدا داخستووە . کە تا ئەوکاتە ئەمان و فەرمانڕەوایانی نوێی کۆماری عێراق بە مەترسییەکی زۆر گەورەیان زانیووە بۆسەر ئەمنیەت و ئاسایشی جیهانیی.

ئەوەشی، کە سوودمەندی سەرەکی بووە لەم هاوکێشەیە و لەم هاوپەیمانییەتیەدا، سەرەڕای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەو وڵاتە ناوچەییانەی دی وەک تورکیا و ئێرانی شاهنشاهی بوون، کە بەردەوام بوون لە سەرکوتکردنی کورد و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد لە هەموو بەشەکانی کوردستانی دابەشکراو و داگیرکراودا.

هاوکات دەنگی خۆیان خستووەتە پاڵ دەنگی ئەو وڵات و میللەتانەی، کە تا ئەوکاتەش لە خەبات و تێکۆشانی بێ وچانا دابوون بۆ سەربەخۆیی و ڕزگاربوون لە کۆت و بەندی وڵاتانی داگیرکەر لەوانە: خەباتی گەلی جەزائیری دژ بە داگیرکاری چەند ساڵەی فەرەنسا. یان میللەتانی عەمان و تایوان وەک ئەوەی لە درێژە و دەقی تەواوی بەیاننامەکەیاندا ئاماژەیان بۆ کردووە، بۆیە بە ڕۆحیەتی برایەتی و یەکسانییەوە، داوایان کردووە و نووسیویانە:

«پێویسته هەوڵ بدەین دەستی ئاشتی و برایەتی بۆهەموو گەلێکی ئاشتیخوازی جیهان درێژ بکەین و هەمووکاتێک بە هەموو هێزێکمانەوە بەرهەڵستی بکەین بۆ ئەوەی هێزی ئاشتیخوازان لە جیهاندا سەر بکەوێت و بازرگانە درندەکانی شەڕ نابووت بکرێن» .

لایەنێکی دیکەی گرنگی ئەم نووسین و بەیاننامەیەی «لیژنەی ئاشتیخوازانی ناوچەی شێروانە» لەسنووری گەرمیان، لەوەدایە، کۆمەڵێک کەسایەتی ئەوتۆی لەپشتەوە بووە، کە بە زۆری ئاراستە و بۆچوونی فەرهەنگیی، کۆمەڵایەتی و سیاسیی جیاواز و جۆراوجۆریان هەبووە، لە هەموو چین و توێژیکی کۆمەڵایەتی ئەودەمانەی کەلار و ناوچەی شێروانە، هەر لە جووتیار، کرێکار، خاوەن موڵک و زەویدار، مەلای مزگەوت، فەرمانبەر، خوێندکاری قوتابخانە و نوێنەری ڕێکخراوی حزبی، وەک ئەوەی بە وردی ناوەکانیان لە کۆتایی دەقی نووسین و بەیاننامەکەدا هاتووە و بە زۆری خاوەنی بیرورای جیاوازی نێو کۆمەڵانی خەڵکی گەرمیان و کەلاری ئەوکاتە بوون.

ئەمەی خوارەوەش دەقی نووسینەکەیە، کە وەک خۆی، بۆ سوودی گشتیی و لێکدانەوەی زیاتر بڵاوی دەکەینەوە.

### بانگی ئاشتی بۆ دانیشتوانی ناوچەی شێروانە

بۆ سەربەستە بە شەرەفەکان، بۆ ژنان و پیاوانی ئازاد، بۆ ڕیش سپی و منداڵان بۆ ئەو کەسانەی پڕ بەدڵ حەز لە ئاشتی و برایەتی ئەکەن بۆ ئەوانەی بەرامبەر بە شەڕ هەڵگیرسێنەرەکان ڕق هەڵسان و بێزاری خۆیان دەرئەبڕن بەدەنگی بەرز بانگیان ئەکەین هەوڵبدەن و تێ بکۆشن بۆ ئاشتی چونکی بە هەوای سەرکەوتنی ئاشتییەوە لە جیهاندا جمهوریتە دیموکراتیەکەمان لە دەست دوژمنانی سەربەستی بۆ ئەپارێزێت و پلەی زانست و خوێندەواریمان بەرز ئەبێتەوە، نیشتمانی خۆشەویستمان لە کشتوکاڵ کردن و پیشەسازیدا ئەچێتە ڕیزی وڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهان، کەوابوو پێویستە لەسەرمان بەهەموو تواناییەکمانەوە لە ڕێگای ئاشتیدا هەوڵ بدەیت هەر لەبەر هەستی ئاشتی پڕ بەدڵ ڕق هەڵسان وە بێزاری ئاشکرا ئەکەین بەرامبەر ئەو پەیمانە عەسکەرییانەی ئەمریکا کە ئەیەوێت لەگەڵ تورکیا و ئێران و پاکستاندا بی بەستێت چونکی بەستنی ئەو پەیمانە عەسکەرییانە دوژمنایەتیەکی زۆر گەورەیە بەرامبەر بە گەلەکانی جیهان بەتایبەتی بۆ میللەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. بازرگانانی شەڕ ئەیانەوێت دراوسێکانمان بکەن بە بنکەی شەڕ و جێگای دەست درێژکردن بۆ تێکدانی ئاشتی و ئاسایشی جیهان، هەروەها ئەیانەوێت بە عەسکەری و ئابووری ئابڵۆقەی جمهوریەکەمان بدەن و دراوسێکانمان بکەن بەجێگای هەڕەشە و کەڵەکردن و هەوڵ ئەدەن لە هەمووڵایەکی جیهاندا ئاگری شەڕێکی کاولکەر هەڵگیرسێنن وەکو هەتاوەکو ئێستا لە جەزائیر و عەمان و تایوان خوێنی هەزاران بێتاوانیان بە گوناهی داوای سەربەستی ڕشتوە، وە ئەیانەوێت لەچوار گۆشەی گێتی دا بنکەی بۆمبای ئەتۆم و ساروخ دابنێن و بەتایبەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بکەنە جێگای شەڕ و پیلانە گڵاوەکانیان ئەی خوشک و برا خۆشەویستەکانمان بۆ ئەوەی نیشتمانی جوانمان لە دەست فروفێڵی پیلانگێڕەکان و بازرگانانی شەڕ بپارێزین پێویستە هەوڵ بدەین دەستی ئاشتی و برایەتی بۆ هەموو گەلێکی ئاشتیخوازی جیهان درێژبکەین، وە هەموو کاتێک بە هەموو هێزێکمانەوە بەرهەڵستی بکەین بۆ ئەوەی

**مەلا ئەحمەدی هۆرینی لەکات و ساڵانی مانەوەیدا لە سنووری گەرمیان پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵێک کەسایەتی ناوچەکە و عێراق هەبووە، لەوانە عەبدولڕەحمان عارف سەرۆک کۆماری عێراق**

هێزی ئاشتیخوازان لە جیهاندا سەربکەوێت و بازرگانە درندەکانی شەڕ نابووت بکرێن، پێویستە هەموو کاتێ هاوار بکەین، بەدەنگی بەرزبڵێین بژی ئاشتی لە بەینی میللەتانی جیهاندا، بژی پشتیوانی ئاشتیخواهان کاک عەبدولکەریم قاسمی خۆشەویست و مردن بۆ شەڕ فرۆش و شەڕ هەڵگیرسێنەرەکان.

لەلایەن کۆمەڵی ئاشتیخوازانی ناوچەی شێروانە

(ئەحمەد فەتاح ڕۆستەم- جوتیار. محەمەد سەعیدبەگی جاف-خاوەن زەوی. جوامێر عەبدولقادر-جوتیار. عەبدولکەریم مەعروف-کرێکار. ڕەشید شێخ حەسەن-کرێکار. عەلی سەلیم جاف-جوتیار. مەلا ئەحمەد هۆرینی-مەلای مزگەوتی کەلار. محەمەدساڵح عەزیز-جوتیار. فەتاح عەزیز-تەلەفۆنەوان. حەسەن عەبدولکەریم-ی جاف (ئەندامی یەکێتی قوتابیان) .

## سەرچاوە و پەراوێزەکان:

١ - ذنون یونس حسین الطائی، الاوضاع الاداریة فی الموصل ١٩٢١- ١٩٥٨، رسالة (دکتوراه) غیرمنشورة، کلیة الاداب جامعة الموصل (الموصل:١٩٩٨) ص١٠٧.

٢ - خێزانی مەلا محەمەدی جوانڕۆیی کە ناوی (تەیبەخان) بووە، دەبێتە کچی شێخ ئەحمەدی شێخ ئەمینی شێخ قادری قەرەداغی، بەڕەسەن دانیشتووی گوندی بەلخەی قەرەداغ بوون و دواتر هاتوونەتە کەلار و لەوێ نیشتەجێبوون. بڕوانە: ئەحمەد باوەڕ، باشووری کوردستان لەبەر ڕۆشنایی دەستنووس و یاداشتەکانی مەلا محەمەدی جوانڕۆیی دا ١٨٦٨-١٩٣٨ (تاران: ٢٠١٧) ل٢٠٥.

٣ - محەمەد عەلی قەرەداغی، ئەلبومی کەشکۆل، ب١ (هەولێر:٢٠٠٨) ل١٧٨-١٧٩.

٤ - بەپێی گێڕانەوەی مامۆستا عەلی کوڕی مەلا ئەحمەدی دەککە (١٩٣٧) باوکی نووجار لە کەلار ژیانی هاوسەری پێکەوەناوە یەکەمیان ناوی: ئامینەی کچی حسین عەلی زەلام، کە لە هۆزی پالانی بووە و دوومندالی لێ هەبووە بەناوەکانی: محەمەد سدیق، بەپێی دەستنووسێکی مەلا ئەحمەد خۆی نووسیویەتی تولد فرزندی محمد صدیق لە شەوی جمعه (٥ی جمادی الاولی ١٣٣٤) دواتر بەمەلا سدیق ناسراو بووە و لە سالی (٢٠٠٢) لە شاری خانەقین کۆچی دوایی کردووە. کچێکیشی هەبووە، بەناوی (فاتمە) کە هەر بە مندالی کۆچی دوایی کردووە، بەلام هاوسەری دووەمی ناوی: ڕەعنا خانمی کچی شێخ محەمەدی هەنجیران بووە و دەبێتە خوشکی شێخ بابا عەلی (بێدار)ی شاعیری بەناوبانگی گەرمیان، کە لە (گۆڤاری گەلاوێژ) شیعری بلاوکراوەی هەیە و دواتریش بەشێک لە شیعرەکانی لەنامیلکەیەکدا کۆکراونەتەوە. بە جۆرێک لەم ژنـەی، یەکەمین مندالی کچێکە بەنـاوی عەتیە و لە بارەیـەوە نووسیویەتی تولدی فرزندی عطیه لە شەوی یەک شەنبە (٣ی ذی لحجه١٣٤٠) لەبارەی لەدایک بوونی کوڕەکانی دیکەیەوە نووسیویەتی تولدی فرزندی عبدالله ( ٢٠ی شعبانی ١٣٤٤) تولدی فرزندی محمد لەشەوی (٢٥ی شعبانی ١٣٥١) تولد فرزندی محمد علی لەشەوی دووشەنبە (١١ی جمادی الاولی ١٣٥٦) دەستنوسێکی مەلا ئەحمەدی دەککە؛ دیدەنی لەگەل مامۆستا عەلی مەلا ئەحمەدی دەککە، خانەقین (١٥ی شوباتی ٢٠٢١).

٥ - بڕوانە: ئەحمەد باوەڕ، چەند نامەیەکی بلاونەکراوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس بۆ مەلا سەید عەبدوڵلای سەید ئەمینی موکریانی ١٩٠٥-١٩٨٦، شیکار (گۆڤار) ژمارە(٢٢) بەهاری ٢٠١٨، ل١٩١- ٢٠٧.

٦ - عەبدوڵلا بەگی کوڕی کەیخەسرەوبەگ: لەنەوەی مەحموود پاشای جافە و تەنیا یەک برای هەبووە بەناوی حەمئەمین بەگ، بەلام عەبدوڵلا بەگ لەسالی (١٨٩٠) هاتۆتە دونیاوە، دوای مردنی کەیخەسرەو بەگی باوکی کاروباری ناوچەی قزرەباتی گرتووتە ئەستۆ، خێزانەکەی ناوی (فاتمەخان) بووە و دەبێتە کچی فەتاح بەگی حمە پاشای جاف، بەلام هیچ مندالێکی لێ نەبووە، لە ژنی دووەمی کە (سەلمەخانی کچی حسێن بەگی مەحموود پاشا) بووە، تەنیا یەک کچی لێ بووە بە ناوی: (ئامینە) کە دواتر بووە بەخێزانی حەسەن بەگی عەلی بەگی مەحموود پاشای جاف، لە ژنی سێیەمی، کە ناوی (نوریە خانی کچی حسێن بەگی ئەحمەد بەگی کەرە)ی خەلکی سلێمانی بووە، تەنیا کچێکی هەبووە بەناوی (حەسیبە) و دواتر بووە بە خێزانی عەلی بەگی کوڕی ڕەزا بەگی جاف و بە زۆری لە ناوچەی قزرەبات ژیاوە و لەسالی (١٩٤٤) هەر لەوێ کۆچی دوایی کردوە و لەمزگەوتی مەحموود پاشای جاف نێژراوە.

٧ - خەسرەو جاف، مێژووی مزگەوت و منارە و میحراب و مینبەر و مەزار (هەولێر:٢٠٢٠) ل٨٧.

٨ - مەلا سەعیدی کولەجۆ: دەبێتە کوڕی مەلا محەمەدی کوڕی مەلا عەبدولڕەحمانی زەند، لەسالی (١٨٨٩) هاتۆتە دونیاوە، بەمەستی خوێندن زۆر ناوچەی کوردستان گەڕاوە، ماوەیەکیش لای مەلا سەعیدی موفتی کفری (١٨٥٨-١٩٤١) خوێندوویەتی و ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، بەپێی فەرمانێکی بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی کەرکووک و بەهەولی داود بەگی جاف، کە ئەوکاتە نوێنەری لیوای کەرکوک (کفری) بووە لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق لەسالی (١٩٤٧) وەک ئیمام و خەتیبی مزگەوتی کولەجۆ دامـەزراوە، ماوەیەکیش لە چەند شوێنێکی وەک: هەفتەغار، زەرداوی ژووروی سەربەشاری کفری و ماوەیەکیش لە مزگەوتی مەحموود پاشای جاف بووە لە شارۆچکەی قزرەبات. مەلا سەعیدی کۆلەجۆ لەژیانیدا چوارجار ژیانی هاوسەرگیریی پێکەوە ناوە، یەکەم خێزانی ناوی مەحبوبە مەمەش بووە، تەنیا مەلا عەلی (١٩٢٤-١٩٨٢/٢/٢٣) لێ بووە، خێزانی دووەمی ناوی نارنج بووە، تەنیا یەک کوڕی لێ هەبووە بە ناوی عەبدولڕەحمان، سێیەمیان ناوی (ئامینە سالم) بووە، بەهەمان شێوە تەنیا کوڕێکی لێ هەبووە بەناوی عەبدولوەهاب، چوارەمیشیان ئایشە ئیبراهیم کوڕێکی لێ هەبووە بەناوی عەبدولکەریم، خۆیشی لە (٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٢) کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی (تەپەی کەلان) لە ناوچەی زەنگاباد نێژراوە، دواتریش کوڕەکەی (مەلا عەلی) جێگای گرتوتەوە، دەستنوسێکی فەتحوڵلای مەلا عەلی کوڕەزای؛ عبدالکریم محمد المدرس، علماؤنا فی خدمه العلم والدین، عنی بنشره: محمد علی القرداغی (بغداد:١٩٨٣) ص٢٢٧؛ مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی، بەیان (گۆڤار) ژمارە (١٦٩) سالی(١٩٩٢) ل١١.

٩ - مستەفا سەعید، مزگەوتی کەلار لە بەلگەنامەیەکی سالی ١٩٤٧ دا، یادی کەلا، بلاوکراوەیەکی تایبەتە بەسالیادی ڕۆژی کەلار، ژمارە (٣) شوباتی ٢٠١٩، ل١٤٩-١٥٢.

١٠ - عەبدوڵلا قەرەداغی، نەوەکانی سەید ئیبراهیمی بەرزنجی، شێخانی شاکەل ١٧٨٤-٢٠١٨ (کەرکوک:٢٠١٨) ل٥٣-٥٤.

١١ - مستەفا نەریمان، شاعیرانی کفری و دەوروپشتی، دەزگای ڕۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی (بەغدا:٢٠٠٨)

١٢ - وەک خوالێخۆشبوو حاجی مەحموودی محێدینی کەلار دەیگێڕایەوە: خاتوو زێبای کچی شێخ عەبدوڵلای قەلاتە پزان، کە خێزانی شێخ مەحموودی شاکەل بوو، وەک ژنێکی خواناسی قسە ڕۆیشتووی ئەوکاتەی کەلار و ڕێزلێگیراوی نێو بەگزادەکانی جاف، بەدەنگێکی بەرز بانگی لە خوالێخۆشبوو داود بەگی جاف کردووە، وەک پێشبینیەکی پێشوەخت پێی گوتووە: داود ..داود نەکەن مەلامستەفا دەربکەن، چونکە دەرکردنی مەلامستەفا چارەنووسێکی خراپی بەدواوە دەبێت ورەنگە دوای ماوەیەک ئێوەش هەمان چارەنووستان هەبێت.

١٣ - قیدی قوتابخانەی کەلاری سەرەتایی سالانی :١٩٥٤-١٩٥٥، ١٩٥٥-١٩٥٦، ١٩٥٦-١٩٥٧، ١٩٥٧-١٩٥٨.

١٤ - دیدەنی لەگەل مامۆستا سالح حاجی مەحموود ئەلماس، کەلار (تەمووزی ٢٠٢٠) مامۆستا سەلاحی مەلا ئەحمەدی هۆرینی (١٩٤٠) دهۆک (تەمووزی ٢٠٢٠).

١٥ - دیدەنی لەگەل مامۆستا سەلاح مەلا ئەحمەدی هۆرینی (تەمووزی ٢٠٢٠).

١٦ - دیدەنی لەگەل مامۆستا محەمەدی کوڕی مەحموودی ڕەزا بەگی جاف (١٥ی تەمموزی ٢٠٢٠).

١٧ - خاک وخون (روزنامه) فقدان یک شخصیت بزرگ کرد، شماره (٨٧)،سال دوم، خردادماه،١٣٤٥.

١٨ - ئایەتوڵلاخلخالی: لەسالی (١٩٢٩) لە گیوی سەر بە خلخال هاتۆتە دونیاوەو دەستی بەخوێندن کردوە، دواتریش لە ئەردەبیل درێژەی بەخوێندن داوە، پاشان لەسەر راسپاردەی باوکی چۆتە (قوم) لەوێش کتێبەکانی سیوتی و موتەوەل و موغنی خوێندوە و مستەفا خومەینی ناسیوە لەسەر دەستی مامۆستایانی وەک: عەباسی نەجەف ئابادی، شێخ عەلی پەناه ئیشتهاردی، عەبدولجەوادی ئەسفەهانی و خومەینی درێژەی بە خوێندن داوە، لەڕێگەی خومەینی-شەوە دەستی داوەتە کاری سیاسی، بەوهۆیەشەوە ماوەیەک کەوتۆتە زیندانەوە، لە بەرپابوونی شۆڕشی ئیسلامی بەدواوە، بە فەرمانی خومەینی داگایکردنی بەرپرسانی سیستمی شاهنشاهی پێ سپێردراوە، دواتریش وەک نوێنەری قوم وتاران ئەندامی ئەنجومەنی شورای میللی و شارەزایان بوە و کۆمەلێک دانراوی جۆراوجۆری هەیە و لەلایەن ولاتانی ئەورووپا و ئەمەریکاوە نازناوی ئایشمانی Eichman (١٩٠٦-١٩٦٢) پێدراوە، لە (٢٠٠٣) کۆچی دوایی کردوە: ایام انزوا، ایت الله حاج صادق خلخالی، خاطرات، جلد١، چ٣ (تهران:١٣٨٠) ص٩-١٠.

١٩ - کیهان (روزنامه) سالارجاف أزدستگیری تا اعدام، شماره (١٠٦٥٣) دوشنبه ١٤ اسفندماه ١٣٥٧- ٦ربیع الثانی ١٣٩٩، ص١-٢.

٢٠ - دیدەنی لەگەل دکتۆرحەسەن کەریم بەگی جاف، کەلار (١٤ی تەمووزی ١٩٥٨).

٢١ - دیدەنی لەگەل مامۆستا سەلاحی مەلا ئەحمەد هۆرینی، کەلار (تەمووزی ٢٠٢٠).

٢٢ - وێنەیەکی مێژوویی عەبدولڕەحمان بەزاز و مەلائەحمەدی هۆرینی و کۆمەلێک لە دانیشتوانی شارۆچکەی جەلەولا، کە لە کۆتاییەکانی حوزەیرانی (١٩٦٦) گیراوەو، بەسوپاسەوە لەئەرشیفی بنەمالەی مەلا ئەحمەدی هۆرینیەوە بۆ توێژەری ئەم نووسینە نێردراوە.

٢٣ - خشتەیەکی فەرمی تۆمارکراو سەبارەت بە سال و خزمەتی مەلاکانی مزگەوتی گەورەی شارۆچکەی جەلەولا لەماوەی سالانی (١٩٥٨-٢٠٠٩).

٢٤ - ڕۆژنامەی (ژین) ژمارە (١٤٤٨)، ١٩٥٩/٥/٢٥.

٢٥ - دیدەنی لەگەل مامۆستا ئەحمەد شاکەلی (١٩٤٨) کەلار (١٧ی نیسانی ٢٠٢١).

٢٦ - عـبدالـرزاق الـحسنی، تـاریـخ الــوزارات الـعراقیه، ط٧ (بـغـداد:١٩٨٨) ص٢٩٧و٣٠١و٣٠٢و٣٠٥ و٣٠٧و٣٠٩ و٣١١و٣١٢و٣١٥ (داود بەگی جاف لە خولەکانی: شەشەم، نۆیەم، دەیەم، یازدەیەم، دوازدەیەم، سیازدەیەم، چواردەیەم، پازدەیەم و شازدەیەم و تاکاتی بەرپابوونی شۆڕشی (١٤ی تەمووزی ١٩٥٨) وەک نوێنەری لیوای کەرکووک (کفری) ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرانی سەردەمی پاشایەتی بووە).

٢٧ - دیدەنی لەگەل دکتۆرحەسەن کەریم بەگی جاف، کەلار (١٢ی شوباتی ٢٠٢١).

٢٨ - هەتاو (گۆڤار) ژمارە (١٥٥) سالی ٦، یەک شەمە جۆزەردان (٣١مایس ١٩٥٩) ل٥.

٢٩ - The Shah of Iran The Iraqi Kurds and The Lebanese Shia, Middle East Today, (London:٢٠١٩), p٨٢, Arash Reisinezhad

٣٠ - بڕوانە: هەتاو(گۆڤار) ژمارە (١٥٥) ل٦.

٣١ - بڕوانە: هەتاو (گۆڤار) ژمارە (١٥٥) ل٥-٦.

* زانکۆی گەرمیان -کۆلێژی پەروەردە

# گوندێ شوش

خەتاب سەعدی شوشی

گوندێ شوش ب ئێک ژ گوندێن هەرە کەفنار دهێتەدانان ل کوردستانێ و ئەم دشێین بێژین کو کەفنترین گوندە ل کوردستانێ کو مێژوویا وێ دزفریتەفە بو (٧٠٠) سالان پێش زایینێ و بەری هاتنا ئیسلامێ بو دەفەرێ.

گوندێ شوش دکەفیتە خورافایا قەزا ئاکرێ ب دوراتیا (٢٢)کم. گوندێ شوش دکەڤیتە لبن زنجیرا چیایێ ئاکرێ و ئەف رێزا گوندا درێژاهیاوێ هەتا باکرمان ب دەڤەرا بەربنیێ دهێتە نیاسین وسنورێن وێ یێن جوگرافی ل باکورێ دەفەرا نەهلێ یە گوندێ زانا و میمبەرێ یە و ل روژهەلاتا گوندێ شوش گونێ گوندکی یە و ل روژئافایا گوندێ شوش گوندێ شەرمن ە و ل باشورێ گوندێ شوش دەفەرا هەرکیایە گوندێ پیرخولین و گورانک ێ یە. هەروەسا سروشتێ جوگرافیا گوندێ شوش زورا جوان و دلفەکەرە و سەرنجراکێشە ژ بەر هەبوونا هژمارەکا زورا رەزوباغان ل لبن گوندێ شوش دا و هەبوونا جهێن شینواری و داروبارێن کەفنار ل گوندێ شوش.

هەروەسا جوگرافیا گوندێ شوش دسەردەمێن بوریدا ژی رولەکێ زورێ گرنگ هەبوویە چونکی رێکەکا سەرەکی یا کاروانی و بازرگانیێ بوو دنافبەرا باژێرێ ئاکرێ و میرگەها ئامێدیێ دا هاتن و چوون د گوندێ شوش دابوویە، باشترین بەلگەژی بو ڤێ چەندێ ئەوە، کو تاخەک ل ناڤەندا گوندێ شوش هەیە، ب ناڤێ سیکا گوندی یان (سیکێ) ناسیارە ئەڤە ژی دیاردکەت کو دکەفندا شوش خودان بازار و سیک بوویە و چەندین چهـ و ناڤێن دی کو ئاماژەنە بو کەڤناریا گوندێ شوش.

هەروەسا ل سنورێ جوگرافیا گوندێ شوش هژمارەکا زورا کانیێن سروشتی یێن ئاڤێ هەنە کو پترن ژ (٧٠) کانیان لێ دنوکەدا ژبەر کاودانێن سەقای هشکبووینە. هەروەسا هەر ل سنورێ جوگرافیایێ گوندێ شوش هژمارەکا زورا شکەفتان لێ هەنە ژوانا (شکەفتا سید درویش ئەحمدی. شکەفتا گەلیێ شێخا، شکەفتا سێ دەر، شکەفتا پیر زینوبکێ هتد) کو



لسەردەمێ شورەشان دا خەلکێ گوندێ شوش دناڤ ڤان شکەفتان دا دژیان. هەروەسا سنورێ چیایی ل گوندێ شوش هژمارەکا زورا داروبارێن بەروو و مازی و کەزان لێ هنە کو خەلک مفای ژێ وەردگریت. هەروەها سنورێ جوگرافیا گوندێ شوش زورا دەولەمەندە ژلایێ مادێن کانزاکاریێ ڤەکو ل سەرێ چیایێ شوش لسالا ٢٠١٢ دوو بیرێن نەفتێ هاتنە کولین ژلایێ شەریکەکا ئەمریکی ڤە و هاتە دەرئێخستن.

جوگرافیا گوندێ شوش دسەردەمێ بوریدا رێک خوشکەربوویە کو هژمارەکا زورا گەروکڤانان سەرەدانا وێ بکەن و بەحس لێ بکەن ژوانا (محفوض عمر عباسی، طه الباليسانی، یاسین العمری الموصلی) ل وێ دەمی هژمارەکا زورا زانا وهوزانڤان و سەیدێن مەزن ل گوندێ شوش هەبووینە و زیارەتاوان کریە ژوانا (شیخ یونسێ کورێ ذالنونی شوشی، شیخ عبداللەیێ شوشی، سەید سلیمانێ حوسەینیێ شوشی، سەیفیێ شوشی) ل گوندێ شوش هەبووینە خودان مەدرەسەو حوجرە بووینە.

جوگرافیا گوندێ شوش و سروشتێ وێ پێکهاتیە ژ زور جهێن شینواری و دیروکی، کو مێژوو یاوان ڤەدگەرێن بو ٧٠٠ سالان بەرێ زاینێ، هەروەسا ل گوندێ شوش شێوازەکێ جوان یێ پێکڤەژیانێ هەبوویە ب هەرسێ ئایینێن (موسلمان و مەسیحی و یەهودی) ل گوندێ شوش ژیاینە کو تانوکە شینوارێن وان دموجودن لناڤا جوگرافیا گوندێ شوش دا.

باپیرە گەورێ مە سەید سلێمانێ حوسەینیێ شوشی( ١٧٤٩-١٨٢٥) بەحسا وان جهێن دیروکی و شینواری کریە بدرێژاهی د چەند دەستنڤیسێن خودا ژوان جهان:

### ١. کەلها گوندێ شوش یان (باشوش)

مێژوویا کەلها شوش دزڤریتەڤە بو سەردەمێ داوود پێغەمبەر علیە سلام کو لسەردەمێ وێ الشهید ئوریایێ الحثی کو سەروکێ لەشکرێ داوود علیە سلام هاتیە خورهەلاتێ ناڤین و شەرێ هەرسێ کەلهێن بێتواتە و خورت و کەلها شوش کریە، وەلدیف ژێدەرێن کیتابا توراتێ دا ل سموئیلا١١و ١٤ ئاماژە ب شهیدبینا ئەوریای دکەت ل کەلها شوش و هەر سەربانێ کەلهێ هاتیە ڤەشارتن هەروەسا ئەڤ کەلهە جهەکێ زورێ ستراتیژی و گرنگێ دەولەتان بوویە ژوانا دەولەتا حمیدی و میرگەها بەهدینان، کو چەندین جاران هاتیە ژنافبرن و دوبارە دروستکریەڤە

### ٢. ئاڤاهیێ شهید ئەوریایێ حسی لسەربانێ کەلها شوش.

مێژوویا دروستکرنا ڤی ئاڤاهی ڤەدگەرێت بو سەردەمێ خەلیفە هارون رشیدێ عباسی ل هنداڤ گورێ شهید ئوریایێ حسی دروستکریە کو پەڤ ئاڤاهیە پێک دهێت ژ دوو ژوران ژورا ئێک دوو گورێن تێدا یێت نائلە خان محمد بگ بوتی خێزانا ئیسماعیل پاشایێ دووێ دوماهیک میرێ میرگەها بەهدینان و خوشکاوێ ئەتایش خان محمد بگ بوتی خێزانا شیخ محمد شوشی وە ژورا دووێ گورێ شەهید ئەوریایێ حسی تێدایە دگەل سندریکا وێ کو ئەڤ ژوورە ب جهەکێ پیروز دهێتە دانان وجهێ زکر و خلوە و عیبادەتێ بوویە هەروەسا د روکنێ باکورێ یێ دیوارێ دا بەرەکێ تێدا کو نفیسنەک سەرهاتیە نکراند و نیشانەکا دووئستر دناڤ ئێک دا کو نوکە ئەو نیشان لسەر ئالایێ ئسرائیلێ یە.

### ٣. دەولەتا حەمیدی شوش ئاکرێ

ئەڤێ دەولەتا کوردی حوکمرانی ل هەموو خورهەلاتێ ناڤین کریە و بتایبەتی ل دەڤەرا بەهدینان و هەردوو کەلهێن شوش و ئاکرێ حوکم کریە، ژلایێ میرێن عباسی یێن شوشی برێڤەچوویە ژوانا (میر عیسی کک، میر مبارزالدین و میر عزەئەدین شوشی عباسی، دوماهیک میرێ دەولەتا حمیدیا شوشی بوویە ل گوندێ شوش)

### ٤. گەلیێ دانیال پێغەمبەر علیە سلام ل گوندێ شوش

لدیف چەند ژێدەەکێن ئیسلامی و گوتنا کەسانێن کەڤن یێن گوندێ شوش کو گورێ دانیل پێغەمبەر ل ڤی گەلی دا کو دکەڤیتە خواریا رەزو باغێن گوندێ شوش ڤەشارتیە لەورا ناڤێ وێ بوویە گەلیێ دانیالی کو هەتا چەند سالەکان بەرێ نوکە شینوارێن وێ مابوون لێ مخابن ژلایێ دزو چەتێن شینواری فەهاتنە ژنافبرن.

# ئەدەب

## گفتوگۆی یازده

**سمکۆ محەمەد:** ئامانجی ئەدەب یەکێکە لە ستراتیژیەتی نووسین، ئەمە ماکسیم گۆرگی لە کتێبی هەدەفی ئەدەبیات باسی کردووە و کەسێک بەناوی ڕێبوار وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردیی و لە ساڵانی نەوەدەکان خوێندوومەتەوە، چونکە موناقەشەکەی گۆرگی لەگەڵ کەسێکە و دواتر بۆی دەردەکەوێت کەسەکە لینین بوو، بەهەرحاڵ بابچمەوە سەر ستراتیژی نووسین، ئایا دەروازە بۆ نووسین، ئەوەندە ئاسانە، تاکو نووسەر بتوانێ بەبێ ترسی ناوەڕۆکی دەق بنووسێت؟ مەبەستم لەدەروازە ئەوەیە دەرپچەیەک، هەبێت بۆ خۆڕزگارکردن لەدەقی قاڵبیەندی (نەمەتی) یان دەقی کلێشەیی و سواو، دونیای ئەدەبی کوردیی هەمووی لەیەک دەچێت، تەنانەت ناونیشانەکانیش بەشێوەیەک لەشێوەکان کۆپی یەکترن.

**عەباس عەبدوڵا یووسف:** ناونیشان دەروازەیەکی تایبەتە، تاکو نووسەر لەو دەروازەیەوە بێ دەقی باو بشکێنێت. شیعر، چیرۆک، ڕۆمان، شانۆنامە و فیلمیش واتا دەقخوێنیەکی لەپشت وەستاوە،

لەوڕووەوە دەیان دەروازەی جیاواز هەیە، کە خوێنەری زیرەک ببێتە کلیلداری کردنەوەی دەروازەکان، خوێنەری دەرەوەی دەروازەش، چاوەڕێی دەقخوێنی ئەکادیمی، یان خوێنەری جددیيە.

خۆئەزموونکردنم لە ناونیشان زۆرە، کە گەلێک جار کێشەشم بۆ دروستبووە، بەڵام بەناونیشانێکی سوکراتی چارەسەرم کردووە، چونکە من بەر لەوەی ئەدیب بم، پیاوێکی هزرناسم و لەژێر کاریگەریی فەلسەفەی یۆنانیم، بۆیە ئەزموونم لەناونیشان فرەیە، سەرەتا پاش فێربوونی خوێندنەوە لەپۆلی دووی سەرەتایی، ناونیشان زۆر بوو، ئەوکات ناونیشانی فیلمی سینەمایی، ناونیشانی چاخانە و چێشتخانە و سینەما بوو، ناونیشانی پاکەتی جغارە بوو، ساڵانی دواتر خۆم وەکو فیگەر، بووم بە ناونیشان، چونکە خەریکی خوێندنەوەی قۆناغەکانی فەلسەفە بووم. بەهۆی مامۆستایەتییەوە لە گوندەکان بووم بۆ فەرهەنگی گوندەکان.

(کەری بۆریدان) کە ناونیشانی دیوانێکمە و لە موناقەشەی فەلسەفەی فەرەنسی-یەوە وەرگیراوە، چونکە بابەتەکە موناقەشەی نێوان بیرمەندانی فەرەنسی بوو، بۆیە ناونیشانەکە سەرنجی ڕاکێشام، بەمەش ویستم بیهێنمە نێو داب و ئادابی دانابێژەیی کوردییەوە، پاش بەراوردێک لەنێوان (کەری فەلسەفە) و (کەری خۆماڵی) لەنێوان عەقڵی بۆریدانی زاڵ و کەری نەزانی خۆماڵی، ناونیشانەکە بە چرپە بانگی کردم، ئەی هەستنووسی نوێخواز، زینووم کەرەوە بەهۆنراوەیەک. منیش وامکرد، لەوێوە تێگەیشتم، کە ناونیشان منیان بە چرپە بانگ کرد، هۆنراوە و چیرۆک بخەمە ژێر ڕکێفی خۆم. واتە ناونیشان هاندەر و ئیلهام دەرم بێت، تاکو بتوانم دەق بنووسم، لەوێوەش دەقی یاخی لە دایکبوو، چەند ناونیشانی یاخیم نووسی، کەچی شتاقی خێواو گونجاو و ترینجاو نەبوون، دەزوو بۆ ناونیشانەکە کۆمەڵێک وێنە خاڵ ڕێکبخە، لە یەک هەزارشەوە گوتراوە.

**سمکۆ محەمەد:** من باسی کاریگەریم نەکردووە، چونکە ئەوە باسێکی دیکەیە، کە زۆربەی نووسەرانی دونیا بە بۆرخیس، مارکیز، یەشار کەمال و دانتی و هتد، هەموویان لەژێر کاریگەریی هەزار و یەکشەو و داستانی گلگامش بوونە، بەڵام کاریگەریی لە جەوهەری دەق دەردەکەوێت، نەک ناونیشان، کەچی تۆ دەتەوێت بەشێوەیەکی دی دەردەشەی ئەم بابەتە بکەیت، چونکە ناونیشان پێناسەی سەرەکی دەقەکەیە، نەک ناوەڕۆک، بۆیە زۆرجار دەق، مانشێت دەبێتە قوربانی ناونیشان، بۆ نموونە ئەو ناونیشانانەی، کە وەک یەکن، یان لە یەک نزیکن، هەم وەکو ئەوەی موڵکیەتی نووسەرە، هەم وەکو نائاگایی، کە دواجار دەبێتە پرسیاری شەرمنانە، ئەمە لە هەموو دونیادا باسێکی جدییە و ئەدۆنیس بابەتێکی جددی لەسەر ناونیشان و دەستپێک هەیە، ئەگەرنا سێ کەسی ناوداری عەرەب و فارس ناونیشانی (وهم الهوية)یان نووسیوە، ئەوانیش عەلی حرب و داریوشی شایگان و ناوی ئەویتریشم بیر نییە، بەڵام هەریەکەیان بە ناوەڕۆکێکی جیاوازەوە نووسیویانە، بۆ نموونە داریوشی شایگان بەمەبەستێک نووسیویەتی، عەلی حرب بەمەبەستێکی دی، هیچ ڕەخنەگرێکیش وەکو ڕەخنە چاوی لەو ناونیشانە نەکردووە و بەدزی و بە لاسایی و بە وەرگرتن لە قەڵەمی نەداوە، ئەم وردە باسە ناکاملانە، تەنیا لە دونیای ئەدەب و نووسینی کوردیدا دەبینرێن، چونکە ناونیشان وەکو ناوی ئینسانە، بەڵام ئینسانەک لەگەڵ ئەویتردا زۆر جیاوازە.

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** واڵت وایتمن-ی شاعیری ئەمریکی لەشوێنێک، کە باس لە ئەزموونی خۆی دەکات، دەڵێت: وەختێک دەمویست شتێک بنووسم، ئەگەر سەرەتاکەی باش بوو دەمگوت سوپاس بۆخوا، لەم نووسینە سەرەتایەکی باشم هەیە، من لەسەرەدەمی خۆی، زۆر بزۆز و نەترس بووم، هەموو شتێکم دەنووسی و لەدەرگای زۆر بابەتم داوە، شیعر، چیرۆک، شێوەکاری و خۆشنووسی، لە یۆنان شیعرێکم نووسی بەناونیشانی (کافکا لەئەکرۆ پۆلس) ئەو شیعرەم خوونوێن بوو، بەڵام بەهۆی ئەوەی ژوورەکەمان دڵۆپەی دەکرد لەگەڵ کۆمەڵێک دەستنووس تیاچوو،

> **سمکۆ محەمەد:**
>
> ***ئایا دەروازە بۆ نووسین، ئەوەندە ئاسانە، تاکو نووسەر بتوانێ بەبێ ترسی ناوەڕۆکی دەق بنووسێت؟***
>
> **عەباس عەبدوڵلا یووسف:**
>
> ***خۆئەزموونکردنم لە ناونیشان زۆرە، کە گەلێک جار کێشەشم بۆ دروستبووە، بەڵام بەناونیشانێکی سوکراتی چارەسەرم کردووە، چونکە من بەر لەوەی ئەدیب بم، پیاوێکی هزرناسم و لەژێر کاریگەریی فەلسەفەی یۆنانیم، بۆیە ئەزموونم لەناونیشان فرەیە***

من زۆر بایەخم بە بونیادنانی پرۆسەی نووسین داوە، بەتایبەتی لەدەستپێکدا، چونکە بەراستی دەستپێک واتە بەدەستەوەهاتنی دەقێکی جوان، ئەگەر بە دەستپێکێکی جیانووس دەستت پێ نەکرد، دەقەکە ناکامڵ دەردەچێت، بەتایبەت، کە هەستم کرد دەتوانم بنووسم، ئەویش لە قوتابخانەوە سەرچاوەی گرتبوو، لەپۆلی چواری ئامادەیی مامۆستا داوای لێکردین هەر کەسەو شتێک بنووسێت، جا شیعر، یان چیرۆک، یان بابەتێک، هەر شتێک، بە ئارەزووی خۆی، منیش بە عەرەبیی شتێکم نووسی، مامۆستاکەمان (مەجید سێگردکانی) کە تەواو لە زمانەکە شارەزا بوو، وەختێک نووسینەکەی منی بینی، زۆر بە دڵی بوو، قوتابییەکانیش بە نووسینەکەم سەرسام بوون، گوتیان عەباس لەجیاتی هەموومان نووسیویەتی، ئەوەبوو نووسینەکەیان برد بۆ پەروەردەی هەولێر و لەوێوە بۆ پێشبڕکێی ئەدەبی قوتابیانی هەموو شارەکان لە بەغدا و خەڵات کرام، لەوێوە هەستم کرد، کە من دەتوانم بنووسم. چیرۆکێکم نووسی بەناونیشانی (شبح الغروب) تارمایی خۆراوا و کاریگەریی (ئانا کارنینا)ی تۆلستۆی لەسەر بوو. ئەوە بووە دەستپێک و ئیدی بەردەوام بووم لە نووسینی بابەتی ئەدەبی.

## گفتوگۆی دوازدە

**سمکۆ محەمەد:** دەمەوێ باس لەکێشەی وەرگێران بکەم، بەتایبەتی وەرگێرانی پێچەوانەوە، کە من لەمێژە ئەو کەڵکەڵەیەم لەمێشکدایە و پرۆژەکەشیان لێوەرگرتم و ناویان نەهێنام.

ئایا چارەسەرکردنی کێشەی وەرگێران بۆ زمانەکانی دی چۆن دەبینی، واتە وەرگێران لەزمانی کوردییەوە، بۆ زمانەکانی دی بۆچی بۆتە کێشە؟ ئایا بۆ کورد، ئەمە کێشەی ناسیۆنالیزم نییە لە ڕووی فیکرییەوە؟ لەکاتێکدا دەبینم کورد دەترسێت بچێتە نێو کتێبخانەی فارسیی، عەرەبیی، تورکیی، ئینگلیزیی و فەرانسیی و هتد، لەکاتێکدا ئەم وەرگێڕانەشی هەیە، باشە بۆچی ناتوانێت لانی کەم فۆلکلۆری کوردیی بکاتە زمانەکانی دی و سپۆنسەری بکات؟ ئەم پرسیارە بەشێکە، یان لقێکی دیکەی مەسەلەی شوناسە، کە پێشتر موناقەشەمان کردووە، بەڵام وەڵامێکی لۆژیکیت نەدامەوە، بۆیە بە ناڕاستەوخۆ دووبارە دەبێتەوە؟

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** وەرگێران بۆ خۆی دوو ماڵ، یان دوو کلتوور و دوو زمان ئاوەدان دەکاتەوە، چونکە ئەوانی دیش پێویستییان بەئێمە هەیە، وەکو چۆن دەیانەوێ ڕۆسۆ، هیگڵ و فۆکۆ بکات بەئێمە، ئەمە وەبەرهێنانی فیکرە، چونکە ئەوەی تۆ باست لێوەکرد و وەکو نموونە هێناتەوە، دەڵێم (هاو)ێک هەیە لەنێوانمان، بەمانای (هاوهزری) دێت، ئەگەر ئیمپریالیزم بەتەنیا جوگرافیا داگیر بکات، ئەوە هیچی نەکردووە، بەڵام کە هات زمان و فیکری هێنا و کردی بەسیستەم و پراکتیکی کرد، ئەوا کاری کرد، ئێمە وا ڕاهاتووین، کە

هەر زمانی ئەوانی دی بۆ کوردیی بگوازینەوە، ئەمە ڕێکەوتی ژیانە، بەڵام ڕاستییەکەی ئێمە تا ئێستە تەنیا وەرگرین، نەک (پێدەر) بۆ ئەوەی خۆمان بناسێنین نەبێت لێک نزیکبوونەوە هەبێت، خۆمان وەکو نێرەر بناسێنین، ئەوان بەبێ ئێمە هیچ نین.

**سمکۆ محەمەد:** چۆن، مەبەستت چییە، کە ئەوان بەبێ ئێمە هیچ نیین؟ لەکاتێکدا هەموو ستایلە فیکریی و ئەدەبیی و هونەرییەکە، بە هەموو سێکتەرەکانەوە موڵکی ئەوانن، ئەوان سەنتەرن و ئێمە کەنارین؟ ئەگەرچی منیش بڕوام وایە بەبێ کەنار، سەنتەر بوونی نییە، بەو مانایەی بەبێ خۆرهەڵات خۆراوا هیچ نییە و کاڵاکانیان ڕەواجی نابێت.

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** مەبەستم ئەوەیە، ئێمە تەنیا لە ئاستی (وەرگری) داینە، نەک (پێدەر) مەبەستم ئەوان دەنگن و ئێمە گوێین، کە زمانمانە بەگەڕبێخین، دەنگێکی ئاوێتەیی (ئێمە و ئەوان) پەیدا دەبێ و لێرەوە دەشکرێت بگوترێت ئەوان بێ ئێمە هیچ نین و نووسەری کورد لەحاڵەتی ڕاهاتنی خۆی دەرنەچووە، هێشتە نەبووەتە نووسەری جیهانیی، تاکو ئەوان پێویستیان پێی هەبێت.

سەبارەت بەزمان و فۆلکلۆری ئێمەش، ئەوان پێشتر خەڵکی خۆیان هەبووە، ئەوان شارەزای مێژووی ئێمەن و زمانی ئێمەش زمانێکی زیندوو نییە.

**سمکۆ محەمەد:** هێشتە وەڵامی منت نەداوەتەوە، من دەزانم ئیمپریالیزم لە ڕێگەی خۆرهەڵات ناسەکانییەوە هاتوون و ئێمەیان ناساندووە، بەچاوی خۆیان دەقی ئێمەیان بینیوە و باسیان کردووە و لە بەڵگەنامەکانیشیاندا ماون، بۆ نموونە هاتنی مینۆرسکی و هاملتۆن و کارڵ مای و هتد بۆ کوردستان، هەریەکەیان مەبەستێکیان هەبووە و بە ئاراستەیەک نووسیویانە، لە هەمووشیان خراپتر کارڵ مای بووە، کە بە خەیاڵ نووسیویەتی، بەڵام من دەمەوێ بزانم بۆچی کورد نایهەوێت وەکو زمانەکانی دی دەوروپشتمان، کە ئەوانیش بۆ ئەورووپا گرینگ نین، خۆیان گەیاندووە، کەچی کورد نایهەوێت بگاتە خۆراوا، یان بگاتە کتێبخانە و خوێنەری فارس، یان عەرەب، چونکە من لە نزیکەوە ئەم پرسیارەم لێکراوە، بەڵام هیچ وەڵامێکی لۆژیکیم پێ نەبووە، بۆیە قەناعەتیان نەکردووە، سەرئەنجام پرسیارەکە بەکراوەیی ماوەتەوە.

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** من لەتۆ دەپرسم ئایا دەرگای ژیان بەهەموو بوارگەکانەوە کراوەتەوە؟ لەدوای سەدەی نۆزدەهەمەوە ئیمپریالیزم هات و هەموو شتێکی پێویستی برد، پەیوەندییەکەی پەیداکرد و کەڵکی لێوەرگرت، ئەو فەزایە پەیوەندییەکی نوێی خوڵقاند، ئێمەش لاسایی ئەوانمان کردەوە، دەبێت ئەوە بزانین، کە شارستانیەتی ئەورووپا و ئەمریکا لە ناوچەکە زاڵە.

**سمکۆ محەمەد:** ئەم بابەتە زۆر قووڵە، مەسەلەکە شارستانییەت نییە، ئەوەتا هیندستان و عەرەب بەگشتیی و فارس و تورک-یش بەتایبەتی لەژێر کۆنترۆڵی ئەورووپان، ئەی بۆچی ئەوان تێکستی خۆیان وەردەگێڕنە سەر ئەڵمانیی و ئینگلیزیی و هتد؟ دووبارەی دەکەمەوە بۆچی کورد خۆی ناخاتە کتێبخانەی جیهانییەوە، خۆ ئەمە یاساغ نەکراوە، خۆ سنووری بۆ دانەنراوە، هەرکەسێک لەوانەی زمان دەزانن یان نووسەرن خۆیان لەم پرسیارە دەدزنەوە و وەڵامی دروست نادەنەوە؟

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** ئەوەی تۆ باسی دەکەی پرۆژەیەکی هەمیشەییە و پێویستی بەدەزگای تایبەتی حکوومی و نیشتیمانیی هەیە، لە ئەمڕۆدا (نیمچە دەوڵەتی) هەرێم، بەرەو ئاستێکی بەرزتر هەنگاو داوێ و بە نەرمی ئایینداریی دەکات. خەمێکت (بایەخ) هەیە و موناقەشەی من دەکەی، ئەم جۆرە پرۆژانە بۆ ئایندەن، بێنەوە سەر ئەدەب و نووسین پێشتر من وامدەزانی

سمکۆ محەمەد:

*ئایا چارەسەرکردنی کێشەی وەرگێڕان بۆ زمانەکانی دی چۆن دەبینی، واتە وەرگێڕان لەزمانی کوردییەوە، بۆ زمانەکانی دی بۆچی بۆتە کێشە؟*

عەباس عەبدوڵلا یووسف:

*وەرگێڕان بۆ خۆی دوو ماڵ، یان دوو کلتوور و دوو زمان ئاوەدان دەکاتەوە، چونکە ئەوانی دیش پێویستییان بەئێمە هەیە، وەکو چۆن دەیانەوێ ڕۆسۆ، هیگڵ و فۆکۆ بگاتە بەئێمە*

هەر زمانی ئەوانی دی بۆ کوردیی بگوازینەوە، ئەمە رێکەوتی ژیانە، بەڵام ڕاستییەکەی ئێمە تا ئێستە تەنیا وەرگرین، نەک (پێدەر) بۆ ئەوەی خۆمان بناسێنین دەبێت لێک نزیکبوونەوە هەبێت، خۆمان وەکو نێرەر بناسێنین، ئەوان بەبێ ئێمە هیچ نین.

**سمکۆ محەمەد:** چۆن، مەبەستت چییە، کە ئەوان بەبێ ئێمە هیچ نیین؟ لەکاتێکدا هەموو ستایلە فیکریی و ئەدەبیی و هونەرییەکە، بە هەموو سێکتەرەکانەوە موڵکی ئەوانن، ئەوان سەنتەرن و ئێمە کەنارین؟ ئەگەرچی منیش بڕوام وایە بەبێ کەنار، سەنتەر بوونی نییە، بەو مانایەی بەبێ خۆرهەڵات خۆراوا هیچ نییە و کالاکانیان ڕەواجی نابێت.

**عەباس عەبدوللا یووسف:** مەبەستم ئەوەیە، ئێمە تەنیا لە ئاستی (وەرگری) داینە، نەک (پێدەر) مەبەستم ئەوان دەنگن و ئێمە گوێین، کە زمانمانە بەگەڕبێخین، دەنگێکی ئاوێتەیی (ئێمە و ئەوان) پەیدا دەبێ و لێرەوە دەشکرێت بگوترێت ئەوان بێ ئێمە هیچ نین و نووسەری کورد لەحاڵەتی ڕاهاتنی خۆی دەرنەچووە، هێشتە نەبووەتە نووسەری جیهانیی، تاکو ئەوان پێویستیان پێی هەبێت.

سەبارەت بەزمان و فۆلکلۆری ئێمەش، ئەوان پێشتر خەڵکی خۆیان هەبووە، ئەوان شارەزای مێژووی ئێمەن و زمانی ئێمەش زمانێکی زیندوو نییە.

**سمکۆ محەمەد:** هێشتە وەڵامی منت نەداوەتەوە، من دەزانم ئیمپریالیزم لە ڕێگەی خۆرهەڵات ناسەکانییەوە هاتوون و ئێمەیان ناساندووە، بەچاوی خۆیان دەقی ئێمەیان بینیوە و باسیان کردووە و لە بەڵگەنامەکانیشیاندا ماون، بۆ نموونە هاتنی مینۆرسکی و هاملتۆن و کارڵ مای و هتد بۆ کوردستان، هەریەکەیان مەبەستێکیان هەبووە و بە ئاراستەیەک نووسیویانە، لە هەمووشیان خراپتر کارڵ مای بووە، کە بە خەیاڵ نووسیویەتی، بەڵام من دەمەوێ بزانم بۆچی کورد نایهەوێت وەکو زمانەکانی دی دەوروپشتمان، کە ئەوانیش بۆ ئەوروپا گرینگ نین، خۆیان گەیاندووە، کەچی کورد نایهەوێت بگاتە خۆراوا، یان بگاتە کتێبخانە و خوێنەری فارس، یان عەرەب، چونکە من لە نزیکەوە ئەم پرسیارەم لێکراوە، بەڵام هیچ وەڵامێکی لۆژیکیم پێ نەبووە، بۆیە قەناعەتیان نەکردووە، سەرئەنجام پرسیارەکە بەکراوەیی ماوەتەوە.

**عەباس عەبدوللا یووسف:** من لەتۆ دەپرسم ئایا دەرگای ژیان بەهەموو بوارگەکانەوە کراوەتەوە؟ لەدوای سەدەی نۆزدەهەمەوە ئیمپریالیزم هات و هەموو شتێکی پێویستی برد، پەیوەندییەکەی پەیداکرد و کەڵکی لێوەرگرت، ئەو فەزایە پەیوەندییەکی نوێی خوڵقاند، ئێمەش لاسایی ئەوانمان کردەوە، دەبێت ئەوە بزانین، کە شارستانیەتی ئەورووپا و ئەمریکا لە ناوچەکە زاڵە.

**سمکۆ محەمەد:** ئەم بابەتە زۆر قووڵە، مەسەلەکە شارستانییەت نییە، ئەوەتا هیندستان و عەرەب بەگشتیی و فارس و تورک-یش بەتایبەتی لەژێر کۆنترۆڵی ئەورووپان، ئەی بۆچی ئەوان تێکستی خۆیان وەردەگێڕنە سەر ئەڵمانیی و ئینگلیزیی و هتد؟ دووبارەی دەکەمەوە بۆچی کورد خۆی ناخاتە کتێبخانەی جیهانییەوە، خۆ ئەمە یاساغ نەکراوە، خۆ سنووری بۆ دانەنراوە، هەرکەسێک لەوانەی زمان دەزانن یان نووسەرن خۆیان لەم پرسیارە دەدزنەوە و وەڵامی دروست نادەنەوە؟

**عەباس عەبدوللا یووسف:** ئەوەی تۆ باسی دەکەی پرۆژەیەکی هەمیشەییە و پێویستی بەدەزگای تایبەتی حکوومی و نیشتیمانیی هەیە، لە ئەمڕۆدا (نیمچە دەوڵەتی) هەرێم، بەرەو ئاستێکی بەرزتر هەنگاو داوێ و بە نەرمی ئاییندارێی دەکات. خەمێکت (بایەخ) هەیە و موناقەشەی من دەکەی، ئەم جۆرە پرۆژانە بۆ ئایندەن، بێنەوە سەر ئەدەب و نووسین پێشتر من وامدەزانی

*سمکۆ محەممەد:*

***ئایا چارەسەرکردنی کێشەی وەرگێڕان بۆ زمانەکانی دی چۆن دەبینی، واتە وەرگێڕان لەزمانی کوردییەوە، بۆ زمانەکانی دی بۆچی بۆتە کێشە؟***

*عەباس عەبدوڵڵا یووسف:*

***وەرگێڕان بۆ خۆی دوو ماڵ، یان دوو کلتوور و دوو زمان ناوەدان دەکاتەوە، چونکە ئەوانی دیش پێویستییان بەئێمە هەیە، وەکو چۆن دەیانەوێ ڕۆسۆ، هیگڵ و فۆکۆ بگات بەئێمە***

برادەری سوریالیزمیم و کارم لەسەر دەکرد، کەچی دواتر بۆم دەرکەوت، کە من زیاتر برادەری ئەندرێ بریتۆن-م و زیاتریش لەمە، من زڕبرای (ئەندرۆ برایتۆ) م ئەمە کێشەیەکی قووڵی پۆست کۆڵنیالیزمە و ئەدەبی فەرەنسیی میراتێکی جیهانییە و بەشەمیراتێکمان بەردەکەوێت، دەبێ ئەو توانایە هەبێت، کە خەمی بەجیهانی کردنی هۆنراوە و ڕۆمانی کوردیی هەیە. ڕاست دەکەی دەبێت لە ڕووی فیکرییەوە ناسیونالیستی

***سمکۆ محەمەد:***

***چۆن، مەبەستت چییە، کە ئەوان بەبێ ئێمە هیچ نیین؟ لەکاتێکدا هەموو ستایلە فیکریی و ئەدەبیی و هونەرییەکە، بە هەموو سێکتەرەکانەوە موڵکی ئەوانن، ئەوان سەنتەرن و ئێمە کەنارین؟***

***عەباس عەبدوڵڵا یووسف:***

***مەبەستم ئەوەیە، ئێمە تەنیا لە ئاستی (وەرگری) داینە، نەک (پێدەر) مەبەستم ئەوان دەنگن و ئێمە گوێین، کە زمانمانە بەگەڕبێخین، دەنگێکی ئاوێتەیی (ئێمە و ئەوان) پەیدا دەبێ و لێرەوە دەشکرێت بگوترێت ئەوان بێ ئێمە هیچ نین و نووسەری کورد لەحاڵەتی ڕاهاتنی خۆی دەرنەچووە، هێشتە نەبووەتە نووسەری جیهانیی، تاکو ئەوان پێویستیان پێی هەبێت***

کوردیی لە ئاست بێت، ئێمە بۆ کتێب لە نیوەڕۆژداین، بۆ بەیانیی شتێکی بەرهەمدار هەر دەبێت.

**سمکۆ محەمەد:** ئەوەندەی موتابەعەی تۆم کردووە، بەردەوام باسی خۆت دەکەیت، من ئەوە بە پۆزەتیف دەبینم، چونکە ئەوانەی وەک تۆ باسی خۆیان دەکەن، هۆکارەکەی ئەوەیە، کە نە گرووپ، نە شار، نە حزب و سیاسەتی نییە، بۆیە من ئەمە بە تێڕوانینێکی مارکسیانە دەبینم، پێشم وایە ئەو جۆرە بەرگرییەی نووسەر لە خود، بەرگرییە لەوانی دی، کە هەمان ماڵیان هەیە و لە هەمان دۆخدا دەژین. تۆ دەتوانی ئەم تێڕوانینە جوانتر شی بکەیتەوە؟

**عەباس عەبدوڵڵا یووسف:** ئەگەر پەسندبێژەی خۆم بۆ خۆم دانەژمێر بکەم، دژەی بەرانبەر بە بەد هەڵبەستەی خۆی، مەودایەکم بۆ ناهێڵێ. دیارە ئەم لێ بینی و سیمانووسەی خۆت ڕاستە، من لە دیار پەرستگەی دلفی لە یۆنان، فێری دانانووسەی (خۆت بناسە) بووم، هەروا لەم وانەیە فێرە (خۆتناسە)ش بووم، دەتوانم بڵێم، من سێبەرناسەی خۆم و دیکانم.

من تاکباڵم، داهێنانیش پرۆسەیەکی تاکە و تێدا (باو)یش ئاوێتە دەبێت. ئەی بۆ نەڵێم لەگەڵ چاپکردنی (دیوانی ئاو١٩٧٤) پەخشانەشیعر بووە ڕێچکەی کارپێکراوی هۆنراوەی نوێ لە ناوەندی ئێرە و ئەوێ.

مەتحێکی دی: لە کوڕەکان، لەو چەند مانگەی دوایی زاراوەی (سوودە ڕەخنە) دەبێژم، تا نەوەی نوێ و نوێتر ئاگاداری دەقی خۆیان بن و پوختەتری بکەن.

زۆرجار لە برای بەڕێزم ئازاد عەبدولواحید-م بیستووە، کاتێک کوڕەکە تەواو دەبێت پێم دەڵێت بۆ ئەم قسانە ناکەیتە نووسین بڵاوبکرێتەوە.

زاراوەی نووتاشەم لە ئاستێکی حکوومی و زانکۆیی بەکار دێن، کە تاکدێریەکان بڵاودەکەمەوە، فەرهەنگی کوردیی خەنی دەبێ و من خەنیتر، کە توانیتم وشەی نوێ بیەمە نێو گەنجینەی وشەی کوردیی.

سمکۆ بەس نییە؟! خۆ وەک قرژاڵ ناڵێم: گوتیان لۆ وا بە دوو سەرە دەڕۆی، قرژاڵ گوتی: لێم دێ. ئەشەدوو لێی دێ، لێبگەڕێ بابە (فرەسەرە) بڕوات.

### موناقەشەی سێزدە

**سمکۆ محەمەد:** با باسی ڕۆمانسیەتی شیعر بکەین، فۆکس بخەینە سەر ئەو بابەتە، من زۆر دەقی کوردیی دەبینم، بەناوی ڕۆمانسییەتەوە کێشەی فیکریان وەلاناوە و بەناوی ناسیونالیزم و دڵدارییەوە شیعر بڵاودەکرێتەوە، تۆ هەستت بەمە کردووە لەنێو ئەدەبیاتی کوردیی چ کێشەیەکی ئەزەلییە، ئایا لەسەدەی بیستویەک ئەمە ڕۆشنبیریی پێ دەگوترێت؟! یان خودزینەوە لە چەمکی ڕۆمانسییەت، چونکە من پێموایە

بەقی ڕۆمانسی، دەقێکە خاڵی لەفیکر و مەعریفە و شیعر، بۆ خۆنووسینەوەی ڕۆشنبیریی کەسی شاعیرە.

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** ئەم بابەتە لەهەر وڵاتێک مۆرکێکی تایبەت بەخۆی هەیە، بۆ نموونە لە ئەڵمانیا و فەڕانسە و ئینگلتەرا لە بەرهەمەکانیان ڕەنگی داوەتـەوە، هـەریـەک بـە ستایلێکە، ئـەم دیاریکردنە گشتگیرە، ئەمە مانای ئەوە نییە لەشێوە ڕۆمانسییە. لە فەڕانسە ڕۆمانسیەت تێکەڵ کۆمەڵناسی کراوە، لە ئەڵمانیا تێکەڵی فەلسەفە کراوە، لە ڕووسیا تێکەڵی سایکۆلۆژیا و چینایەتی کراوە، وەکو دیست فیسکی و تۆلستۆی، لە یۆنان تێکەڵی ئیستاتیکا کراوە، چونکە باگراوەندی مێژووی فەلسەفەی هەیە، لەنێو عەرەب تێکەڵ بەکلتوور و زمان کراوە، چونکە دەقێکی ئاسمانی لە پشتە، بۆ هەر شوێنێک پاڵنەرێک و تایبەتمەندییەک هەیە، ئەو فەزایەی لەنێو کورد هەیە و تازەیە، ئەمە تەنیا لەنێو شیعر هەیە و ڕێچکەی خۆی گرتووە و کەم تەجاوزی کردووە.

لای ئێمە ڕۆمانسییەت پاش جەنگی یەکەمی جیهانیی دروست بـووە، پاش ئـەوەی هـزری خـۆراوا گەیشتە ناوچەکە، ئیتر شـۆڕش پەیدا بـوو، ئەمەش پشگیری سەرەتاکانی هاتنی تەکنۆلۆژیا بوو، ئەو دەمـە ئێمە تـەواو ئاگامان لەو دەنگوباسە نەبوو، چونکە پێشتر شیعر هونەر وەراتـە لە جوانیی سروشت و جانیی ئافرەت و هەندە وردەواڵەی کۆمەڵایەتی دەدوا، بۆیە لە کێشی پەنجە و درووشمبازی دەرنەدەچوو، شیعری ئازاد و ئەپستراکت قەبووڵ نەدەکرا، ئێمە درەنگ فریا کەوتین، شاعیرێکی وەکو حاجی قادر سەری هەڵدا، کە هەم ڕۆمانسیی بوو، هەم ناسیونالیزمێکی بەبینینێکی ئایندار، ئەویش نەیتوانی بەرگریی بکات، چونکە هێشتە فۆلکلۆرەکەی نەگەیشتبووە دونیای دەرەوە، کەوابوو تەنیا لـە کلاسیکدا مـایـەوە، ڕۆمانسیەت بـۆ کـورد لەکێشەی نەتەوەدا کۆ بووەوە، نەیتوانی ببێتە بابەتێکی فکریی و گشتیی بۆ کوردستان.

### گفتوگۆی چواردە

**سمکۆ محەمەد:** با لەوەوە دەست پێ بکەم، کە هەرچی تێرم و چەمک و ستایلی ئەدەبیی هەیە لە خۆراواوە هاتووتە نێو دونیای ئەدەبی کوردییەوە، بۆ نموونە هایکۆ، تاکدێڕیی، بوونگەرایی، سوریالیزم، دادایزم و هتد، بەتایبەتی تۆ، کە زۆر باسی نانۆ دەکەیت و کتێبێکیشت هەیە بەناوونیشانی (نانۆ تاتۆ دەکەم) بەڵام ئەوەی من خوێندوومەتەوە شیعری نانۆ نییە، بەڵکو تاکدێڕییە، دوو شتت تێکەڵ کردووە. تۆ زۆر کەڵکت لە ئیمیل سیۆران وەرگرتووە، وانییە؟ بەتایبەتی ئەو نائومێدیەی، کە بەخوێنەری دەبەخشی، وەکو هەمان نائومێدی و هاندانی خۆکوژی سیۆرانە بۆ خوێنەر.

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** بەڵێ ڕاستە، سیۆران وەکو نووسەرێکی خۆراوایی ناسراو، کاریگەریی لەسەرم هەبووە، لە یەکەم وتارییەوە، کە چەند جارێکم خوێندەوە، سەرنجی ڕاکێشام، بەئاسانی ڕستەکانی هاتنە نێو دێڕەکانمـەوە، ئـەو کەڵکی وەرگـرتـووە لەفەلسەفە، سروشـت، مـۆزیـک و ڕەشبینی بـەرانـبـەر بـەژیـان. منیش لەو تێڕوانینەوە، کەڵکم لێ وەردەگرت، ئەوکات




هەرچیم لەبارەیەوە دەخوێندەوە دەمکردە دۆسێیەکی تایبەت بەو، ئەمە بۆم بووە سەرچاوە، بەڵام نانۆکەی من ئەو ستایلە ژاپۆنییە نییە و بەناوی (نانۆ)ش کارم نەکردووە، بەڵکو ئەوەی من ستایلێکە بۆ وەسفکردن شتەکان و جێگەکردنەوەیان لەنێو بەڕەوی تاکدێڕی، بەڵام لەژێر ناوونیشانی نانۆیە، بەوپێیەی، بنچینەی ناونیشانی دەقەکەی من لە فۆلکلۆرەوە هاتووە. لە کوردەواری لە سەرەتای شەستەکان خەڵک هەبوون شارەزای ئیدیۆمی کوردیی بوون بە ئیدیۆم دەستیان بەقسان دەکرد، کەسێک زۆر شارەزا و چەقاوەسوو بوایە، پێیان دەگوت (کورتان بۆ کێچ دەدووری) ئەم ئیدیۆمە کوردییە لەو هاتبوو، کە خەڵک لەو سەردەمە

لەنێو خانووی قوڕ دەژیان و زەوییەکەشی خۆڵ بوو، ئێواران سەکۆی بەردەم ماڵەکەنیان ئاوڕشێن دەکرد، ئەمەش دەبـووە هـۆی مانـەوەی تـەڕەشـوع، دواجـار لەسەری ئەو بەرە و لاکێشانە ڕادەخران، کێچ تێیدا تەڕاتێنی دەکرد، خەڵک لەوێوە قژی تووشی ئاسپێ و کێچ دەبوو، دەچووە نێو جلوبەرگیش، ئیدی ژنان بە ناچار بە نینۆکی پەنجەکەڵە ئەسپێ و کێچیان دەکوشت، ئەوکات پێداویستیی وەکو شامپۆ و ئیتر نەبوو، خەڵک هەژار بوو، (نانۆ)کەی من تەنیا ناونیشانە بۆ تاکدێڕی و شتێک نییە، کە نانۆی هەرە بچووک لەنێو تاکدێڕییەکان

**سمکۆ محەمەد:**
**من باسی کاریگەریم نەکردووە، چونکە ئەوە باسێکی دیکەیە، کە زۆربەی نووسەرانی دونیا. بۆرخیس، مارکیز، یەشار کەمال و دانتی و هتد، هەموویان لەژێر کاریگەریی هەزار و یەکشەوە و داستانی گلگامش بوونە. بەڵام کاریگەریی لە جەوهەری دەق دەردەکەوێت، نەک ناونیشان**

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:**
**واڵت ویتمان-ی شاعیری ئەمریکی لە شوێنێک، کە باس لە ئەزموونی خۆی دەکات، دەڵێت: وەختێک دەمویست شتێک بنووسم، ئەگەر سەرەتاکەی باش بوو دەمگوت سوپاس بۆخوا، لەم نووسینە سەرەتایەکی باشم هەیە**

جێگەی دەبۆوە، چونکە لە مەبەست و فانتازیا، خۆماڵین و بەشێکە لە بیرۆکەی من بۆ ژیانی هونەرووەرانە و فۆلکلۆریانەی خەڵکی هەژار.

**سمکۆ محەمەد:** باشە من پێموایە سپەیسێکی زۆر لەنێوان ئەو تاکدێڕیی-یەی تۆ و کورتە چیرۆک نییە، من وەکو یەک ژانر دەیانبینم، بۆچی جودات کردوونەتەوە؟ لەکاتێکدا هەموو تێکستێک لەناوەوە چیرۆکە، بەڵام ژانرەکەی و هونەرەکەی جیاوازە، مەبەستمە بڵێم ئەو تاکدێڕی-یەی تۆ باسی دەکەی شتێکی نوێ نییە، وەکو چیرۆکی زۆر کورت وایە.

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** بەڵێ، ئەم تێڕوانینەی تۆ نیوە ڕاستییەکی تێدایە، تاموچێژی کورتە چیرۆک، لە تاکدێڕیی-دا هەیە، بەڵام ئـەوەی لەچیرۆک هەیە موفاجەئاتە، واتـە سوپرایز و نکاودارییە، هەندێک سەرسوڕمانیشی تێدایە، کە بۆ تاکدێڕیی دەورێکی کارای هەیە، خۆ ئەگەر خوێنەر یان هەندێک کەس سەرنجیان هەبێت لەسەر ستایلی نووسینی تاکدێڕیی و پێیان وابێت ئەمە مانای نییە، من ئەو بیانووەشم نەهێشتۆتەوە، فەرهەنگۆکم دروست کـردووە، هەم ڕوونـم کـردوونـەتـەوە، هـەم وردە شیکاریم بۆ ئەو موفرەدانە کردووە، کە بەکارم هێناون، کە سەرچاوەی بەشێکیان بۆ گوندەکانی ناوچەی خەلیفان دەگەڕێتەوە، کە ئەوکاتە من لەو ناوچەیە مامۆستا بووم، زۆر کەڵکم لە زاری جووتیارەکانی ئەوێ وەردەگرت، لەهەموو حاڵەتێکدا تاکدێڕیی لەبری سەفسەتەیی نووسینە. من دەتوانم بۆ نووسینی هەر تاکدێڕییەک، چەندین دێڕی دیش کەلەکە بکەم، بەڵام پێویست ناکات خوێنەر بکەمە حەمبالی ئەو زێدە دێڕە بێ کەڵکانە.

تاکدێڕیی ستایلێکی تایبەتە بەخۆم، یان لانیکەم کەس بەو ستایلەی من ناتوانێت بنووسێت، کە لە کورترین هەناسەی شیعریی دا زۆرترین مانا ببەخشێت، ئەمەش بواری گفتوگۆی تێدایە و ئامادەم سەرپێی کۆمەڵێک دێڕی بۆ زیاد بکەم.

## گفتوگۆی پازدە

**سمکۆ محەمەد:** پێموایە پێشتر زۆر قسەمان لەبارەی چەمکی دەقـاوێـزان کـردووە و هـەردووکیشـمان بۆچوونمان لێک نزیکە. بەڵام بۆئەوەی خوێنەر بزانێت بۆچی چەمکی دەقاوێزان بووەتە هۆکاری شەرعییەت دان بـەدەق وەرگرتن لەدەقێکی دی، چونکە (جۆلیا کریستیڤا) کە ڕەخنەگرێکی فەڕانسییە، پێیوایە هەموو دەقێک دەچێتـەوە سـەر دەقـەکانی پێش خـۆی، یان کاریگەریی سەردەمی خۆی.

ڕۆلان بـارت-یش پێیوایە دەقـاوێـزان چارەنووسی هەموو تێکستێکە، جا با ئەو تێکستە هەر ناوونیشان و فەزایەکی هەبێت، من لێرەوە بۆچوونی خۆم هەیە، کە بۆیە دەقـاوێـزان ڕەواجـی ئەدەبیی وەرگـرتـووە، چونکە وەکو میکانیزمێکی دیکەیە بۆ ئەوەی ئەدەبی بـەراوردکـاری جـارێکی دی ئاکتیڤ نـەبێت، تۆ

لەمەبەستەکەی من تێگەیشتی؟

**عەباس عەبدوللا یووسف:** بەڵێ تێگەیشتم، بۆچوونەکەت ڕاستە و گوتراوە، پێشتر تیۆری بەراوردکاریی ئەم بابەتەی یەکلا کردووەتەوە، ئەدەبی پاک و بێگەرد خاوەنداری بوو، واتە ئەو تیۆرە یارمەتی نووسەری دەدا تا موڵکی بۆ بگەڕێتەوە، کە لەلایەن کەسێکی دیکەوە داگیر کرابوو، یان دزرا بوو، ساڵانی پێشتر کتێبێکی عەرەبی هەبوو بەناوی (السرقات الادبية) واتە دزینی ئەدەبیی.

لەو کتێبەدا کۆمەڵێک دەقی بەیانکراو هەیە، لە دەقی دیکە دزراون، پاشان ڕەخنەی نوێی ئەدەبی چەمکی هاودەقی واتە( تناس) (دەقاوێزانی) هێناو کاری پێکرا، ئەمە بەچەند مانایەک هات، لەوانە وەرگرتن و ناوەرۆک، چونکە دەقەکە مانای پێش خۆی وەرگیراوە، یان مانا زەینیی یان بەمانایەکی دی فیکرەکەی لەدەقێکی دی وەرگیراوە، واتە ئەو دەقەی، کە بەراورد دەکرێت لەگەڵ دەقێکی دی، ئەمەش مانای ئەوەیە، کە فیکرەکە موڵکی نووسەرەکە خۆی نییە، ئەم پرۆسەیە دوو ڕەهەندی هەیە، یەکەم بێ ئاگایی دەقساز لە ئەنجامی خوێندنەوەی دەقی هاو فیکرەکەی، کە هاوفەزای ئەو دەقەیە و لە دەقەکەی دواتر ڕەنگی داوەتەوە و بۆتە هاودەنگ، یانیش نووسەرەکە بەئاگاییەوە هاتووە و دەقێکی پێشەخۆی خستۆتە نێو دەقەکەی خۆیەوە، کە ئەمەش زیاتر لەشانۆنامەدا هەیە، کە سەر لەنوێ داڕێژراوەتەوە، وەکو شانۆنامەی (ئۆدیب) چەندین نووسەری جیهانیی هەریەکە و شێوازی خۆی نوسیتەوە، ئێستە ئەمە نەماوە، نە خەڵک لە ڕێگەی یاساوە بەدوای مافی خۆی دەگەڕێ و نەڕەخنەگری بەویژدانیش هەیە ئەو دوو دەقە بەراورد بکات و ماف بەدەقی یەکەم بدات.

**سمکۆ محەمەد:** بەڵام پێشتر لەنێو کوردیش ئەوە کراوە، چونکە ڕەخنەگر و کەسی شارەزا هەبوون، کە بەتیۆری بەراوردکاریی کاریان دەکرد، ئەوەبوو چەند دەقێک ئاشکرا کران، کە لەدەرەوەی فەزای ئەدەبی کوردیی وەرگیرابوون، نموونەش هەیە لە دەقی فارسیی و عەرەبیی دزرابوون، بابەتەکەش قەبوڵ کرا، لەم دواییەش شیعر و ڕۆمانی کوردیی ئاشکرا بوون، کە لەئەدەبی بیانی و فارسییەوە وەرگیرابوون، پێویست ناکات لێرە ناو بهێنین.

**عەباس عەبدوللا یووسف:** ڕاستە، بەڵام ئێستە بەهۆی سۆسیال میدیاوە، خوێنەری جددی نەماوە، لەنێو ئەدەبیش ئەو ویژدانە نەماوە، کە ماف بۆ خاوەنە ڕەسەنەکەی بگەڕێنێتەوە، مەگەر لەنامەی ماستەر، یان دکتۆرا ئەمە بکرێت، ئەویش لە ناوخۆی ئەکادیمی دەرناچێت.

ئەو ڕۆژە نزیکە، کە ئەندرێ بریتون پێشبینی بۆ کرد، هەموو کەس دەبێتە شاعیر، منیش ئەوەی بۆ زیاد دەکەم، هەموو کەس دەبێتە ڕۆماننووس. لە یایندەیەکی دەستکرد ئامێرەکانی ژیسازیی (الذكاء الاصطناعي) لە تێکڕای نووسەرانی زیندوو دەبێتە شاعیر و ڕۆماننووستر و لە بواری سینەماش دەرهێنەرتر و




کێشەی دزینی ئەدەبیی بە تەواوەتی بنبڕ دەبێت، واتە هەر هەموومان بە ئامێرەوە مافی دزینی ئەدەبیی و هونەریی بۆمان واڵایە و ڕەوایە.

## گفتوگۆی شازدە

**سمکۆ محەمەد:** وێنەی شیعریی (الصور الشعريه) یان وێنەی هونەریی، یان پۆستەرە شیعر، بریتین لە بەرجەستەکردنێکی ماتریالی وشە، هەندێک جار دروستکردنی وێنە پەیوەستە بە دۆخی سایکۆلۆژی نووسەرەوە، لە هەردوو حاڵەتی نێگەتیڤ و پۆزەتیڤ، ئەم هەوڵە لەسەردەمی کلاسیک دا یەکێک بووە لە هۆکاری بونیادنانی دەقێکی شێوەکاریی، بەتایبەتی

ئەگەر نووسەرەکە خاوەنی ئەزموونی خۆی بوو بێت، ئێستەش ئەم هەوڵە هەیە (هێربێرت ڕێد) کە ڕەخنەگرێکی ئەدەبیی و شێوەکاریی ئینگلیزە، بەمیتافۆر، یان مەجاز ناوی دەهێنێ، تۆ بەوە ناسراوی، کە ئەو هەوڵانەی دراون بەوێنەی نازانی، گوایە ماتریالی نیین؟

**عەباس عەبدوللا یووسف:** بەڵێ من گوتوومە وێنەی شیعریی تەنیا ماتریال نییە، بەڵکو زەینیشە، بۆ نموونە شاعیرێک لە شاعیرە میتافیزیکەکانی ئینگلیز، کە باسی خۆی و عیشقەکەی دەکات، دەڵێت: (من و تۆ وەکو پرگاڵین، تۆ چەقی پرگاڵەکەی و منیش بەدەورتدا دەسووڕێمەوە) وەکو چۆن دیتری (من شەمع و تۆ پەروانە) لەشیعری کلاسیکی کوردیدا زۆر بەکارهاتووە، بەڵام ئەم وێنەیە تەنیا بۆ عیشق نییە، بەڵکو بۆ سیاسەتیش دەبێت، وەکو هەوڵێکی ئیستاتیکی چارەسەری ئەدەبیی بۆ نەکراوە، من بۆیە ئەو بۆچوونەم هەیە، کە ئەو هەوڵانەی دراون وێنەی شیعریی نین، چونکە هەستم بەلایەنە ئیستاتیکەکەی نەکردووە، هەستم بە بەرجەستەکردنی ماتریالیش نەکردووە، تەنیا وێناکردنەوەی ئەو واقیعەیە، کە نووسەرەکە بینویەتی، نەک بەکارهێنانی خەیاڵ، چونکە لانی کەم وێنە دەبێ بەرهەمهاتووی خەیاڵ بێت، یان وێناکردنەوەیەکی فەنتازی.

***سمکۆ محەمەد:***
***من ئەو مێژووە لەتۆ باشتر دەزانم، تەنانەت دەتوانم ناوی دەیان نووسەری ژن و ڕەخنەگری ژن بەیان بکەم***

***عەباس عەبدوڵلا یووسف:***
***ئاخر ئەدەب وەکو پێشتر گوتمان بەشێکی زۆری گوتارە، گوتاری کۆمەڵگەی داخراویش گوتاری پیاوسالارییە، ڕەخنەگرتنیش لە سیستمی پیاوسالاریی، زیاتر بابەتی ئافرەتی ڕۆشنبیرە و ئەدەبی ژنانە باشترین کارتە، چونکە ئەم ئەدەبە زۆر زوو لەفەزای کۆمەڵایەتیدا ڕەنگدەداتەوە***

**سمکۆ محەمەد:** چۆن نییە، شاعیر هەیە شاخی کردووە بە پیاوی پیر و دەڵێت: (ئەو شاخە وەکو پیاوێکی پیرە و پاڵتۆی بەخۆیدا داوە) ئەدۆنیس دەڵێت: (تەنیایی دارستانێکە بەتاقە دارێک) دەیان نموونەت بۆ دەهێنمەوە، ئاخر ئەم ڕەتکردنەوەیەی تۆ ڕێگەی لە موناقەشەی جددی گرتووە.

**عەباس عەبدوللا یووسف:** من باسی ستایلی بەرجەستەکردنی شیعرم کردووە، نەک ڕەتکردنەوە، من گوتوومە مەرج نییە وێنەی شیعریی وەکو ئەو وێنەیە بێت، کە ئێمە بینیومانە، بەڵکو ئەو بەرجەستەکردنە، کە وێنەیەک بەزەین دروست بکەیت، گواستنەوەی سروشت بۆ وشە، هیچ هونەرێکی تیانییە، من باسی ئەو وێنەیە دەکەم، کە وشەکان لەبەرچاوی خوێنەر دەجووڵێنێت، هزر و شێوەی شێوەکان دروست دەکات، ئەم هەوڵە قورسە، زۆریش!.

### گفتوگۆی حەقدە

**سمکۆ محەمەد:** شتێک هەیە وەکو دیفاکتۆ دەرکەوتووە، بەڵام هەموو ئەدیب و نووسەرێک ڕەخنەی لێی هەیە، کەچی دەترسن، وەک ئەدەبی جودا تەماشای ناکەن، چونکە فەزاکە داخراوە، بۆ نموونە ئەدەبی ژنان مەسەلەیەکی قورسە، هەم وەکو ژانر و هەم وەکو ناوونیشانی ئەدەبیی، ژنان خۆشیان نایانەوێت ناوونیشانەکە نەمێنێ، چۆن دەبێت ئەدیب، کە نووسین وەکو کاری هیومانیزمی تەماشا دەکات، بڕوای بەو ئەدەبە هەبێت؟

**عەباس عەبدوللا یووسف:** لە ڕاستیدا من ئەمە بە دوو شێوە دەبینم، یەکێکیان وەکو دیفاکتۆیەکی ئەدەبیی، کە لە دونیادا لەبەرچاو گیراوە و چەسپاوە، ئەوەی دیکەیان وەک ڕەخنە لە کۆمەڵگەی داخراو، لە خۆراوا لەمێژە لەدوای سەدەی نۆزدەوە بزووتنەوەی ژنان دەرکەوت و بوو بەبزووتنەوەیەکی ناسراو، بەتایبەتی لە دوای نارەزایەتی کرێکارانی پارچەچنینی ئەمریکا لە شیکاگۆ، یان کۆمۆنەی پاریس، یان بزووتنەوەی ژنان لەفەڕانسە، دواتر نووسەری ئافرەت لە ئەورووپا ڕووسیا پەیدابوون، بزووتنەوەی فێمینیستی بوو بەناوێکی دیاری مەیدانی سیاسیی و ئەدەبیی و هونەریی، بۆیە من بڕوام پێی هەبێت یان نا، ئەمە خۆی هەیە، جا موناقەشە دەکرێت و ڕەت دەکرێتەوە شتێکی دیکەیە؟

**سمكۆ محەمەد:** من ئەو مێژووە لەتۆ باشتر دەزانم، تەنانەت دەتوانم ناوی دەیان نووسەری ژن و ڕەخنەگری ژن بەیان بکەم، بەتایبەتی ئەو ژنانەی، کە دامەزرێنەری بزووتنەوەی فێمینیزم و سۆسیالیزمی خەیاڵی و هتد بوون، من باسی ئەوە ناکەم، کە ژن بەشێکە، یان کارتێکە بۆ ڕەخنەگرتن لەکۆمەڵگەی داخراو، من باسی قەبولکردنی ئەدەبی ژنان دەکەم، کە ئەمە گاتیگۆری فیکری ئەدەبییە و بریتییە لەرەتکردنەوەی هیومانیزم.

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** ئاخر ئەدەب وەکو پێشتر گوتمان بەشێکی زۆری گوتارە، گوتاری کۆمەڵگەی داخراویش گوتاری پیاوسالارییە، ڕەخنەگرتنیش لە سیستمی پیاوسالاریی، زیاتر بابەتی ئافرەتی ڕۆشنبیرە و ئەدەبی ژنانە باشترین کارتە، چونکە ئەم ئەدەبە زۆر زوو لەفەزای کۆمەڵایەتیدا ڕەنگدەداتەوە، ئاشکراکردنی ئەم ڕەخنەیە و دەرکردنی لەزمانی نهێنی، واتە بەدەنگی بەرز ڕەخنەگرتن لەکۆمەڵگە قورسە و هەموو کەسێک گوێ لەو ڕەخنەیە ناگرێت، بەڵکو لەکایەی سۆسیۆلۆژیدا ئەو ڕەخنەیە قبولکراوە، بۆیە هەر ئەو ڕێگەیە بەشەرعی وەردەگیرێت، ئەویش ئەدەبە خۆ زمانی ڕاستەوخۆ نییە، ئەمە لە کۆمەڵگەی خۆراوایش سەرەتا هەمان کێشە و گرفت بوو، بەڵام دواتر لەکار و بەهرە یەکسانی لەنێوان ژن و پیاو چەسپا، ئیدی ڕاستیی بەرچاو بووە بەشێکی دیکەی داهێنان، ئەمە ئێستە لە کوردستانیش هەمان فۆرمی وەرگرتووە. چونکە کوردستان و خۆرهەلات، کۆپییەکی دیکەی دونیای خۆراوایە، بۆ نموونە پێشتر باسی ئانۆم کرد، ئەم کێشەیە، یان ئەم پرسە، وەکو کۆمەڵایەتی و سیاسییە، بۆیە قەبارەکەی هەرچەندە گەورە بکرێت، هێشتە هەر ئانۆیەکی دیکەیە لە فەزای ئەدەبیدا.

**سمكۆ محەمەد:** ئاخر من لە ڕێگەی خوێندنەوە و پەیوەندی کۆمەڵایەتییەوە، زانیومە و هەستم پێکردووە، جۆرێک لە ململانێ لەنێوان هەر دوو ڕەگەزی نێر و مێ هەیە، بەتایبەتی ئەو کاتانەی، کە ژن وەک ستەملێکراوێک تەماشای خۆی دەکات، بەڵام ئەمە بیرکردنەوەی ژنە، کە بازرگانیی پێوە دەکات، یان ستایلی ململانێکە لە ئەدەبەوە بۆ باسی ڕەگەزی دەگۆرێت، ئاخر ناکرێت پیاوی پێشکەوتووخواز، هەمان بیرکردنەوەی هەبێت، کە بیرکردنەوەیەکی ڕۆمانسییە، یان چاوپۆشی لێ بکات، بەخاتری ئەوەی ژنان ئەوەیان گەرەکە، لە کاتێکدا ڕەهەندە ئابوریی و سیاسییەکەی بە ئاشکرا دیارە، چ مەبەستێکی لەپشتەوەیە.

**عەباس عەبدوڵلا یووسف:** ڕاستە ململانێکە لەنێوان ئەو دوو ڕەگەزەیە و قوولتریشە، چونکە بابەتەکە لە کونجی ماڵەوە دەست پێ دەکات، تاکو دەگاتە مەیدانی سیاسەت، بەڵام چونکە لەنێو هەموو کایەکاندا هەیە، بۆ نموونە لە کایەی کۆمەڵایەتی و سیاسیی و فەرهەنگیی و ئابووریش هەر وایە، کەواتە ئەم ناوونیشانە جۆرە سەرکەوتنێکی ئافرەتانە، کە لەگوتار و زمانە ئەدەبییەکەیدا، هەم فۆرمێکی سێکسی وەردەگرێت، هەم هەوڵدانێکی کۆمەڵایەتی، ئێستە ئەم بابەتە بۆ شتی دیکە و دیاردەی دیکە سەری کێشاوە، بۆ نموونە سێکس بووە بە بابەتی بازرگانیی و ژنان دەست بۆ کەرەستەی دیکە دەبەن، ئەمە پێشکەوتنە، ئەدیب ناتوانێت ئەمە

> **سمكۆ محەمەد:**
> **تۆ زۆر کەڵکت لە نیمیل سیۆران وەرگرتووە، وانییە؟ بەتایبەتی ئەو ئانۆمێدیەی، کە بەخوێنەری دەبەخشی**
>
> **عەباس عەبدوڵلا یووسف:**
> **بەڵێ ڕاستە، سیۆران وەکو نووسەرێکی خۆراوایی ناسراو، کاریگەریی لەسەرم هەبووە، لە یەکەم وتارییەوە، کە چەند جارێکم خوێندەوە، سەرنجی ڕاکێشام، بەناسانی ڕستەکانی هاتنە نێو دێڕەکانمەوە**

ڕەت بکاتەوە، چونکە کۆمەڵگە و سەردەمەکە قەبووڵی ناکات. بەڵام من بۆخۆم هەندێک جار بزووتنەوەی فێمینیزم و ژنان بە بزووتنەوەیەکی توندڕۆ دەبینم، زۆرجار زوڵمەکە پێچەوانە بۆتەوە، ژنان لە جیاتی ئەوەی مافی خۆیان وەربگرن، بەپێچەوانەوە بەناوی جێندەرەوە بەسەر پیاوان زاڵبوونە، زوڵمیش هەیە، لە ڕووی ئەدەبیی و فەرهەنگی هەمان مانای وەرگرتووە. بەتایبەت بابەتی سێکسوالێتی، کە جۆرێک لە لادانی سێکسی تێکەوتووە، ئەمە لە ئەدەب و هونەریش ڕەنگی داوەتەوە، بۆیە بابەتەکە دوو ڕەهەندی هەیە، هەم قەبولکردنی دیفاکتۆکەی لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، هەم ڕەتکردنەوەی تونخوازییەکەی، کە دەیەوێ هەموو بەرسمانەکە بگۆرێت.

# عیشق و شیعر

ئەحمەدی مەلا

١

هەموو سەبکێکی ئەدەبی تەمەنێکی هەیە، بەڵام عیشق بێ تەمەنە. ئەمە خۆی لە خۆیدا کێشەیەکە، چونکە دوو ڕەگەز تێکهەڵکێشی یەکدی دەبن، یەکێکیان کاتییە، ئەوەی دیکە هەتاهەتاییە، یەکێکیان قاوغە، کە ڕۆ دەچێتە ناوەڕۆکەوە، ئەوەی دیکەیان، وەک ناوەڕۆک خۆی بە قاوغەوە هەڵدەواسێت.

بۆچی ئەو ستایلەی نالی و مەحوی پێیاندەنووسی، لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمەوە گۆڕانکاریی بەسەردا دێت؟ هۆکارەکانی ئەم گۆڕانکارییانە چی بوون؟ نالی چۆن ئەم شێوازە شیعرییە دەگەیەنێتە لووتکە، دوای ماوەیەک سەبکەکەی پشتگوێ دەخرێت؟ گرفتەکان چی بوون؟

ئەم پرسیارانە دەشێ ببن بە بابەتی ماستەر و تێز، بەڵام، هەوڵ دەدەم چەند سەرەداوێکی وەڵامەکان بەدەستبهێنم.

- ئەو هاوسەنگییەی، کە لەنێو دەقی شیعریی حوجرەدا بەدی دەکرێت، هەڵقوڵاوی تێگەیشتنێکی تایبەتە، بۆ دونیا.

دارەڕاکانی گەردوون، نیزامی ئەستێرە و مانگ و خۆر نیزامێکی ڕەهایە، بۆیە شیعر دەبێ ڕەنگدانەوەی ئەم هاوسەنگیی و ئەم ڕەهاییە بێت. گەڕانەوە بۆ فەلەکییاتی بێتلیمۆس، خاوەنی ماجستی، کە زانستی فەلەکییاتی ئیسلامی تەواوکەری ئەم تێگەیشتنەیە.

- سەروا و کێش، وەک دوو ڕەگەز، کە بنەمانی ئەم جۆرە شیعرەیان ڕاگرتووە.

- وێنەی شیعریی، وێنە ڕەوانبێژییەکان، هەڵبژاردنی موفرەدە، وەک مرواری، واتە وەک ئەستێرەکانی گەردوون وان.

- گێڕیی و خۆبەدەستەوەنەدانی هەندێک چەمک و وێنەی شیعریی، کە گوزارشت لە تەمومژیی گەردوون دەکەن.

لە ڕووی ناوەڕۆکەوە:

- عیشقی مەجازی و حەقیقی زەینین.

- عیشق لە پێنەگەیشتندا خۆی پێناسە دەکات.

- مەعشووق بوونەوەرێکی ڕەها، دووردەست، بەدەسەڵاتە.

- واقیع بە کەرتکراوی لەم جۆرە شیعرانە ڕەنگی داوەتەوە، واقع نەشێوێنراوە، بەڵکو بزرکراوە.

- عیشق پرۆسەیەکی دووبارەبووەوەیە، وەک سەمفۆنیایەک، مۆسیقا ژەنی جیاواز بیژەنێ. سەنتەرێکی جێگیر و پەراوێزێکی بزۆز.

٢

ئەو جۆرە شیعرە لە سەر ئەزموون لەگەڵ واقیع بەرجەستە نەبووە، بەڵکو لەسەر ئەزموونێک دروست بووە، کە ئیشی لەسەر سەنعەتی شیعر کردووە، وەک مرواریتاشێک ئیشی کردووە، سەلیقەکان لەم ڕێگەیەوە چەکەرەیان کردووە، تەنانەت دەنگە تایبەتەکانیش لە ڕێگەی ئەم داتاشینەوە هاتوونەتە دی.

شیعرێکە لە سەر یەک تێم ئیش دەکات، هەندێک جار جۆرە لادانێک ڕوویداوە، بەڵام لادانن لە پەراوێز (نموونەی مەستوورەی نالی، یان ئەو دەقەی، کە بۆ گوێدرێژەکەی نووسییوە..)

کەواتە چۆن و کەی گۆڕانکاریی ڕوودەدات؟

- کاتێک واقیعێکی دیکە سەرهەڵدەدات، واتە شاعیر دونیای ماددی کەشف دەکات، وەک بڵێی دونیایەک ئاوا دەبێ، دونیایەکی دیکە جێگەی دەگرێتەوە، ئەم وەرچەرخانە چەند دەیەیەک دەخایەنێت.

- شێخ ڕەزا یەکەم شاعیری ئەو قۆناغەیە، کە وردەکارییەکانی واقیع، کۆمەڵایەتی، پیشەیی و کارەکتەر، دەهێنێتە نێو شیعرەکانییەوە، هەر لەبەر هەندێیە، شێخ ڕەزا لە هەموو ئەوانەی پێشخۆی جیاوازترە، تەنانەت ئیدی خەریکی مرواری تاشین نابێت، بەڵکو شیعر دەکا بەو

پەنجەرەیەی، کە لێیەوە دەڕوانێتە ژیان.

- ژیان بۆ یەکەمین جار بە ڕووی شێخ ڕەزا-دا دەتەقێتەوە. ئەم تەقینەوەیە، کە ئیدی زمان دەکاتە گوێزان، زمان ڕازاوە نییە، بەڵکو تیژە.

- موفرەدەی دیکە، موفرەدەی زەینی نین، پەیوەندییان بە دونیای تەسەوف، زانستی کەلام و ڕەوانبێژیی قەبەی حوجرە نییە، بەڵکو موفرەدەی ئاساییین.

- حاجی قادری کۆیی یەکەم کەسە باسی ڕۆمان و ڕۆژنامە دەکات، یەکەم کەسە مێژەر لە سەری شیعری کوردی لا دەدات.

- لە سەرەتای سەدەی بیستەم، دەستەیەک شاعیر، بەتەواویی دەستکاری ناوەڕۆکی شیعریی دەکەن، بەڵام هێشتە دەیانەوێت لە سەبکە کۆنەکەی بیهێڵنەوە. مەعشووق ئیدی، لەگەڵ شێخ ڕەزا و کۆیی بە تەواویی سەنتەری شیعر جێدەهێڵێت.

- ئەحمەد موختار جاف بە ڕوونی دەڵێت «لادە شاعیر تۆ لە عیشقبازیی.»

- مەعشووق جێی لەق دەبێ، خۆشەویستی خاک شوێنەکەی دەگرێتەوە.

- چەمکی خۆشەویستی ون نابێت، بەڵکو دەبێت بە ئەزموون.

- نیشتمان وەک چەمکێکی شیعریی، بە مانا هەرە سیاسییەکەی لە دایک دەبێت.

- نیشتیمان، هەم سنوورە، هەم زمانە، هەم دونیابینییەکی دیکەیە.

- گۆران بە تەوایی ناو لە عیشق و مەعشووقێکی نوێ دەنێت.

- ئازادیی وەک چەمکێکی نوێ، بۆ یەکەم جار دێتە نێو دەقی شیعرییەوە.

- داهێنانی چاپەمەنی دەبێت بە بابەتی شیعریی، لەگەڵ شێخ نووری، ئەم دیاردە نوێیە دەبێتە بابەتی شیعر.

- وەرزش و یانە وەکو دوو فەزا بۆ چالاکی کۆمەڵایەتی سەرهەڵدەدەن.

٣

## سەرهەڵدانی کتێب

سەرلەنوێ ئەرکی کتێب پێناسە دەکرێتەوە، وەک ئەوەی مرۆڤی کورد پێناسەیەکی دیکە بۆ کتێب و خوێندنەوە بکات، چونکە تاکو کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم، کتێب واتە قورئان و کۆی ئەو بەرنامەیەی، کە لە حوجرەکان دەخوێندران.

کتێب مەلای بەرهەم دەهێنا و خەڵکی هان دەدا، کە ڕێگەی خودا بگرن. کتێب بۆ خەڵک نییە، تەنیا دەستەیەک ئەو مافەیان پێ ڕەوا دەبینرا. بەرنامەی حوجرە کورت دەهێنێت بۆ هۆشیارکردنەوە، بۆ خوێندنەوەی واقیعی نوێ، بۆ هاندانی لاوان، بۆ چارەسەری برینی کوردان. شاعیری حوجرە باسی گرنگی کتێب ناکات، باسی ئەو ئەڵقەیە ناکات، کە خوێنەر و واقیع بەیەکەوە گرێ بدات.

حاجی قادری کۆیی، ڕەنگە یەکەم کەس بوو بێت ئاوڕی لەم کایەیە دابێتەوە، باسی گرنگیی ڕۆژنامە دەکات، ڕۆژنامە بە پێچەوانەی قورئان، ئیش لەسەر هەواڵی هەنووکەیی دەکات، گوتاری جیاوازی تیایە، کێشەکانی ڕۆژ بەسەر دەکاتەوە، کایە سیاسیی و پەروەردەیی و گرنگیی پەروەردە و هونەر و زاست... بۆیە دەبینین، دواتر، شاعیرانی سەرەتای سەدەی بیستەم، باسی گرنگیی خوێندن دەکەن، تاکو مرۆڤ لە جەهل و نەزانین ڕزگار بکات، خوێندن دەبێت بە هەتوان و دەرمان تاکو کورد برینەکانی خۆی پێ چارەسەر بکات.

جاران، ئەگەر کتێب بۆ ئەوە بوو بێت مرۆڤی ئیماندار بەرهەم بهێنێ، کەچی لەو قۆناغە بە دواوە، کتێب بۆ هۆشیارکردنەوەیە، بۆ ئەوەی قیتاری کورد بگات بە قیتاری شارستانییەتە سەرکەوتووەکانی جیهان. بۆ یەکەم جار باس لە گرنگیی زانست، سەنعەت و هونەر دەکرێت، باسی مەفتەن، دەستەواژەیەکی تورکییە، کە ئەوان لە موطن-ی عەرەبیی وەری دەگرن، کورد لە زمانی تورکییەوە، بە مانا هاوچەخەکەی بەرکاری دەهێنێتەوە. ئیدی کورد بیر لەو سنوورە جوگرافیایە دەکاتەوە، کە مێژووی کوردی لەسەر بونیاد نراوە. بیر و باس لە گرنگیی زمانی کوردیی دەکرێت، وەک ناسنامەی ئەم بە کوردبوونە.

واتە، لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمەوە کورد لە نەخوێندەوارییەوە بەرەو خوێندەواری هەنگاو دەنێت.

٤

ڕەهەندەکانی کرانەوە بۆ سەرچاوەی دیکە، شاعیرانی سەرەتای سەدەی بیستەم دەگوازێتەوە بۆ ئاستێکی دیکەی نووسین. خۆشەویستی خاک و نیشتمان بۆ یەکەمجار لە دەقی ئێمە ڕەنگدەداتەوە. ئەزموونەکانی خۆشەویستی بۆ ڕەگەزی مێینە دەبێتە ئەزموونی کەسیی

شاعیران، پیاهەڵدان بە جوانی سروشت بۆ یەکەمین جار هەر لەو قۆناغە ڕەنگ دەداتەوە، چونکە سروشت دەبێتە شوناسی نەتەوەیی. واتە جوانی نیشتمان هەڵگری واتای دیکەیە، ئەم شوناسە لە لای شاعیرانی حوجرە بەدی ناکرێت، سروشت لە لای شاعیرانی حوجرە، سروشتێکی زەینییە، ستاتیک و نەبزێوە، بۆ ڕازاندنەوەیە وەکو گوڵی سەر گۆڕەکان. کەچی، شاعیرانی سەرەتای سەدەی بیستەم داوەتمان دەکەن بۆ ئەوەی بچینە نێو سروشت، سروشت دەبێت بە بەرهەمی نەتەوە. داربەڕو، نێرگز و هێرۆ هەڵگری واتای بزێو و زیندوون.

گۆران لە شیعری (جیلوەی شانۆ) کە پێشکەشی پەریی سەما-ی کردووە، سەرنجی ئەوە دەدەین، کە شاعیر-بینەری سەمایەکە، کە لەسەر تەختەی شانۆ ئەنجام دەدرێت. سەرەتای دەقەکە لە نادیارەوە بەرەو دیار دەست پێدەکات (لە جەرگی پەردەوە تک تک دڵۆپی عوود ئەڕژا) دەنگی ئاوازێک لە پشتەوەی پەردە هەم خەیاڵ جۆش دەدات، هەم وەک دەستپێکێک خۆی بۆ نمایشەکە ئامادە دەکات. جێی بایەخە، کە دەنگی ئەو ئامێرە دەبێت بە مایەی دڵخۆشیی، نەک غەمگینیی. لێرە، هەم ڕەگەزی مۆسیقا، هەم ڕەگەزی تاڵعی سروور بەختەوەریی و دڵخۆشیی مایەی تێرامانن لە دەقی نوێماندا. دواتر ئامێری کەمان، وەک بوونەوەرێکی زیندوو تێکەڵی کۆنسێرتەکە دەبێت: (کەمان-شەهیق و زەفیری فریشتەیی ئەلحان) لە کەمانەوە ئاوازێکی هەند بە جۆش وخرۆش بەرزدەبێتەوە، تەنانەت دڵی مردوویشی پێی ئاشنا دەبێ. بێدەنگی پشتەوە پەردە، دەنگی عوود، دواتر دەنگی کەمان، هەنگاو بە هەنگاو هەم شیعرەکە لە دایک دەبێت، هەم نمایشەکەمان بۆ وێنا دەکات. گۆران بە تەواویی ژن وەک بکەرێک دەهێنێتە سەر شانۆ ژیان.

٥

ئەم گۆرانکاریی و وەرچەخانانە بەرهەمی دونیابینین، هیچ دونیابینینێک بەبێ زمان نایەتە دی، کەواتە، لە شێخ ڕەزاوە بۆ حاجی قادری کۆیی، درزێک دەکەوێتە دونیابینی حوجرە، شاعیرانی سەرەتای سەدەی بیستەم، دەیان موفرەدی نوێ دەهێننە نێو شیعرەکانیانەوە، بەرق، کارەبا، پاپۆر، سەنعەت، عیلم، هونەر، پەروەردە، یانە، وەرزش، سیاسەت و سنوور هتد. کۆی ئەم موفرەدانە لە ئەدەبیاتی حوجرەدا غایبن.

کاتێک پشت لە کێشی عەرووز دەکرێت، پشت لە کۆی مەعریفەی حوجرە دەکرێت چونکە ئیدی گوزارشت لەو دونیا نوێیە ناکات، کە شاعیرانی سەدەی بیستەم تیایدا دەژین. زەمەنێک و زەینێکی نوێ دێتە دی، قۆناغێک، کە ئیدی دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەینێ دەچنە دوو توێی شیعری کوردییەوە، ئەم سێ ڕەهەندە زەمەنییەمان لە شیعری حوجرەدا نییە. زەمەن لە لای نالی، لە لای سالم و مەحوی وەستاون.

ئەم هزرە ئیدی پێویستی بە زمانێکی دیکەیە، بۆیە زمان دەبێتە موڵکی شاعیر، کە لەنێو زمانی دایکەوە دەیقەپێنێ. هەر لەم دیدەوە ئیدی عیشق لە ئیدیالەوە دەکەوێتە سەر عەرز. دیالۆگ لەنێوان عاشق و مەعشووق دروست دەبێت، لە دوو کڵێشەی بێ ڕۆحەوە دەبن بە دوو بەرجەستەی دونیایی.

٦

تیمەی عیشق لە شیعری کوردیی بەردەوامە، زۆرجار وەکو کلێشەی حازربەدەست دووبارە دەبنەوە، واتە نە ئەزموونێکی ڕاستەقینەیە، نە ئەو شێلکە کۆنەی جارانیشی هەیە، ڕەنگە وەکو کۆنە برینێک جاربەجار برینەکانی شاعیر بکولێنێتەوە، یا هەندێک جار عیشقێکی دۆنکیخۆتانەیە، عاشق دیار و مەعشووقیش ون.

ئەوەی دەمێنێتەوە، خودی عیشقەکە نییە، بەڵکو ئەو زمانەیە، کە چۆن گوزارشتی لێ دەکات، چۆن کار لەسەر دەقی شیعریی کراوە، وێنە شیعرییەکان چۆن بەرجەستەبوونە، واتە تەونە واتاییەکان چۆن لە وێنەکانەوە دەردەپەڕن، چ ئۆخژنێکیان پێیە، چ تەزووەیەکی سۆزیان هەڵگرتووە؟

تیمەکانی گریان و کرووزانەوە و دووریی و دووردەستی و هەڵتوتان لە کونجەکان، خۆمەستکردن، خۆ خستنە پەراوێزەوە، خەمخواردنی بێ سنوور، کۆی ئەم ڕەگەزانە زۆر جار هێندەی شیعریان لاواز کردووە، هەندە نەیانتوانیوە ببنە کۆڵەکەیەکی پتەوی دەقی شیعریی! چونکە، جۆرە ناکۆکییەک لەم نێوەندە هاتوتە کایەوە و سەبکی دەقەکان ئازادن، کەچی بابەت و تیمەکان کۆنن، ئەم دوو جەمسەرە ناکۆکانە دەقی کوردییان بێ هێز کردووە، وەک ئەوەی تیمەکانی شیعری حوجرە بە دەقی ئازاد بگوترێنەوە.

ئازادیی دەق، تەنیا لە فۆرمدا بەرجەستە نابێت، بەڵکو دەبێ ئەو ئازادییە ناوەرۆکیش بگرێتەوە، تەقینەوەی زمان دەبێ لەم دوو ئاستەدا ئەنجام بدرێت.

# چوار کورتە چیرۆک

## خەونی شوانێک

وەک ئەوەی کارێکی بە پەلەی هەبێت، بەخێرایی لە سەر یەک، قاچەکانی لە ژێر سکی گوێدرێژەکەی دەچەقاند و بە مۆبایلەکەشی خەریکی قسەکردن بوو، بە چاوەکانیشی چاودێری مەڕو بزنەکانی دەکرد، سەگە بۆرەش دەیویست ئەمە بسەلمێنێت، کە چاپوکە، بە دەوری مێگەلەکەدا دەهاتوو دەچوو، خاوەندارێتی دەکرد و جارجارەش، لەپێش شوانەکە، کلکی بادەداو لەگەڵ هاتنی دەنگی هەورەکە ڕووی دەمی لە ئاسمان دەکرد (حەو، حەو، حەو) دەوەڕی.

گرمەو بروسکەی بەهێز کوڵی بە بۆرە دەدا و نووسکەیەکی دەکرد و خۆی ڕادەوەشاند بۆ ڕزگار بوون لەو دڵۆپە ئاوانەی، کە بەری کەوتبوون.

هەورەکەش وەکو ئەوەی ژانی منداڵ بوونی گرتبێت و بیەوێت خۆی دەرباز بکات، سکی پڕی دەخشاند بە لووتکە و گردۆلکەی ئەم دەشت و دەرە، دۆڵەکانی پڕ کردبوو لە گاڵە گاڵ، کات تەواو تاریک داهاتبوو، ئەنگووستە چاو بوو، وێنەی کەسێک لە قووڵایی تاریکیدا، کە بیەوێت پێش چاوی خۆی ببینێت، لە نێوان گرمەی هەورەکان، بروسکەیەکی ئاگری، بەگڕ ئەو ناوەی دەکردە ڕۆژی ڕووناک، هەر وەکو ئەوەی زۆر کۆڵداربێت و بیەوێت کوڵی دڵی خۆی بەشێو و دۆڵ و قەدپاڵی ئەم ناوە بڕێژێت.

تائێرە شوانە لە سەر پشتی گوێ درێژەکەی نەهاتبووە خوارەوە و هێزی پاتری مۆبایلەکەشی تا دەهات لە کەمی دەدا، بارانێکی وا دایکردبوو تۆزی لەزەوی هەڵدەستاند، تا دەهات ڕەهێڵەی بارانەکە زۆری بۆ دەهێنا و جۆگە و ڕووبارەکان بەخوڕ دەهاتنە خوارەوە ئەم باهۆزە خەونی گەورەی شوانەی وەکو بەفری بەردەم خۆرەتاو دەتواندەوە، بۆ ئەو شەوە ئەشکەوتێک بووە پەناگەی خۆی و مێگەلەکەی، هەندێک داروپوشی هەڵگیراوەی نێو ئەشکەوتەکەی لە سەریەک کۆمەڵ کرد و ئاگرێکی کردەوە، سەگە بۆرەش لە نزیکییەوە هەڵقونجا، ویستی کتلیە ڕەشەکەی وەسەر ئاگر بنێ و چایەک لێبنێت، بەڵام دڵ توندییەکەی ڕێگەی پێ نەدا و لە بەر خۆیەوە دەیگوت: (دەبێت ئەم شەو دڵی ئەو چۆن بێت؟ باوکی لەگەڵ خۆی دەیباتەوە یان چاوەڕێی من دەکەن) پرسیاری لە خۆی دەکرد (دەبێت کەسێک هەبێت منی لە بیر بێت؟ هەرچەندە بۆ ماوەیەک پشووە و خوێندن دەوەستێ. ئاخۆ باوکی ڕازی دەبێت کچەکەی بداتە شوانێکی لادێی وەکو من؟ خۆ ئەو زۆری خۆش دەوێم. نا، هیچ گومانم نیە لە هەستی ئەو) تەنیا بە جووڵانی لێوەکانی دەدواو دەیگوت: (ئاخۆ دایکم ئێستە بیر لەچی بکاتەوە؟ چۆن دێت و دەچێت و بەدوای منەوە وێڵە و خەمی دونیای لە کۆڵناوە، ئێستە چووە بۆ لای مەلای ئاوایی و خەریکی بەستنی دەمی گورگە، لەم سەرەوەش دەگەڕێتەوە بەلای خۆشەویستی کوڕەکەی و دڵنەوایی دەکات) دەنگی کەمێک بەرزتر هەڵبڕی و گوتی: (خوای گەورە خوای بێکەسان دڵی باوکی نەرم بکەی، لەگەڵ ئەوەی بوونی بێ هیوایی جارجارە لە دڵ و دەروونیا گوزەریان دەکرد، شەویش لای کردبۆوە و بارانەکەش نەرمتر بوو، تاریکی هەموو دونیای قووت دابوو، لەپاڵ ئاگردانەکە بەدەم خەم و خەیاڵەوە لەنێو باوەشی قاپووتە لە لباد دروستکراوەکەی خەو بردیەوە.

لەو ساتە دەنگێکی گڕوناخۆش تاریکە شەوی شەق دەکرد و گوێی شێو و دۆڵی کاس دەکرد و بۆ بەردەمی ئەشکەوتەکەی هەنگاوی هەڵدەهێنا، بینی تارماییەکی زەبەلاح هاوار دەکات و دووباڵە زلەکانی لێک دەدات، نیوەی لە دێو دەچوو، نیوەکەی دیشی لە مرۆڤ، موچڕکێکی تەزی لە تەوقی سەریەوە هات و لە بنی پێی دەرچوو، مرۆڤ نەیدەتوانی بە ئاسانی بەرەو ڕووی چاوەکانی ئەم شتە ترسناکە ببێتەوە، ئەژنۆی شل



شاخەوان مەلا محەمەد

و دەستەکانی دەلەرزین، ترس ئەوەندە زۆری بۆ هێنا، تاکو دوو سێ دڵۆپ میزی گەرم بەلا ڕانەکانی نەکەوت، دەمی دوراوێ بە ئاسانی هەڵنەپچڕێ. تارمایەکە زانی، کە ئەو ناتوانێت هیچ بڵێت، بۆیە بە سەریدا نەڕاندنی و گوتی: (ئەم ئەشکەوتە هی منە) شوانەش بە کۆکردنەوەی ئازایەتی خۆی و بەزۆر لە خۆکردنەوە زمانی هاتە گۆ و بەسەرهاتەکەی بۆ گێرایەوە، ئەویش بێ یەک و دوو، باڵی درێژ کرد و شوانەی لە سەر پشتی گیر کرد و بەنێو سەرما و تاریکایی شەوێکی سەخت لە شەقەی باڵی دا، تاکو نەگەیشتە پێش دەرگای ماڵی یارەکەی نەوەستا، شوانە دڵی خێراخێرا لێی دەدا، هەرچۆنێک بوو ئاودیوی ژوورەوە بوو چەند هەنگاوێک لە جێگەی یارەکەی نزیک کەوتەوە، سەری دانەواند بۆ ئەوەی بە ماچێک هەموو ناخۆشییەکانی ڕامالێ، بەڵام شەرم هەموو گیانی ساردی گەرم کردەوە، دەستی خستە بەر پشتێنەکەی و ئەو چەپکە گوڵەی کەوتە بەردەست، کە بە ڕۆژەوە بۆی چنی بوو، گوڵەکانی لە پشت سەری دانا و بەبێ دەنگی گەڕایەوە دەرەوە، چاوی بەولاو ئەو لادا گەڕاند، باڵندە گەورەکە نەمابوو دوو سێ جار بانگی کرد (زەبەلاح، تارمای، دێوە) دونیا کشومات بوو تەنیا دەنگی سەگێک دەهات، هەناسەی تەنگ بوو زۆر بەهێز هاواری کرد.

کاتێک لە جێگەی خۆی هەڵسایەوە بینی هەر لە بەردەمی ئاگردانەکەیە، هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و لەم لاشەوە بۆرە دەوەڕی و موژدەی هەڵاتنی ڕۆژێکی تازەی دەدا، خێرا خۆی کۆکردەوە و بەرەو ماڵ بۆوە، کە گەیشتەوە ماڵ، بە خێرایی پاتری مۆبایلەکەی پڕ شەحن کردەوە، بە دیاریەوە دانیشت و چاوەڕوانی دەکرد، کاتێک زەنگی هاتنی نامەیەک دڵی ڕاچڵەکاند، بەخێرایی تەماشای نامەکەی کرد نوسرا بوو: (گیانە دەزانم شەوی ڕابردوو زۆر پەرێشان بووی و ناخۆشترین کاتەکانت بەڕێ کردووە، بەڵام دایکت و باوکم هەموو شتێکیان بە کۆتا هێناوە لە ماوەیەکی کورت دەتبینمەوە سوپاسیشت دەکەم بۆ ئەم چەپکە گوڵە بۆن خۆشەی ئەم شەو بۆت هێنا بووم)

## عـاشقێکی ئەستێرە

ئەو شەوەی، کە خۆشەویستی بەرەو پیری مردنی دەبرد، هەموو خەونەکانی دەبوون بە بڵقی سەرئاو، بەسەرهات و ناخۆشییەکانی، تەنیا چیرۆکێکی بەرئاگردانی ناندینی ماڵە کوردەواریەکی لادێی نەبوو، کە تا درەنگانی شەو گوێیان بۆشل دەکرد. ئەو لە تەمەنێکی هەرزەکاریی دابوو، شەوانە خەو لە چاوەکانی تووڕەدەبوون، تا خودا ڕۆژی دەکردەوە، سەد جار خۆی لەنێو پێخەفەکەی وەردەگێڕا، سینگی لە سەرینەکەی هەڵدەسوی و سەدان حەز و خەیاڵ لەنێو مێشکی گوزەریان دەکرد. وێنەی ناسک و شلکی کوڕە دراوسێکەیانی دەکێشا، ئەمشەویش لە گۆمی ئەم ئارەزووانە گەمەی دەکرد. کاتێک هۆشی چووە خەوێکی قووڵ و ڕۆحی سووکی بەرەو بڕینی پەیژەکانی سەربان هەنگاویان هەڵگرت، وەکو خووی پێوە گرتبێت لە سوچێکی دیواری سەربانەکە بەگرمۆڵەی دانیشت و چاوی لەو ئەستێرەیە بڕی، کە ببووە ئەوینی بێ پسانەوەی ژوانی شەوانەی، لەپڕ ئەستێرەکە ڕەنگی گۆڕا و ئارام ئارام بۆ ئاوێزان بوون هاتە خوارەوە، وەک ئەوەی لە زمان کەوتبێت، بەخۆشی نازانێت چۆن خۆی لێ کرد بەعاشق، هاوشێوەی ئەم کوڕەی دراوسێیان دەستەکانی خستە نێو پەنجە نەرم و باریک و گەرمەکانی و دەستێکی بەنێو قژی داهێنا، هەستی بەقورساییەک لەسەر سینەی دەکرد، چێژێکی بێ کۆتایی بەدەمارەکانیدا هاتوچۆیان دەکرد، لەدەریایەکی قووڵی پڕ ئارەزوو، دڵی هەستی بەئارلمی دەرکرد، ڕۆحی وەکو باڵندەیەکی هەڵاتووی نێو قەفەزەی سینگی، دەیوست لە شەقەی باڵ بدات و دەربچێت، بەچریکەی گوێی ئاسمان کەڕ بکات.

هەر لەو ساتە خەبەری بۆوە، لاشەی گەرم و دامێنی تەڕ و ئارەقە ناوچەوانی گرتبوو، بەخێرایی لە جێگەکەی ڕابوو، بەرەو سەربان هەنگاوی نا، بینی ئەستێرەکە لە ئاوابوونە، هەناسەیەکی هەڵکێشا و سەری شۆڕ کردەوە نامەیەکی ڕەنگ زەردی بینی، خێرا نامەکەی هەڵپچڕی و لەبەر تیشکی گڵۆپێکی کز خوێندیەوە، لێی نووسرابوو: گیانەکەم دوێنێ بەماڵەوە کۆچمان کرد تۆ درەنگ گەیشتیە جێگای ژوان.

## شـێت

سەروقژێکی تێک ئاڵۆزکاوی ماشوبرنج، کراسێکی چڵکن و شرواڵێکی دڕاو، لەسەر هەندێک مقەوای سەر شۆستەی شەقامەکان لێی پاڵکەوتبوو، ژاوەژاوی بازاڕ و دەنگی ئۆتۆمبێل و هاتووچۆکەران لەم ناوە دونیایان تەنی بوو، هەر پێڵوی چاوەکانی کەوتنە سەریەک خۆی لەماڵێکی خۆش و فەرشکراوی گەرموگوڕ بینیەوە منداڵەکانی لەبەر دەمی دەهاتن و دەچوون، ژنەکەی بەزەردەخەنەوە دەیگوت:

پیاوەکە ئەمڕۆ نیوەڕۆ خواردنێکی بەلەزەتت بۆ ئامادە دەکەم، بەڵام پێویستە پێداویستیی کوڕە گەورەکەمان بۆ ژنهێنانەکەی ئامادە بکەی، ئەگەر چوویە دەرەوە لەگەڵ

دەستی خۆت ئەم بوتڵە غازە بەتاڵە پڕ بکەوە، کچە جوانکیلەکەشمان لە باخچەی ساوایانە بیهێنەوە، ئەگەر کاتت هەبوو عیادەیەکی دکتۆرم بۆ وەربگریت، چونکە ئازارێکی زۆر لە پشتم هەیە، هێشتە قسەکانی خۆی تەواو نەکرد بوو، بەهێز لەدەرگا درا غەڵبەغەڵب و دەنگەدەنگ دەهات یەکێک بەدەنگێکی گڕ هاواری کرد براگەورایەتی ئاوەها دەبێت، ئەویش گورج لەجێگەکەی ڕاپەڕی و مراد خانیەکەی لەبەر کردوو، پشتێنی بەست و جامانیەکی سپی گوڵێنک گەورەی لەسەرنا فەرمووی لێکردن، دەنگی کابرا هەردەهات و دەیگوت: هەستە کاکە بابڕۆین ئەم دوو دراوسێیەمان شەڕیان کردووە بەڵکو ئاشتیان بکەینەوە دەڵێن: مامۆستای مزگەوتەکەمان نەخۆشە سەرێکی لێ بدەین، دوایش سەردانێکی دائیرەی کارەبا بکەین، چونکە محاویلەی گەڕەکەکەمان سووتاوە و بێ کارەباین، لەوکاتە گەیشتنە نزیکی و یەکێک شانی گرتبوو ڕایدەتەکاند، لەسەر یەک دەیگوت:

دەی کاکە براگەورایەتی وانابێت، دەی برا هەڵسە، کاتێک زانی شەقێکی وای بەرکەوت، لەتاوان لەخەوەکەی ڕاپەڕی. بینی کارمەندێکی شارەوانییە شەقی تێهەڵدەدات و دەیەوێت شەقامەکە پاک بکاتەوە، ماوەیەک بێ دەنگ بوو، بۆ چەند چرکەیەک سەرەشێواوەکەی خوراند و پاشان شێتانە دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و گوتی: خوایە لەتۆ بەزیاد بێت خۆ ئەوە خەون بوو ڕاستی نەبوو.

## پەیامەکە

لەوساتە، لە باخچەکە لەسەر جۆلانەیەک دانیشتبوو، پەرداخێک شەربەتی بەدەستەوەیە، لەگەڵ مانگ گفتوگۆی دەکرد، ئەم شەوە ئاهەنگێکی بچووک دەگەڕێ، بەڵام گەورە لەشادی و خۆشی، نازانم چۆن بوو بیری گەڕایەوە بۆ ئەو ڕۆژەی، کە هاوڕێکەی ڕایسپاردبوو بچێت بۆ داوای ئەو کچەی خۆشی دەوێت و ڕۆژانی زانکۆیان بەیەکەوە گوزەراندبوو، ڕۆژ نەبوو هەردووکیان سەدان گەڵای وەریوی ژێر دارەکان نەشێلن و نیگا پەنهانییەکانیان لەگەڵ یەک نەگۆڕنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هیچیان توانای درکاندنی ڕازەکانیان لەبەرانبەر یەکدی نەبووە.

هەر ئەو ڕۆژە خۆی ئامادەکرد، بڕواتە ماڵەکەیان و داوای هاوڕێیەکەی بگەیەنێتە کچەکە، قەدەر وایکرد خۆی لە نەخۆشخانە ببینێتەوە بەهۆی پێداکێشانی ئۆتۆمبێلەوە، هەر لە بە ئاگاهاتنەوەی لەسەر جێگەکەی خۆی بەرزبۆوە و بەبێ پرس کردن بەکارمەندەکان، خۆی لە نەخۆشخانەکە دەرباز کرد و لەسەر شەقامەکە تاکسیەیەکی ڕاگرت، گەیشتە کۆڵانی یەکەم، دووەم، لە سێیەم کۆڵان لایدا، بەڵام ڕێگەکە داخرابوو قەرەباڵغییەکی زۆر هەبوو، هەرچۆنێک بوو خۆی گەیاندە دەرگای ماڵەکەیان و ویستی زەنگ لێ بدات، مێرد منداڵێک بەسینیەک شیرنییەوە ڕێگەی پێگرت، بەدەنگێکی پڕ شادیەوە فەرمووی لێ کرد، کە شیرینی بخوات، ئەویش هەر لە خۆیەوە گوتی:

کچی خاڵم شوو دەکات. ئەویش نوقڵێکی هەڵگرت، هەرچەندە نەیتوانی شیرنیەکە قووت بدات، کۆکەیەکی توندی گرت و بەهەمان ڕێگەی خۆی، بەخێرایی گەڕایەوە و لەوە گەیشت، کە کار لەکار ترازاوە.

سالان هات و چوو، کچە بەرەو ئەوروپا چوو، کوڕەش لێرە هاوسەرگیریی کرد. ژیان هەمووی دووبارەیە، هاوڕێیەکەی هەر زوو هاوسەرگیریەکەی بەکۆتا هێنابوو، نیازی ڕۆیشتنی هەبوو بۆ دەرەوەی وڵات، دووساڵێک پێش ئێستە ڕۆژێکیان لە خەوێکی قووڵ دابوو، زەنگی تەلەفۆنەکەی بە خەبەری هێنا، هەڵی گرت و فەرمووی لێ کرد دەنگی ژنێک بوو سڵاوی کرد، ژمارەی تەلەفۆنەکەی لا نەناسراو بوو، ئەویش گوتی: فەرموو خانم ئێوە ناناسم پێکەنینێکی کرد و گوتی:

کێژان ئێمەتان لەبیر چۆوە ئەی من هاوڕێتان نەبووم لەزانکۆ؟

زوو تێگەیشت ئەوە دەنگی کچە هاوڕێکەی زانکۆیە، لە فڕۆکەخانەیە و چاوەڕێ دەکات بیگەیێنێتەوە ماڵەوە، لەڕێگە قسەکانی دەست پێکرد و گوتی: لە پیاوەکەم جیابوومەتەوە و ژیانی دەرەوەم بەدڵ نییە، بۆیە حەزدەکەم لەوڵاتی خۆم بژیم. ئەو هێشتە قسەکانی تەواو نەکردبوو. موبایلەکەی دەرهێناو تەلەفۆنێکی لەگەڵ هاوڕێیەکەی کرد و پێی گوت: دەمەوێ بەزووترین کات بتبینم ئەویش زۆری لێکرد، کە پێی بڵێ چی بووە، ئەویش بەناچاریی پێی گوت: لەگەڵ خۆشەویستە کۆنەکەتم، هەڵوێستی هەردووکیانی باس کرد، ئەوەی ڕوون کردەوە، کە کاتی خۆی چی وای کرد ئەم پەیامە نەگات، هەردووکیان ڕەزامەندییان نواند کاتەکان خێرا تێپەڕین، ساڵێک بەیەکەوە بوون، ئێستەش لەساڵی دووەم، لەم ڕۆژەدا ئاهەنگی ڕۆژی لەدایکبوونی یەکەم منداڵیان دەگێڕن، لەگەڵ ئەو بیرکردنەوەیەدا مانگەکەش هێواش، هێواش بەرەو ئاوابوون دەچوو لە دەنگی هاوڕێیەکەم بەئاگاهات و گوتی: وەرە کاکە تۆش وێنەیەکمان لەگەڵدا بگرە.

# دواتر پێتان دەڵێم

موحسین ئاوارە

(١)
نێو تونێلەکە، تاریک تاریک
دووراودوور لە دەر تونێلدا
کونیلکەیەکی بچووک بچووک دیار بوو
ڕووناکییەکەی لاواز، باریک باریک
چەند لێی نزیک دەبوومەوە
لاوازییەکەی قەڵەوتر دەبوو
لاوازییەکەی کەڵەگەتتر دەبوو
گەورەتر و گەورەتر
لە کۆتایی تونێلەکەدا
شتێکی نامۆ نەبوو
منداڵێک بە گەورەیی لە دایک بێت
لە ماڵ دابڕا بێ
بە ڕۆشنای کوڕی ڕۆشنا ناو نرا بێ
(پێشمەرگە)

(٢)
ئەو کەسەی لە سەر پەیژەکانەوە
لە بەسەرکەوتن و هاتنە خوارەوەیدا
پەلە بکات
(ج) ئامادەیە پێشوازی لێ بکات
(سەرانگرێ)

(٣)
هەتا زیاتر تەڕ دەکرێ لە شۆریندا
هەر لە بچووک بوونەوەیە
دواتر و دواتر
گلۆتێکی بچووک بچووکە و فڕێدرایە
(سابوون)

(٤)
بەرگ و ڕەنگ، قاوەی و قژ ئاڵۆز
لە ناواخن و کرۆکیدا سپی سپی
گلێرەیەکی بە تام و چێژ
(پیفۆک)

(٥)
بانگ و سەداکەی
دانە دانە بە داوە تیشکی خۆر وەدەکا
وەک تەزرەیەکی درشت
بەسەر هەموو ئاوایدا، ورد و درشت



دابەش دەکا
مژدە بەخشێکە، بە ڕزگار بوونی خۆر
لە ژێر چنگی تاریکیدا
مانگیش بە ئاگا دێنێ
خەوتووە لەنێو کانیدا
(کەڵەشێر)

(٦)

بۆ ناو قەیسەری و عەتار و پیشەوەرانی بازاڕ
لە قەڵاتەوە دەهاتە خوار
دەست بە سەفەرتاس و قابلەمەی بریقەدار
شیو شلەی گەرمی تیا
لە بەر دەمیانی دادەنا
(شاگرد)

(٧)

شەڕ و خێر، لە یەک کارگەدا کار دەکەن
پێکەوە هاوپیشەن و بەڕێوەی دەبەن
ئەو ڕۆژە لە سەر شاشەی تەلەفزیۆندا
بە گریانێکی ڕاستەقینە
کانیەکی سۆزدار لە ناخەوە هەڵدەقوڵا
فرمێسکەکانی وەک ئەستێرە دادەڕژا
من دەزانم نەک هەر سەری من
سەری زۆرانی وەک سەری من
تای دەستاڕ ئاسا دەیسووڕاند
ئای لە گریانی بێچارەیەک
ئای بۆ ڕێچکەیەک و دەرچەیەک
کەماڵەکەیان لێ تێکدا
لە کوردستان و نیشتەجێکەی خۆیدا دەربەدەر کرا
(کوردێک)

(٨)

لە گەڵ ئاوێنەدا
زۆر خراپ بەینمان تێکچووە
تا ئاستێک بڵێم
دوژمنایەتیەک لە نێوانماندا بەرپا بووە
خۆزیا ئەو ئاوێنە نەعلەتیە هەر نەبووبا
منیش ئاوا خۆم لە نێویا نەدیبا
(بە ساڵاچووێک)

# چەند تەنزە شیعرێکی ئەمریکایی

شیعری: شیل سیلڤەرستاین - لە فارسییەوە: کەریم سۆفی

## دنیا ڕووناک بکەوە

دنیا ڕووناک بکەوە
تامێک بە ژیان ببەخشە
تا بزانیت عەشق
تا چەند دەتوانێت ئازادت بکات
دنیا ڕووناک بکەوە
من ببینە!
تەماشاش کە خۆشەویستی
تا چەند دەتوانێت دڵخۆشت بکات
تۆ دەڵێیت باڵم لێ ڕواوە
ئیدی بە باڵەکانت فێریان کە با بفڕن
بێ ئەوەی بپرسن بۆ؟
بە باڵەکانت فێریان کە بژین
دۆستیان هەبێت
دنیا ڕووناک بکەوە
تا دۆستێک دڵخۆش بکەیت
رابە، تەماشا کە!
بە چاوەکانت دنیا ڕووناک بکەوە!

## کەسێک دەتدۆزێتەوە

هەرچەندی خۆت لە خۆرەتاو بشێرێتەوە
هەرچەندی پەنجەرەکان دابخەیت
هەرچەندی خۆت لە پەنا دیوار بنێیت
هەرچەندی چاوەکانت بنوقێنی
لە کۆتاییدا کەسێک دەتدۆزێتەوە
هەرچەندی ناوی خەڵکی
لە دەفتەرت ڕەش کەیتەوە
هەرچەندی مێلی تەلیفۆن بپچڕێنی

هەرچەندی وێنە کۆنەکان بدڕێنی
لە کۆتاییدا کەسێک پەیدا دەبێت
کە بتدۆزێتەوە!
لە پشت پەنجەرەیەکەوە،
یان لەنێو کۆلانێکدا
یان گەچراو لەنێو وێنەیەکی کۆندا
لە کۆتاییدا کەسێک دەتدۆزێتەوە.

## دەبوو زانیبام

دەبوو زانیبام
دایکم کلیلی بەفرگرەکە لە کوێدا دەنێ
بەڵام نەمدەزانی!
دەبوو زانیبام
باوکم حەبەکانی لە کوێدا دەنێ
بەڵام نەمدەزانی!
دەبوو زانیبام
کاتێک خوشکم ون بوو
لە کوێی بدۆزمەوە
بەڵام نەمدەزانی!
دەبوو زانیبام
دڵم لە کوێ و بە چ کەسێک ببەخشم!
بەڵام نەمدەزانی!
بۆیە دەرگای بەفرگریماڵەوەمان
هەمیشە بە داخراوی مایەوە!
من گەورە بووم
باوکیشم حەبەکانی خۆی نەدۆزییەوە و مرد
خوشکیشم ئیدی نەدۆزرایەوە!
منیش هەرگیز ... هەرگیز
عاشق نەبووم

## ئێمە یەکتریمان خۆش دەوێت

*من خۆشحاڵم کە خۆمم*
*چونکە من لە تۆ ناچم*
*تۆش خۆشحاڵ بە کە خۆتی*
*چونکە هەرگیز لە من ناچیت*
*لەبەرئەوەیە کە دەتوانین*
*لەگەڵ یەکتری دۆست بین*
*چەندە خۆشە دۆستایەتی*
*دوو ئادەمیزادی وەک ئێمە*
*کە هەرگیز لەیەک ناچن*
*بەڵام یەکتریان خۆش دەوێت*

## من و تۆ

*دەزانم تۆ چیت*
*تۆ دەریایەکی هەڵچوویت*
*تۆش بزانە من چیم؟*
*من باڵندەیەکی دەریاییم*
*دەبینی!*
*زۆر لە یەکترییەوە دوورنین*

**سەرچاوە:**
بیست و پنج دەقیقە مهلت، شل سیلوراستاین، ترجمە: چیستایثربی، چاپ دوەم، بهار ١٣٨٤، خدمات چاپ: معراج

# ڕۆشنبیریی گشتیی

- ***کورد و میگافیلی***

موحسین عوسمان

- ***ئاراستە نوێیەکان لە هونەر و جوانیدا (بەشی چوارەم)***

د. راویة عبدالمنعم عباس   و: سەرتیپ ئاغا واحد بەگ



# کورد و میکاڤیلی

موحسین عوسمان



خواندنێن ئەرێنی و نەرێنی
زیرەکیا هەر فەروەرەکی، ژ کەسێن دەردورێن وی دیار دبیت/ میکاڤیلی

ب ڕاستی، ئەم کورد دکارین مفای ژ هەردوو ئالێن ئەرێنی و نەرێنێن میکاڤیلی وەرگرین. نەمازە تێهزرکرنا کریارێن سیاسی ل نک مە، گرێدایی هندەک تێگەهشتنا نێگاتیڤا میکاڤیلی‌نە، کو سیاسەت کریارەکا ڤەدەری «ئێتیک و بهایە». تەنێ ئارمانجا میری بێ «بها و پرنسیپ»، بەردەوامیا دەسەلاتێ ب هەر ڕێکەکا هەبیتە. ئەڤ هزرێن نێگاتیڤێن میکاڤیلی، وەک پرۆسێسا سیاسی ل نک مە ب ئاوایەکێ زەلال بەرچاڤ دبن، چونکو ڕێکێن گەهاندنا بها و پرنسیپێن ئیرۆ ل نک مە هەی، هەمان بها و پرنسیپێن ئالێ ڕەشێ دەرهاڤێژێن ئەقلێ میکاڤیلی‌نە. لەورا هەر کەسێ بڤێت ئەقلیەتا ڕۆژهلاتا ناڤین بخوینیت، دکاریت گەلەک مفای ژ تیۆر و میتۆدێ میکاڤیلی/ ١٤٦٩ – ١٥٢٧ وەرگریت، چونکو ڕەوشا مە گەلەک نێزیکی لایێ تاریێ هشمەندی و ئەقلانیەتا میکاڤیلیە.

ب گشتی، نێرین و ڕێکخستنێن سیاسی بۆ پێکۆلا تێگەهشتن و گوهەرینا دوورهێلیە، نەمازە ژێ ڕەوشا مە، کو گەلەک ماسک هلگرتینە، لەورا ڕێکێ ل بەر ڕاڤەکرنێن ب میتۆدێ میکاڤیلی دگریت. ڕاستە ئیرۆ گەلەک جورێن ماسکان ل نک مە دهێنە بکارئینان، کو هندەک ژ فۆرمێ میتۆدێ میکاڤیلی ڤەدشێرن، بەلێ پا کەسێ ب ئاوایەکێ نژیارگەری ڤان تێکستێن سیاسی بخوینیت، دێ سەرێن داڤێن وەکهەڤیا تەڤنێ میکاڤیلی دگەل مە بۆ خویا بیت. خواندنا تێکستێن کاودانێن مە یێن سیاسی و ب تایبەتی ژێ د ڤان دەمێن دیرۆکی دا، خوە ب ئاوایەکێ خوەسەر دگەل ڤان هزرێن میکاڤیلی هەڤبەر دکەن. گەلەک ژ پارادۆکسێن ئەڤ جورە تێکستە پێ دهێنە بارکرن، نەبەس تەنێ گەنگەشا پارادۆکسا هزرێن ڕەخکێێن ڤێ تێکستێ دگریت، بەلکو تێگەهێن سەنترالی یێن ئەڤ کۆنتێکستە ـ Kontext ل سەر دهێتە ئاڤاکرن، دگریت. کووراتیا ڤان پارادۆکسان، پرسگرێکێن ڕاستەقینەیێن تێهزرکرن و گەریانێ وەک فۆرمەکێ تێگەهشتن و ڕاڤەکرنێ بەرچاڤ دکەت. ئەڤ جورە خواندنە، گەریانا میتۆدەکێ جودایێ سەرەدەریکرنا دگەل ڕەوشا مەیە، یاکو پێکۆلەکا دی‌یە بۆ تێگەهشتنا کاودانێن مە. ئەڤ نێرینێن دوورهێلێن میکاڤیلی وەکر، گەلەک ژ فیلۆسۆف و هزرمەندان فەلسەفا میکاڤیلی وەک نێرینەکا میتۆدێ هزرێن سیاسی، ژ تێهزرکرنێ ڕووت بۆ زانستێ، کو بوویەرێن ڕیالیستی ل سەر دروونـن، ئاڤا بکەت. مە ب هشمەندی، سەرەدەری دگەل شێوێ گوهەرینێن خواندنا کریارێن سیاسی نەکریە، داکو بیاڤێ د ناڤبەرا حەز و دوورهێلی دا ژێکجودا بکەین. ژ بەر نەبوونا کۆنتێکستێن دیرۆکی، خواندن و ڕاڤەیا تێکستێن دەڤەرێ، ڤەلس و هەژار بەرچاڤ دبن.

دیارە شوپ و خەباتا ئالێ پۆزیتیڤێ میکاڤیلی ڕێکا تیۆرێن سیاسی، کو ب «گرێبەستا جڤاکی» دهێتە بناڤکرن، خوەشکریە. لەورا میکاڤیلی هەموو ساخلەتێن تیۆرزانەکێ سیاسی/ لیبرالی تێدا هەنە.

> ***ڕاستە میکاڤیلی، دەسەلاتێ د ناڤبەرا هێز «شێر» و فلێبازی «رووڤی» دا پارڤە دکەت، بەلێ پا نیرۆ ژێ سیاسەت د ناڤبەرا «هێز و هزر» دا دهێتەکرن***

ـ پەرتووکا «میر ـ The Prince/ » دا، سێ ئەلەمێنت «میر، دەسەلات و هێزا گەل» بەرچاڤ دبن، کو ئەڤ هەرسێکە چاڤدێریا هەڤدوو دکەن. هەروها مێکاڤیلی د پەرتووکا خوە «میر» دا، دبێژیت: «رەهندەکێ بەرێن د ناڤبەرا مرۆڤ چەوا دژیت و دڤێت چەوا بژیت دا هەیە»، کو بیاڤێ د ناڤبەرا دوورهێل و یوتۆپیا دا ژێکجودا دکەت. ئەڤە ژی ئالێ دی یێ ئەرێنی یێ مێکاڤیلی، کو رێکا هزرێن لیبرالی بۆ سێکولارکرنا رەوشت و پرۆژێ سیاسی، وەک بهایەکێ سازۆمەندێ پرۆسێسا جڤاکی، دەشت دکەت. هەروها ل ئورۆپا ژی، نەمازە ل چاخێن نوو دەولەت/ مێکاڤیلی، بوویە بنگەهێ سێکولار و شۆرشێن سیاسی، کو ل سەر بنگەهێ رێنیسانسێ ئاڤا ببوو.

راستە دیرۆکا دەولەتێ، دوو قووناغ «ئۆلی و گەردوونی» برینە، بەلێ پا ل سەدێ شازدێ سیاسەت ژ «رەوشت و ئۆلی» هاتە جوداکرن(*) ب تایبەتی ژی، پشتی مێکاڤیلی «دەولەت بلندی سەر کەس، قانوون، رەوشت و ئۆلی کرین»١ بنێرە مێکاڤیلی رەوشت گرێدایی/ دووری سیاسەتێ دکەت، بەلێ ئەم رەوشتێ گرێدایی ئۆلی دکەین، چونکو هشمەندێ و دەولەتێن دەڤەرێ، ل سەر ئەقلیەتا فیودالی و ئۆلی درستبووینە. ئەڤ شۆرشە بووینە ستوونا سەرەکیا دەولەتێ، ب تایبەتی پشتی «مێکاڤیلی ل چاخێ خوە دەسەلاتا کەنیسێ و دەولەتێ ژێکجوداکرین و پێکۆلا دانانا پرۆژەکێ نوو کری»٢ ب ڤێ گۆتن و مەبەستێ، مێکاڤیلی دەرگەهەکێ فرەهـ ل بەر تیۆرزانێن بیاڤێن ئۆلی و سیاسیێن دژبەرێن خوە، هەر ژ هۆبز ـ Hobbes و تا دگەهیتە ڤیبەر ـ Weber ڤەکر. هەروها چاخێ مێکاڤیلی سیاسەت ژ رەوشتی و ئۆلی دوورئێخستی، هنگی بەرەیەکێ مەزن ب رێکا ئۆلدار و کەڤنەشۆپان دژی وی هاتە درستکرن، تاکو وێ رادێ «مێکاڤیلی د هزرێن خەلکێ دا، وەک هەڤجووتێ ئبلیسی دهاتە نیاسین»٣ ژ بەر هندێ ژی، «ب بریارا کەنیسا کاتۆلیکی/ ١٥٥٩، پەرتووکێن مێکاڤیلی هاتنە سۆتن و قەدغەکرن»٤ ب ڤان ئەگەران، مێکاڤیلی ل سەردەمێ خوە باش نەهاتبوو خواندن، لەورا ژی، نێرینێن نێگاتیڤ ل سەر هاتنە بلاڤکرن، هەروەکو نموونە شەکسپیر د شانۆگەریا خوە «ژنێن خوەشێن وندسۆر/ ١٦٠٢» دا دبێژیت: «چەوا، ما ئەز خاپینکەرم؟... ما خوەنە ئەز مێکاڤیلی مە؟»٥

راستە مێکاڤیلی، دەسەلاتێ د ناڤبەرا هێز «شێر» و فلێبازی «رووڤی» دا پارڤە دکەت، بەلێ پا ئێرۆ ژی سیاسەت د ناڤبەرا «هێز و هزر» دا دهێتەکرن. هەروەکو دەربازبووی، پرانی مێکاڤیلی وەک زەلامێ میرێ ستەمکارێ بێ بها و پرنسیپ، کو تەنێ ئارمانجا وی بەردەوامیا دەسەلاتێیە، ناس دکەن. لەورا مێکاڤیلی د رێکا پەرتووکا خوە «میر» دا دبێژیت، فۆرمێ سیستەمێن میراتگری فەرووەرێن رادەستی کەسەکی دکەن، لێ سیستەمێ کۆماری ئازادی بەرچاڤ دکەت، بەلێ دیارە مێکاڤیلی سیستەمێ دووهەم هلبژارت. ب ڤێ تێگەهشتنێ، داخویانیێن مێکاڤیلی ژ هەموو تێکستێن سیاسیێن دی، پتر کەتینە بەر ئاراندن و گەنگەشێ. هەروها پتر هەبوونا خوە یا د تێهزرکرنێن کریارێن سیاسی و ڤەدەرکرن، ژ مۆرال و بهای دا هەیە.

ل گۆر هندەک ژێدەرێن دیرۆکێ، مێکاڤیلی د پەرتووکا خوە «میر/ بەشێ چواردێ/ هەژدێ» دا گۆتنا «هەموو رێک دچنە رۆما»(*) گوهەریە «ئارمانج/ مەبەست، رێکێ ددەنە ئالاڤان»(*) چونکو ل نک مێکاڤیلی پرسا نەتەوەیی، دەولەتا نەتەوەیی و یەکگرتنا ئیتالیا هندێ دئینیت، مرۆڤ هەموو رێکان بکاربینیت. مە نکاریە خوە ل پرسیار و تێگەهشتنا مێکاڤیلی یا فەلسەفا سیاسی، ب ئاوایێ بەرسڤا

## ئەم کورد دکارین مفای ژ هەردوو نالێن نەرێنی و ئەرێنێن مێکاڤیلی وەرگرین

پرسیارا «چەوا نوکە بژین؟» نەک «چەوا دڤێت بژین؟»٦ بکەینە خوەدان. ب ڤێ ئاخێ و ل گۆر تەڤ پیڤەرێن سیاسی و جڤاکی، ژیانەکا بێ هزر بیت، دێ د رەوشەکا «بریڤەبرنەکا کائۆس»٧ دا دەرباز دبیت. ئێدی ئەگەر یەک ژ ژێدەرێن مە یێن سیاسەت و پارتاتیێ مێکاڤیلی بیت، پا مە هێشتا پرۆژێ مێکاڤیلی ب خوە ژی، پتر ژ هەڤۆکا «ئارمانج/ مەبەست رێکێ ددەتە ئالاڤان» پتر ناسنەکریە، لێ گرینگی و دلسۆژیا مێکاڤیلی و گرامشی بۆ ئیتالیا/ باشووری ئیتالیا وەکهەڤە، کو ئیتالیا باکور/ پیشەسازی و باشوور/ جوتوکیلی. ل سەر ڤێ یەکێ، ناڤبری میرێ خوە ب سێ خالان شیرەت دکەت: گرینگیدان ب بازاری فلۆرەنسا، بەرفرەهکرنا دەسەلاتا خوە تا تەڤ ئیتالیا دکەیە یەک و فۆرمێ فەرووەرێ. ب ڤێ یەکێ، مێکاڤلی و ب تایبەتی ژی ل سەدێ هەژدێ پتر هاتە نیاسین، لەورا «مێکاڤیلی، ب پێغەمبەرێ یەکگرتنا ئیتالیا هاتە بناڤکرن»٨ دیسان مێکاڤیلی بۆ شێوێ فەرووەرێ دبێژتە میرێ خوە، گرینگیێ ب گەل، لەشکەری بدە و ئاگەهـ ژ هێزێن دەرڤە

به. سەربارێ میکاڤیلی میرێ خوە، ب چوار خالان شیرەت دکەت:

ل باژارێ فلورەنسا خوەجهـ ببە.

کارێ بۆ پشتگریا خەلکی بکە.

شوورهان ئاڤا نەکە.

خەلکێ خوە چەکدار بکە، داکو ببنە لەشکر٩

ب ڤێ گرینگیێ، هەرچەندە دەولەمەندێ و فرەئالیا فەلسەفا هێگێل گەهشتبوو ئاستەکێ هندێ بلند، ب «ناپۆلیۆنێ هزرێ»١٠ بهێتە بناڤکرن، بەلێ دیسان گرینگیا میکاڤیلی تا وێ رادێ بوو، کو کەسەکێ مینا «هێگێل خەون ددیتن، ببیتە میکاڤیلیێ سەردەمێ خوە»١١ هەروها لویجی رۆسو ژێ، میکاڤیلی ب هونەرمەندێ سیاسی ب ناڤ دکەت. ئها هوسا هەلوەستێ فەلسەفی/ سیاسی یێ میکاڤیلی هەبوونەکا بەرچاڤ هەیە، چونکو ئیرۆ ئەو بها و پرنسیپێن میکاڤیلی سەردەستێ جیهانێ بووینە، لەورا پاول ژانێت ـ Paul Janet دبێژیت: «میکاڤیلی ب خوە، دامەزرێنەرێ زانستێ سیاسەتا نوویە»١٢ سەربارێ میکاڤیلی بنگەهـ و دانیشانەک، د کۆنتێکستا دیرۆکی و چاخێ مۆدێرنیزما ئوورۆپی دا دانا. لەورا فەلسەفا میکاڤیلی، هەڤپارێ گوهەرینا مۆدێرنیزما ل ئورۆپا روودایە. میکاڤیلی د هێلا سیاسی دا، بەرێ بنیاتێ زانستێ سیاسەتا هەڤچەرخ دانایە. لەورا ژێ ل لەندەن/ ٢٠١٣، دیدارەکا تایبەت ل سەر گرینگیا فەلسەفا میکاڤیلی و نەمازە پەرتووکا میر هاتەکرن. مرۆڤ دکاریت گرینگیا هزر و فەلسەفا میکاڤیلی ل سەر گەل، د چەند خالان دا کۆمبکەت:

ئارمانجێن گەلی، گەلەک ژ ئارمانجێن میران گراڤیترن.

شۆرشێن گەلێن ئازاد، ب قەتلازێ زیانێ دگەهینە ئازادیێ.

حـەزا گـەل، گرەنتیەکا مسۆگەرا بـەردەوامیـا میرێ، د پۆستێ وێ دایە.

حەزا گەل، باشترین پارێزڤانێ و چارەسەریا مەترسیێن کۆمپلۆیان ل سەر میرێنە.

گەل، ماتریالەکێ گرەنتیێ، کو میر پالپشتیێ بۆ پێکئانینا لەشکرەکێ نەتەوەیی، ل سەر بکەت١٣

گەلۆ ئەم دکارین پرۆسێسا خوە یا سیاسی، ژ هزرێن ئۆلی ڤالا بکەین؟ دیارە ئەم چەوا ئیرۆ هزر دکەین، جاران ل رۆژئاڤا ژێ هەمان هزر دکر، کو «سیاسەت و تیۆلۆگی» یەکن، تاکو «میکاڤیلی، بۆدان و هۆبز» گەردوونبوون تەڤلی سیاسەتێ کرین. هنگی خویاکر، کو کەشێ سیاسی دووری کەشێ پیرۆزێ ئۆلیە. ئێدی ب سالێن درێژ و کەڤنار، دەسەلاتا تیۆکرات و ئۆتوکراتی، فەروەری و باندۆر ل سەر خەلکێ دەڤەرێ هەبووینە. ب ئەنجام، پرۆسێسا سیاسەتێ ل رۆژئاڤا سێکولار بەرهەمئینا و یا ئۆلی ل رۆژهلاتا ناڤین گرۆپێن جیهادی و توندرەو بەرهەمئینان. مـرۆڤ نکاریت خواندنا دامـەزراندنـا ئێپیستیمۆلۆگیا سیاسیا نوو، بێی ڤەگەریتە نێرینێن میکاڤیلی بکەت. ئەڤە ل گۆر کۆنتێکستێن مێتۆدی، مرۆڤی راستی پرسەکێ دکەت: گەلۆ «چەوا میکاڤیلی بخوینین؟»١٤ ئەرێ تەنێ ب رێکا پەرتووکا میر یان ژێ تەڤایا بەرهەمێن وێ بخوینین؟!

هەڤلێر، ٢٠٢٣/٩/٣

---

*) راستە هەر ژ کەڤندا، سیاسەت وەک تێگەهـ هونەرێ دەبارەکرنا کاروبارێن گشتێ بوویە، بەلێ پا سیاسەت وەک کریار بوویە دوو بەش، بەرێ میکاڤیلی سیاسەت گرێدایێ رەوشتێ «پلاتۆن و ئەرستۆ» کریە. پاش پشتێ هنگێ، میکاڤیلی سیاسەت ژ ئۆلێ و رەوشـێ ڤەدەرکریە. دیارە ئەڤە ژێ گشت، ژ بۆ رێکخستنا جڤاکان بووینە.

١) خالد شيات ـ من التجزئة إلى الوحدة/ قراءة في التجارب الغربية و العربية لتأسيس نظرية بناء الوحدة ـ مركز نماء للبحوث و الدراسات، ط١، بيروت ـ لبنان، ٢٠١٤ ص ٣٢.

٢ ) فتحي التريكي و د. رشيدة التريكي ـ فلسفة الحداثة ـ منشورات مركز الإنماء القومي، بيروت ـ لبنان، ١٩٩٢ ص ٦٢.

٣ ) بن حليلم شوقي ـ فلسفة الاخلاق (التسامح و المواطنة)/ القيم الاخلاقية و السياسية عند ميكيافيلي ـ مذكرة لنيل شهادة الماجستير في الفلسفة، جامعة وهران، كلية العلوم الاجتماعية، السنة الجامعية: ٢٠١٤ ـ ٢٠١٥ الجزائر ص١٤٤.

٤ ) محمد وقيع الله أحمد ـ مدخل الى الفلسفة السياسية ـ دار الفكر، ط١، دمشق، ٢٠١٠ ص١٤٦.

٥ ) بن حليلم شوقي. ژێدەرێ بەرێ، بپ٥٩.

*) راستە کورد دبێژن، هەموو رێک دچنە ئاشتێ، بەلێ پا گەلەک جاران ئەڤ گۆتنە ب نێگاتیڤ ژێ دهێتە بکارئانین!

*) راستە، ئەڤ هەڤۆکە ژ مەبەست و هزرا میکاڤیلی هاتیە کورتکرن، لێ وێ ب خوە ئەڤ هەڤۆکە نەگۆتیە!

٦ ) د. التجاني عبدالقادر حامد ـ مقدمة في فلسفة السياسة ـ مركز ابن خلدون ـ جامعة قطر، ط١، ٢٠١٩ ص٣٤.

٧ ) ماهر حنين ـ سوسيولوجيا الهامش في زمن كورونا/ الخوف، الهشاشة و الانتظارات ـ المنتدى التونسي للحقوق الاقتصادية و الاجتماعية، تونس، ٢٠٢٠ ص٩٥.

٨ ) بن حليلم شوقي. ژێدەرێ بەرێ، بپ١٥٢.

٩ ) د. الطيب بوعزة ـ نقد الليبرالية ـ مجلة البيان، ط١، الرياض، ٢٠٠٩ ص٤٦.

١٠ ) أحمد دلباني ـ سفر الخروج/ اختراق السبات الايديولوجي في الثقافة العربية/ ادونيس، ادوارد سعيد، علي حرب و محمد اركون ـ دار التكوين، للتاليف و الترجمة و النشر، ط١، دمشق ـ سورية، ٢٠١٠ ص٨٣.

١١ ) أرنست كاسيرر ـ الدولة و الاسطورة ـ ترجمة: د. أحمد حمدي محمود، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة ـ مصر، ١٩٧٥ ص١٦٩.

١٢ ) د. الطيب بوعزة/ ٢٠٠٩. ژێدەرێ بەرێ، بپ٤١.

١٣ ) مؤيد جبير محمود ـ الفكر السياسي الغربي الحديث و المعاصر ـ جامعة الانبار، كلية القانون و السياسة، قسم العلوم السياسية، أنبار ـ العراق، ٢٠١٩ ص١٧/ ١٨.

١٤ ) د. الطيب بوعزة/ ٢٠٠٩. ژێدەرێ بەرێ، بپ٣٧.

بەشی چوارەم

# ئاراستە نوێیەکان لە هونەر و جوانیدا

نووسینی: د. راویة عبدالمنعم عباس
و. لە عەرەبییەوە: سەرتیپ ئاغا واحد بەگ

**مالبرانچ (١٦٣٨ - ١٧١٥)**



مالبرانچ بەیەکێک لە نووسەرە بەناوبانگەکانی سەدەی حەڤدەی پەخشانی فەرەنسیی دەژمێردرێت ئەمەش بەسە بۆ ڕوونکردنەوەی هۆگرییەکەی بۆ هونەر، نووسینە وێژەیی و ئایینییەکانی بە شێوازێکی داهێنەرانەی پەخشانیی دەربڕیوە، کە جیاواز بووە، ئەمەش بە گەواهیدانی لیبنتز، دیدرۆ و ڤۆڵتێر، کە بە ڕوونیی و زمان شیرینی شێواز و باشیی خستنەڕووی شارەزایی لە بابەتی ڕاستی و جوانییەکە دەیخوازێت.

ئەم بەهرەیەش لە نووسینی وێژەییدا یارمەتیداوە لە سەرکەوتنی پەرتووکی (گەڕان بەدوای ڕاستی) کە جیاوازە لەو ڕێگە هونەرییە بالآیەی خستنەڕوویی باشیی شێوازەکەی وەک چۆن بە حیکمەت و بەپیتیی ئەندێشەکەی جیادەبێتەوە، لیبنتز لەبارەی شێوازی مالبرانچ وتەیەک دەردەبڕێت و دەڵێت: گەیشتووەتە ئەو نهێنییەی بەهۆییەوە توانیویەتی شتە ئەبستراکتەکان بکاتە شتگەلێکی هەستیار و کاریگەر.

سکرتون دەربارەی مالبرانچ دەڵێت: مالبرانچ ئەو نهێنییەی دۆزیوەتەوە، کە نووسینەکانی

جیاواز کردووە. وێڕای ئەوەی هێزی بنەما ئەبستراکتەکانی لاواز نەکردووە، بەڵکو بە بۆیەی شیعر و جادوو گونجاندوویەتی، بەهەستەکانیشی ڕەوشتیی و ئایینی و گیانیی بالای دەوڵەمەندی دەکات، پاشان فێرگەکەی بەتەنیا نەبووەتە بابەتی هزریی، کە بۆ وتووێژی فەلسەفیی خرابێتەڕوو، بەڵکوو بووەتە هەڵقوڵاوی خاوەن هەموو توانایەک لە هەڵسوکەوت کردندا، لە گەڕانی بەدوای ڕاستیی ئەو ئۆقرە کۆتاییە بەختەوەرییە ڕەهایە دەبینینەوە.

بیرۆکە ویژەییەکانی مالبرانچ لە بەرهەمە گەورەکەیدا (گەڕان بەدوای ڕاستی) پەرشوبڵاوبوونەتەوە، بەجۆرێک تێیدا ئاراستەی ڕێژەیی لە دیدگایە جوانییەکەی بەدەر دەکەوێت، ئەو ئاراستەیەی جگە لەخۆی چەند فەیلەسووفێکی سەردەمەکەی وەک دیکارت و لیبنتز و چەندانی دیکە بەشدارییان تێیدا کردووە. میتافیزیکای مالبرانچ ئاراستەی ئایینی و ئاوەزیی دەدۆزێتەوە، کە لە وێنەی جوانیی دەدرەوشێتەوە، ناوەڕۆکی جوانی شاردراوە لە گیانی فێرگەکەی ئاشکرا دەبێت، وەک چۆن توێژینەوەکەی لەبارەی ڕەوشت، نەک هەر ئامرازێکە بۆ پەیوەندیکردن بە خوداوە، بەڵکو هەوڵێکیشە بۆ بەرزکردنەوەی لایەنی گیانی مرۆڤ لەپێناو هێنانەدی سیستەم و تەواویەتیی و ئاوەز.

لە لای مالبرانچ-ەوە واتاگەلێک، یاخود مۆدێلگەلێک، گیانی شتەکان لەخۆ دەگرێت لەنێوانیان پەیوەندییەکانی ڕادەی کامڵبوون جیادەکەینەوە.

یەکەمیان پەیوەندی بە زانستی تیۆرییەوە هەیە، بەڵام دووەمیان خۆی لەو سیستەمەی لە هەموو کردارەکاندا بۆ لای خودایی دەگەڕێتەوە دەنوێنێت، ئەویش لەسەر ئاوەزەکان باڵ دەکێشێت و بە یاسایەکی بەرایی، کە بە هەڵسەنگاندنی خۆشەویستی بۆ

> **لە میانەی خستنەڕووی ئەم دوو دەقە بڕی ئەو جوانییەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە لە فێرگەی فۆڕم و ناوەڕۆک قەتیس دەبێت**

> **سکرتون دەربارەی مالبرانچ دەڵێت: مالبرانچ ئەو نهێنییەی دۆزیوەتەوە، کە نووسینەکانی جیاواز کردووە. وێڕای ئەوەی هێزی بنەما ئەبستراکتەکانی لاواز نەکردووە**

شتەکان دەژمێردرێت، بەم شێوەیە کامڵبوون دەبێتە یاسای ویست و ڕەوشتەکان، ئەم ویستە تاکگەرایی و بەشەکییانەش، کە خۆی لە دروستکراو بە خۆشەویستییەکەی نواندووە، بەرەو خودا ئاراستە دەگرێت، پاشان ئەو فەزیلەتەی بە واتای خۆشویستنی سیستەمەکە دێت گەشە دەکات. مالبرانچ لە میتافیزیکەکەیدا بە شێوازە داهێنەرە ویژەییەکەی دەڵێت: خودا جیهانی لەنێوان ژمارەیەکی بێکۆتایی لە جیهانە ئەگەرییەکان دروستکردووە، کە حیکمەتە بێکۆتاییەکەی دەیانگرێتەوە، وەک چۆن بەپێی یاساکانی جووڵە دەجووڵێت، کە بە ویستی خۆی دروستی کردووە، لەبارەی کامڵبوونی یاسا خوداییەکانیشەوە دەڵێت: ئەم یاسایانە بۆ دروستکردنی کارێکی سەیرو کامڵ دەرچوون، دەتواندرێت بە ڕێگەیەک پێشبینی ئەوە بکات، کە لە داهاتوودا لە جیهان چی ڕوودەدات.

لە میانەی خستنەڕووی ئەم دوو دەقە بڕی ئەو جوانییەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە لە فێرگەی فۆڕم و ناوەڕۆک قەتیس دەبێت، یاخود وەک چۆن سوریۆ دەڵێت: ئەو جوانییە شاراوەیەی لە پێکهاتەی فێرگەکە و ئەو ئامانجانەی بابەتەکانی لە کامڵبوون دەیپێکێت دەگرێتەوە.

# دیدار

# شوکریە حەمەدئەمین ڕواندزی

بۆ ئەم دیمانەیەی دیوان، دووجار لەگەڵ مامۆستا (ئومێد پالانی) چووینەتە خزمەتی، جگە لەوەی ڕاشکاوانە وەڵامی پرسیارەکانی دایـەوە، زۆریـش دڵخۆش بوو بەگۆڤاری دیوان، کە «بەدوای ئەو خەڵکانەدا دەگەڕێن، ڕۆژانێک ڕەنجی زۆریان کێشاوە، تا ئەو ئەزموونەی ئێستای لێ بەرهەم هاتووە«.

# شوکریە حەمەد ئەمین ڕواندزی:

# چوار بەندیخانەم بینیوە، ماوەی پێنج ساڵ نەفی کراوم، پێنج ساڵیش لە پیشەی مامۆستایەتی فەسڵ کراوم



مامۆستا شوکریه حەمەد ئەمین ڕواندزی، ساڵی ١٩٣٧ لە ڕواندز، لە خێزانێکی قەرەباڵغ، بەڵام هەبوون لە دایکبووە، وەک مامۆستا ئاماژەی پێدەکات ئەو لەژێر کاریگەریی باوکی، فیکری چەپ و مارکسی لەمێشکی چەسپیوە.

ئەو کچەی شارەکەی پاشای گەورە، کە پێی وایە لە ئێستادا ڕواندز بەکۆمەڵی هۆکار خەریکە لە مێژووەکەی خۆی دای دەبڕێتن و دەیکەن بەگوندێک لەسۆران! یەکەم کچ بووە لە ڕواندز قۆناغی سەرەتایی تەواوکردووە و بۆ خوێندنی ناوەندی هاتۆتە هەولێر و لەسەر قەڵا بەردەوامی بەخوێندن داوە، جارەکی دیکەش، کە ناوەندی تەواو دەکات، دیسانەوە یەکەم کچی شارەکە بووە چووەتە بەغدا و لەخانەی مامۆستایان بەردەوام بووە لە خوێندن.

مامۆستا شوکریە دەڵێت: «لەهەموو ناوچەکانی سەرەوەی هەولێر، لە شەقڵاوە، سۆران، مێرگەسۆر، ڕواندز و چۆمان، یەکەم کچ بوومە بوومەتە مامۆستا».

مامۆستا شوکریە لەساڵی ١٩٦٢ کە ئەوکاتە کچێکی تەمەن ٢٥ ساڵ بووە، لەیەکەم کۆنگرەی مامۆستایان لەشاری بەغدا، دوای هەڵبژاردنەکە، بەڕووی «عەبدولکەریم قاسم» یەکەم سەرۆک کۆماری عێراق هاوار دەکات و دەڵێت: «هەڵبژاردنەکە پڕ لەتەزویر بوو«.

**محەمەد گۆران**

**- سەرەتا با لەڕواندزەوە دەست پێبکەین، لەبەرچی بە بەراورد بەدەوروبەرەکەی، ڕواندز و خەڵکەکەی، تایبەتمەندیی خۆی هەیە؟ ئێوە چۆن وەسفی ئەو شارە دێرین و مێژووییە دەکەن؟**

+ تایبەتمەندییەکە لەزۆر ڕووەوەیە، ڕواندز شارێکی دێرینە، محەمەد پاشای ڕواندز زیاتر لەسێسەد ساڵ پێش ئێستا حوکمی گێڕاوە و شارەکە پایتەختی میرنشینی سۆران بووە و سنووری قەڵمڕەوی پادشا و میرنشینەکەی یەکجار فراوان بووە، لەسەت ساڵی ڕابردوو و دوای هاتنی ئینگلیز، دیسانەوە ڕواندز مێژووەکی پرشنگداری هەبووە، ماوەک (سەید تەهای نەهری) لەوێ قائیمقام بوو. هەموو ئەمانە وایکردووە خەڵکەکەی وشیاربن. لەزۆر زووەوەش و هەر لەبیستەکانی سەدەی ڕابردوو (حوسێن حوزنی موکریانی) چاپخانەی لەشاری (حەلەب)ەوە هێناوەتە ڕواندز و لەو شارە ڕۆژنامەی (زاری کرمانجی) دەرچووە و ڕۆژنامەی شوێنانی دیکەش وەک (زەوڕا) کە لەبەغدا دەرچووە هاتۆتە ڕواندز و خوێندراوەتەوە. هەر لەسەرەتای چلەکانیش، بەدیاریکراویی لەساڵی (١٩٤٣) ەوە (عەلی مەکتەبە) کتێبخانەیەکی لە ڕواندز داناوە و خوێنەرەکی زۆری لەدەور کۆبۆتەوە، کە ڕۆڵێکی چاکی هەبووە لەبڵاوکردنەوەی وشیاریی لەنێو خەڵکەکەی، ئەمە جگە لەوەی کە خەڵکی ڕواندز هەر زوو تێکەڵ بەکاری سیاسیی و ڕێکخراوەیی بوونە. حزبی هیوا لە زووەوە ڕێکخستنی لەڕواندز هەبووە، ئینجا دواتر ئەحزابەکانی دیکەش.

ڕواندز پێشتر لەکاولۆکان بوو لەخوارێ، لەدوای هاتنی ڕووسەکان لەجەنگی یەکەمی جیهانیی، لە ١٩١٦ شارەکە وێران بوو و تێکدرا، ئینجا کە سەرلەنوێ دروستکرایەوە، خەڵکەکە شارەکەیان لەسەرێ بونیاد نایەوە و ئەوێ بووە ڕواندز و خوارەوەش بووە کاولۆکان.

بەڕاستی نازانم بەزمان وەسفی ئەو شارە جوان و دێرینە بکەم، بەتایبەت ساڵانی چل و پەنجا و شەستەکانی سەدەی ڕابردوو، کە من تێدا ژیاوم و بەچاوی خۆم دیمەن و ڕووداوەکانیم بینیوە. دەتوانم بڵێم: ڕواندز ئەو کاتی لەهەر چوار وەرزەکەی ساڵ سەیرانگەکانی جمەی دەهات، خەڵکی بەهەر لایەکیدا دەڕۆیشتن سرووشتی جوان و سەیرانگە بوو، بەتایبەت لەوەرزی بەهاران




شوکریە لەکاتی وەرگرتنی خەڵات بەبۆنەی ٨ی مارس
ڕۆژی ئافرەتانی جیهانی

خەڵک دەچوونە بێرۆ، گەلی عەلی بەگ، جوندیان، بەرزێوە، بانەزۆک، مێگر، سەرشاخان و مەلاسوشیا. ئەو خەڵکە کاتی دەچوونە سەیران، گەڕەک بەگەڕەک و ماڵ بەماڵ بەرنامەی ئەوەیان دادەنا چۆن و بەچی بچنە سەیران، هەریەکە چ جۆرە چێشتەک لێنی و لەگەڵ خۆی بهێنێ.

ڕواندز بەهۆی سرووشت و هەڵکەوتەی شارەکە، کە کەوتۆتە نێوان دوو دۆلی قووڵ و گەورە، کە ئەوەی خۆرهەلاتی خەرەند و ئەوەی خۆراواش گەلی ڕواندز، یان گەلی خارەڕەشی پێی دەگوترێت، هەروەها هەڵکەوتە جوگرافیاکەی کە لە باکوورەوە زنجیر چیای زۆزک و حەسەن بەگ و برادۆست، لە باشوورەوە چیای کۆرەک و ئارمووشە و بێجانییە، لە خۆرهەلات هندرێن و دۆلی باڵەکایەتی و لە خۆراواش گردینەی باپشتیان و گۆرەژ و چیای بەنی باڵەکیانە، ئەمە وای کردووە هەمیشە جوان و ڕازاوە بێ.

**– ئەمە وەک ڕابردوو و بووە مێژوو، بەڵام لە ئێستادا ڕواندز بووەتە گەڕەک یان گوندەکی سۆران، لە کاتێکدا پێشتر دیانا (سۆران) گوندەک بووە لە ڕواندز، لەلایەکی دیکەوە زۆربەی قەزاکانی کوردستان ئەگەر زانکۆیەکی لێ نەبێت، بەڵام کۆلێژەکی لێیە ڕواندز لەمەش هیچی نییە. ئەم پاشەکەشەی ڕواندز هۆکارەکەی چییە؟**

«

***بە هاوار کردنەوە بە عەبدولکەریم قاسم-م گوت: «الانتخابات مزورە مزورە»***

»

+ ئەم پاشەکشەیە لەسەردەمی بەعس بەچڕی دەستی پێکرد و سەدام ڕواندزی وێران کرد، ڕواندزی کردە (ناحیەی عومەر) جاران سۆران، چۆمان و مێرگەسۆر لەڕووی ئیدارییەوە هەموویان بەڕواندز بەستراببوونەوە، بەعس (دیانا +سۆران)ی کردە (قەزای سەدیق) دواجار گەیشتە ئەوەی، کە ئێستا ڕواندز وەک گوندێکی سەر بەسۆرانی لێهاتووە، بێ ئاو و کارەبا و خزمەتگوزاری جێهێڵدراوە، تاڤگەی بێخاڵ چەند لەڕواندز نزیکە؟ ئاوەکەی ڕاکێشراوە بۆ سۆران و باڵەکیان و شوێنانی دیکە، ڕواندزیش بێ ئاوە!

**– ئەگەر ڕواندزییەکان بەراورد بەکۆییەکان بکەین، دەبینین ئەوان زۆر خەمخۆری شارەکەی خۆیانن، بەڵام من ئەو خەمخۆرییە لەڕواندزییەکانەوە بۆ شارەکەیان نابینم. لەڕابردوو چەند کەسانێکی وەک مامۆستا زرار مستەفا هەبوون، بەڵام ئەوانیش ڕۆیشتن و کەس نەهاتەوە شوێنیان؟**

+ کۆیە هەتا مەلاکانیشیان هێندە توندییان نەکرد لەگەڵ خەڵکەکەی، کەسانی وەک مەلای گەورە دیارە، کە چییان بۆ شارەکەی خۆیان کردووە، بەڵام لە ڕواندز دوو بنەماڵەی شارەکە شەڕیان لەسەر ئەوە دەکرد کامیان ببنە گەورە و ئاغای ڕواندزییان، بەهۆی ئەمەوە ڕواندز زۆر بەپاشکەوت. پیاوەکی دیار و بەناوبانگی وەک (ئیسماعیل بەگ) کە لەبیستەکانەوە لەپەرلەمانی بەغدا نوێنەر ڕواندز و هەموو دەوروبەرەکەی بوو، بەڵام ئەوان کوشتیان.

**– دوای کۆتاهاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی و هاتنی ئینگلیز بۆ ناوچەکە، ڕواندز تاکو ساڵانێک دەسەڵاتی ئینگلیزی نەسەلماند و تووڕک لەهەموو عێراق بەدەرنرابوون تەنیا لە ڕواندز نوێنەرەکەیان (ئۆزدەمیر) مابۆوە! پێتان وانییە کە باجی ئەو کاتانەیە ڕواندز بیداتەوە؟!**

+ ڕواندز لەدوای سییەکان و چلەکانی سەدەی ڕابردووەوە بووە گۆڕەپانی حزبەکان، کە بەحزبی هیوا دەستی پێکرد، پاشان حزبی شیوعی و ئینجا پارتی، ئەمە بووە هۆی وشیاریی زیاتری خەڵک، بەڵام ڕواندز ئەو باجە قورسەی، کە دەیدا هی

دوو بنەماڵەکەی خۆیەتی، لەدوای هاتنی بەعس بیسانەوە باجێکی دیکەی دا. دواجار ڕواندز ئێستا بووەتە گوندێک بەهەمووی بیست سێ ماڵی ڕەسەنی ڕواندزی لێ نەماوەتەوە.

**- با بگەڕێینەوە سەر خوێندن و مەکتەب. ئێوە یەکەم قوتابی کچ بوونە لە ڕواندز، کە پۆلی شەشی سەرەتاییتان تەواو کردووە و هاتوونەتە هەولێر، هاوکات هەر یەکەم کچیش بوونە جارەکی دیکە لە ڕواندزەوە چوونەتە بەغدا، لەو سەردەمە بۆ کچێک زۆر زەحمەت بووە ڕواندز جێبێڵێ و بەتەنیا بچێتە هەولێر و بەغدا، لەم سەرکێشی و تێپەڕاندنە نەریتیانە کێ هاوکار و پاڵپشتی سەرەکیت بوو؟**

+ ڕاستە دایکم ژنێکی نەخوێندەوار بوو، بەڵام زۆری حەز بەخوێندەواری دەکرد، بەمنی دەگوت کچم وەمەکە بکەویەوە ماڵێ و بچی دەست لە پیاوەکەی پان بکەیەوە، هەتا درهەمەک، یان دینارەکت دەداتێ، بۆ خۆت خاوەنی پارەوپوولی خۆتبە وەبێ هەندەک سەربلند بێ.

من ساڵی ١٩٤٨ سەرەتایم لەڕواندز تەواو کرد، قوتابخانەکە لەساڵی ١٩٣٣ەوە هەبوو، بەڵام بەهۆی فتوای هەندێ کۆلکە مەلا نەبووایە، زووتریش لەو شارە خوێندن دەستی پێ دەکرد. لەگەڵ کرانەوەی قوتابخانەکەش دیسان خوێندن بۆ کچان زۆر زەحمەت بووە. من یەکەم قوتابی کچ بوومە، دوای تەواوکردنی قۆناغی سەرەتایی، لە خوێندن بەردەوام بووم و چوومەتە ناوەندیی، پێش من کچەکان لەدوای پۆلی سێ و چوار، ئەوپەڕەکەی گەیشتوونەتە پێنج و شەشی سەرەتایی بەڵام دواتر چوونەتەوە ماڵ و دانیشتوونە، بەڵام دایکم گوتی هەر دەبێ خوێندن تەواو بکەی، ساڵی ١٩٤٩ منی هێنایە هەولێر و لەماڵی پوورم دانام، بەمجۆرە پۆلی یەکی ناوەندیم لەسەر قەلات خوێند، ساڵی ١٩٥١ قوتابخانەکی تێکەڵاو لەڕواندز کرایەوە، ئەوە بوو گەڕامەوە ڕواندز و لەوێ لەگەڵ کوڕان دانیشتم و دوو و سێی ناوەندیم تەواوکرد. ساڵی ١٩٥٦ لەبەغدا خوێندنم تەواوکرد و بوومە یەکەم مامۆستای ئافرەت لە ڕواندز، شەقڵاوە، چۆمان، سۆران و هەموو ئەو ناوچانە، لەهەمان قوتابخانەی، کە لێیشم خوێندبوو بوومەوە مامۆستا.

دایکم دەوری سەرەکی هەبوو لەناردنم لە ڕواندزەوە بۆ هەولێر، بەڵام باوکم کە کەسێکی ڕۆشنبیر و زۆر کراوە بوو، کاتەک گەڕامەوە و پۆلی سێیەمی ناوەندیم لەڕواندز تەواو کرد، ئامادەیی لە ڕواندز نەبوو تاکو قۆناغەکانی پاشتر تەواو بکەم، دایکم گوتی هەر چۆنەک بێ دەبێ خوێندن تەواو بکەیت، ئەوکات لە هەولێرێ لە ئامادەیی تەنیا بەشی وێژەیی هەبوو، منیش بەهیچ شێوەیەک حەزم لەو بەشە نەبوو دەمویست لەبەشی زانستیی بخوێنم، کە ویستم بچمە بەغدایێ بخوێنم، هەموو ئەو خەڵکە بەرەنگاری باوکم بوونەوە، هەر لەخزمەوە بگرە هەتا ئەهلی شاری، دەیانگوتە باوکم عائیلەکی وەکو ئێوە، کچەک لەتەمەنی ١٦ ساڵی چۆن دەبێ بەتەنیا بنێردرێتە بەغدایێ، باوکم گوتی کچم واز بێنە، عالەمەکە زۆر لۆمەم دەکات، لۆ خۆت بەچ خۆت خەریک دەکەی قەینا بەس مەچووە بەغدایێ، بەڵام دیسانەوە دایکم پێداگیری کرد و گوتی هەر دەبێ بخوێنێت.

> “ ڕواندز وەک گوندێکی سەر بەسۆرانی لێهاتووە، بێ ئاو و کارەبا و خزمەتگوزاری جێهێڵدراوە، ئاڤگەی بێخاڵ چەند لەڕواندز نزیکە؟ ئاوەکەی ڕاکێشراوە بۆ سۆران و باڵەکیان و شوێنانی دیکە، ڕواندزیش بێ ئاوە! ”



شوکریە لەلەگەڵ دوو مامۆستای ڕواندزی ڕواندز - ١٩٥٣/٥/١٠



**- ئەی دواجار باوکت چۆن قەناعەتی هێنا و ڕازی بوو کە بچیتە بەغدا؟**

+ بۆ تەواوکردنی کاروبارەکانی وەرگرتنم لەخانەی مامۆستایانی بەغدا، دەبووایە باوکم بەڵێننامەیەکی بە سێسەد دیناری عێراقی پڕ بکاتەوە، تەنیا کارەکەش ئەو بۆی هەبوو بیکات، دایکم هەرچەندە هەبوون و پارەدار بوو بەڵام ئەو بۆی نەبوو بەڵێننامەکە پڕ بکاتەوە چونکە ئافرەت بوو! ئەو نەیدەتوانی ئەو کارە بکات بەهۆی ژن بوونەکەی، باوکم ویستی ئەم هەلە بقۆزێتەوە و نە بەڵێننامەکە پڕ بکاتەوە و نە ڕێگەی چوونە بەغداشم بدات، ئەوەش دووبارە بۆ من بۆوە گرفتێکی گەورە بۆ وەرگرتنم لەخانەی مامۆستایانی بەغدا.

دایکم حاکم (یەعقوب یەعقوبی) کە حاکمێکی ڕواندزی بوو، دەناسی. مرۆڤێکی پێشکەوتووخواز بوو، من و دایکم ڕۆژەک پێکەوە چووینە لای و دایکم گوتی کاروباری شوکریەم تەواو کردووە و دەینێرمە خانەی مامۆستایانی بەغدا، بەڵام پێویستە باوکی بەڵێننامەی بۆ بکات، ئەویش لەشەرمی خەڵکی دواکەوتوو ئامادە نییە کارەکە بکات و ڕەوانەی بەغدای بکەین، ئینجا حاکم بەدوای باوکمیدا نارد و پێی گوت ئەگەر تۆ بۆی ناکەیت، من خۆم بۆی دەکەم. باوکیشم بەحاکمی گوت من چەندین بەڵێننامەم لای ئێوەیە کە بۆ خەڵکی هەژار و دەستکورتی باڵەکایەتیم کردووە، ئیدی چۆن بۆ کچەکەی خۆمی ناکەم، بەڵام خەڵکی زۆر سەرزەنشتم دەکەن. حاکم پێی گوت مادام خۆت بڕوات بەخوێندەواریی و بەرەوپێشچوونی کۆمەڵ و یەکسانی نێوان کچ و کوڕ هەیە نابێ گوێ بەو قسانە بدەیی و دڵنیاشم ڕۆژێک دادێت ئەو هەنگاوەی ئێوە دەبێتە مایەی شانازی و ڕێخۆشکەر بۆ کچانی دیکەش و وەک کەسێکی پێشەنگ ناوتان لە ڕواندز دەهێندرێ. بەمجۆرە باوکم قەناعەتی هات و بەڵێننامەکەی پڕ کردەوە.

لەگەڵ دایکم پێکەوە چووینە بەغدا و داخوازیم پێشکەش کرد و لەخانەی مامۆستایانی کچانی بەغدا وەرگیرام، کە ئەمەش بووە وەرچەرخانێکی گەورە لەژیانی مندا، کە وەک کچێک لەو پەڕی چیاکانی سەرسنوور بۆ خوێندن بچێتە شارێکی گەورەی وەک بەغدا.

دوای من بەپێنج ساڵ ئینجا سێ کچی دیکە بوونە مامۆستا، من بەشانازییەوە بەستەڵەکەکەم شکاند، ئێستاش مایەی خۆشحاڵیمە، کە لە ڕواندز دەیان کچ بوونەتە پزیشک و ئەندازیار و لەهەموو بوارەکان بەرچاون. حەزدەکەم باسی ئەوە بکەم، کە بوومە مامۆستا، یەکەم دامەزراندنم، کە هاتمەوە ڕواندز، یەکەم مووچە سێ دینارم وەرگرت، ئەوکات سێ مسقاڵ زێڕی پێ دەهات. خەڵکەکە، کە ئەوەی دیت خۆیشم هانی خەڵکەکەم دەدا، کە کچەکانیان بنێرنە قوتابخانە و دەمگوت با کوڵەوار نەبن، کچ بۆ لەماڵی بکەویی و هەر کەلوپەل بشوات و منداڵ بەخێو بکات، با ئەوانیش دەستیان هەبێ لەپێشکەوتن و خاوەن پارە و ئابووریی خۆیان بن، ئیدی دواتر منیش بوومە هاندەرەک تاکو خەڵک کچەکانیان بنێرنە مەکتەب.

**- ئێوە یەکەم دامەزراندنتان وەک مامۆستا لەڕواندز بوو، دواتر چۆن بوو گواسترانەوە مەخموور، لەسەر ئارەزووی خۆتان بوو؟**

+ نەخێر دووریانخستمەوە. لەکۆتاییەکانی ساڵی ١٩٥٦ هێرشی سێ قۆڵی کرایە سەر میسر و لە هەموو شارەکانی عێراق ڕێپێوان و خۆپیشاندان کرا، لە ڕواندزیش کرا و دایک و بابیشم بەشدارییان کرد، منیش بە بەڕێوەبەری

> **یەکەم مووچە سێ دینارم وەرگرت، ئەوکات سێ مسقاڵ زێڕی پێ دەهات**

قوتابخانەم گوت با ئێمەش تەلەبەکان ببەین و بەشداری بکەین، بەڕێوەبەرەکەمان مێردی نیمچە ئاغایەک بوو، لێی کردمە کێشە و قائیمقامی ڕواندزی تێگەیاند، کە من لە مەکتەب سیاسەت دەکەم، ئەوە بوو ساڵی ١٩٥٧ منیان نەفی مەخموور کرد. بەهۆکاری ئەوەی من هانی تەلەبە و مامۆستاکانم داوە و لەناو قوتابخانە سیاسەتم کردووە.

**- کاتێ چوویە مەخموور، ئەوێت چۆن بینی؟**

+ چوومە مەخموور، بەڵام چ مەخموور؟ نە ئاو، نە کارەبا، نە شوێنی نیشتەجێبوونی هەبوو، مەخموور ئەوکات مەنفا بوو، هەر لەگەڵ من قائیمقامی هەولێریش نەفی بوو، حاکمێکی کەرکووکی نەفی بوو، بەڕێوەبەری شارەدێی قەراج نەفی بوو، مەخموور وەک مەنفایەک وابوو ئەوەی عەقڵیان نەگرتبا بۆ ئەوێیان دوور دەخستەوە.

کاتەک چوومە مەخموور قوتابخانەکە سێ پۆلی بوو، پۆلی یەکەمی سەرەتایی لەسەر تەنەکە دادەنیشتن، ساڵی دووەمم لەوێ لە ١٩٥٨ کرامە بەڕێوەبەری قوتابخانەکە، ئیدارەم بەڕێوە دەبرد و هەفتانە ٣١ بەشە وانەشم دەگوتەوە. دواتر شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ی بەسەردا هات. پاش مانەوەم بۆ ماوەی چوار ساڵ لە مەخموور، لەساڵی ١٩٥٧ تاکو ١٩٦٠ ئینجا گواسترامەوە عەنکاوە و بوومە بەڕێوەبەری قوتابخانەکەی ئەوێ.

**- ئێوە سەردەمی پاشایەتی و سەردەمی کۆماریشتان بینی، بەتایبەتی، کە ئێوە لەدوای ١٤ی تەمموز و هاتنی (عەبدولکەریم قاسم) بەفەرمی هاتنە نێو کاری ڕێکخراوەیی و ڕێکخستن، عەبدولکەریم قاسم پیاوێکی چۆن بوو؟ ئایا قاسم کەسێکی دیموکراتی بوو وەک دەگوترێ؟!**

+ من دەمەوێ بە نموویەک و گفتوگۆیەکی نێوان خۆم و قاسم وەڵامی ئەو پرسیارەت بدەمەوە، ئینجا دواتر ئێوە بڕیار بدەن، کە کەسێکی چۆن بووە. ساڵی ١٩٦٢ هەڵبژاردنی مامۆستایان لەهەموو عێراق ئەنجام درا. لە هەولێر ئێمە وەک لیستی پیشەیی لیژنەکی باڵامان بۆ سەرپەرشتیکردنی ئەو هەڵبژاردنە پێکهێنا، لەگەڵ چەند مامۆستایەکی بەتوانا، کە ژمارەمان بیست و پێنج کەس دەبوو، لیستێکمان دروستکرد.

لەو لیستە سێ ژن هەبوون، من و مامۆستا (سەبریە) لەگەڵ مامۆستا (نەسرین ڕەشید نامیق) کە سەر بەپارتی بوو، چونکە لیستەکە ئیئتلافی بوو و شۆڕشی کوردیش تازە دەستی پێکردبوو، پاش هەڵبژاردن سەرەڕای هەڕەشە و تۆقاندن و بەربەستی زۆر، ئێمە لیستی پیشەیی لەسێ پارێزگا (هەولێر، سلێمانی، عمارە) بەرانبەر بە ١١ لیستی پیاوانی ئەمن و موخابەرات و کۆنەپەرستان وەستا بووین، ئینجا لیستەکەی ئێمە زیاتر لە هەزار دەنگی هێنا، لیستی (بێلایەن) کە لیستی حکوومەت بوو و پێکهاتبوو لە پیاوانی ئەمن و کۆنەپەرستان بە هەموو هێز و زەبر و زەنگی خۆیان تەنیا ١٠٣ دەنگیان هێنا.

> **لە شەقڵاوە و سۆران و مێرگەسۆر و ڕواندز و چۆمان، یەکەم کچ بووم کە بوومە مامۆستا**

لەمەراسیمی کردنەوەی کۆنگرەدا لە هۆلی گەل لە بەغدا (عەبدولکەریم قاسم) وتەکی پێشکەش کرد و ئاماژەی بەوەکرد، کە هەڵبژاردنەکە زۆر ئازادانە بووە، ئەوسا لیژنەی هەولێر گوتیان ئێوە ژنەکان بۆی ڕوون بکەنەوە، کە وانییە، دوو ئەندامەکەی دیکە ئارەزووی قسەیان نەبوو،


عومەر شێخەڵلا لەگەڵ شوکریەی هاوسەری لە یەکەم ڕۆژی هاوسەرگیرییان لە ١٩٦٩/٤/١٤



لە ڕاستەوە: فەتحیە محەمەد، ؟، خاتو شوکریە، سامیە شاکر.
ئەندامانی کۆنگرەی یەکەمی (کۆمەڵەی پاراستنی مافی ئافرەت)
بەغدا، ساڵی ١٩٥٩

بۆیە من هەستام و گوتم: «هەڵبژاردنەکان ئازاد نەبوون، پاک نەبوون و ساختە بوون، لەزۆربەی ناوچەکاندا هێرش کراوەتە سەر مامۆستایان و دوور خراونەتەوە، لێیان دراوە و بەند کراون و سوکایەتیان پێکراوە« ئینجا بەهاوار کردنەوە گوتم: «الانتخابات مزورە مزورە«. لێرەدا بووە هەرا و غەڵبەغەڵب هەتا لە تەلەفزیۆن تەنیا گرتەی یەکەمی نیشان دا و قسەکانی دیکەی بڕی.

دوو سێ لە مامۆستایانی سەر بەلیستەکانی دیکە، کە موسڵاوی و کەرکووکی بوون، لەپێش ئێمەوە دانیشتبوون، ویستیان پەلارم بدەن، بەڵام عەبدولکەریم قاسم گوتی: «واز لەو خوشکە بهێنن با قسە بکات، ئەمەیە دیموکراتی».

ئێمە لەئامادەبوونی کونگرەکەدا سێ ژنی ئەندام بووین، یەکێکی دیکەشمان (گەلاوێژ ڕەشید) وەک میوان لەگەڵ خۆمان بردبوو، پاش تەواوبوونی مەراسیمی کۆنگرە بۆ دابەشبوون بەسەر لیژنەکان چوومە هۆڵی (امانە العاصمە) پیاوانی ئەمن بەدوای ئەو کەسەدا گەڕابوون، کە قسەی بە (عەبدولکەریم قاسم) بڕی بوو، بەڵام کە سێیانمان مابووینەوە، وایانزانی بوو ئەوەی نەهاتووە ئەو کەسە بووە، کە قسەکانی کردووە!

**– دوای ئەوەی لەڕواندز و ناوچەیەکی شاخاوی، هاتییە مەخموور و دەشتی هەولێر، دواتریش شووت بەکوڕێکی شیوعی لەگوندی قورشاغلو کرد، کاتێک کەوتیە بەراوردکاریی لەنێوان ڕواندز و دەشتی هەولێر، چ شتێک زۆر سەرنجی ڕاکێشای؟ مەرجی ئێوە بۆ هاوسەرگیریی چ بوو؟**

> ❝ ***بەگشتیی خێزانە شیوعییەکانی دەشتی هەولێر، ئەوانەی، کە سیاسیی بوون، ژنەکانیان زۆر ڕۆشنبیرتر بوون لەو ژنانەی، کە ئێستا مامۆستا و دکتۆرن*** ❞

+ بەگشتیی خێزانە شیوعییەکانی دەشتی هەولێر، ئەوانەی، کە سیاسیی بوون، ژنەکانیان زۆر ڕۆشنبیرتر بوون لەو ژنانەی، کە ئێستا مامۆستا و دکتۆرن، هۆکارەکەش ئەوەبوو ژنەکان هەمیشە چاودێری دەرەوەی ماڵیان دەکرد، بەتایبەت لەکاتی کۆبوونەوەی پیاوەکان، بەمەش گوێیان لە ناوەڕۆکی هەموو قسەکان دەبوو، لەبواری ڕۆشنبیریی و چینایەتی و جیاوازیی ڕەگەزیی، ئەمە وای کردبوو ئاستی وشیارییان زۆر لەپێش بێت. جا من چەندین خێزانی وەهام بینی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک شتی دیکەش هەبوو، لەوانە: زۆرجار لە هاوسەرەکەی منیان دەپرسی، ژنەکەت بندیانە یان بێگانەیە؟ چونکە ئەو لە عەشیرەتی بندیان بوو، بێگومان ئەوە سیفەتی عەشایرییە، بێگومان جیاوازیی دیکەش زۆرە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش، ئەمانیش ناهەق نەبوون، ڕەنجیان بۆ ئاغا بوو، ساڵێ ئەو هەموو ماندووبوونەیان دەکرد دواجار حسابکە وەک نان و زگ دەژیان، هەتاکو دوای ١٤ی تەمموز و شۆڕشی فەلاحی، ئینجا وردە وردە بوژانەوە، بۆیە منیش ناهەقیان ناگرم.

ناسینەکەی منیش لەگەڵ هاوسەرەکەم، لەڕێی حزب بوو، ئەو بەحزبی گوتبوو دەمەوێ ژیانی هاوسەری پێکبهێنم، چونکە دایک و باوکی ئەو جووتیار بوون، ئەویش کولیژی تەواو کردبوو و حەزی کردووە ژنەکی خوێندەوار بکاتە هاوسەری و هەندێک لەو ژیانەی پێشتر جودا بێ، بۆیە بەحزبی گوتبوو من ناتوانم بگەمە ئەو خێزانانەی کچی خوێندەواریان هەیە و ماڵی باوکم بنێرم بۆ خوازبێنی و بۆم هەڵبژێرن، جا ئێمە هەردووکمان بەو شێوەیە و لەڕێی حزب لەهەولێر یەکدیمان ناسی.

بەس من گوتم دەبێ بچیە ڕواندز و باوکم و برام ببینی و قسە لەگەڵ ئەوانیش بکەی، چونکە من نە

خۆیی و نە خێزانەکەیم نەدەناسی، ڕاستە حزب گوتی کوڕەکی باشە و شایستەیە، بەڵام پێویست بوو خۆیشم هەندێک شتم لەسەر زانیبا. هەر زوو پێشم گوت، کە من تێکەڵ بەکاری حزبی و سیاسیی بوومە و ئیدی شەوبێ ڕۆژبێ، کە ئەرکێک بەمن ڕاسپێردرا دەردەچم، چونکە ڕاستە زۆر کەس بیروباوەڕی شیوعیشی هەیە بەس قبووڵ ناکا ژنەکەی بچێتە کوڕ و کۆبوونەوان، جا گوتم با لەئێستاوە ئەو شتانە ببڕێنینەوە.

**– ئێوە ساڵانێکی زۆر مامۆستا و بەڕێوەبەری قوتابخانە بوونە، بەبۆچوونی ئێوە هۆکار چییە کە قوتابی ئەوکات هێندە ئاستبەرز بوون لەفێربوونی زمان و زانیاریی گشتیی، بەڵام تەلەبەی ئێستا بەبەراورد بەو کاتی ئاستیان زۆر نزمە؟**

+ بەپلەی یەکەم: هۆکارەکەی (مەنهەج، مامۆستا، دایک و بابە) من لە ناوەندیی ڕواندز دەمخوێند، خەڵک لە دیانا، کە ئێستا سۆرانی پێ دەگوترێت، لە باڵەکیان، لە باپشتیان، جوندیان، سیبانان تاریکوڕوون، سەعات چوار لەوێڕا بە پێیان دەهاتن، کۆڵەپشتیان هەبوو کتێب و پێخۆریان تێدەکرد، هەندێک ڕۆژ، کە دەگەیشتن تۆپە بەفرەکیان لەسەر کەتبوو. دوو دەوام بووین، لەهەشت تاکو دوانزە دەوامەک ئەوەی دیکەش لەدوو تاکو چوار بوو، لەنێوان دوانزە بۆ دوو، هەر لەنێو مەکتەب تەلەبەکان نیوەڕۆیان نانێکی بەوشکیان دەخوارد، دوای دەوام سەعات چوار دیسان بەپێ دەگەڕانەوە. سەرەتا خوێندن بۆ کچان نەبوو، بەڵام پاشی مەکتەبی ناوەندیی و ئامادەیی کرایەوە، ئینجا خەڵک کچیشیان نارد.

جا ئەوکات خەڵک زۆر حەزیان بەخوێندن و فێربوون دەکرد، هۆکارەکەش زیاتر ئەوە بوو جاران چ ئیشەک نەبوو مرۆڤ بیکات، بەڵام کاتەک بڕوانامەت وەردەگرت، دەبوویە مامۆستا، یان فەرمانبەر و دەستت لەئیشەک گیر دەبوو. لە ڕواندز ڕیزە دوانەک هەبوو و تەواو، کاری دیکە نەبوو، تەنانەت لە دەشتیش، لەمەخموور، کە من لەوێ بووم، حەوت ساڵ نەهات بوو، منداڵ بەجلکی دڕای دەهاتنە مەکتەب.

هۆکاری ئاست نزمی تەلەبەی ئێستا بەبەراورد بەوکاتی، بەبڕوای من، ئەو تەکنەلۆژیایە، کە زوو هاتە نێو کۆمەڵگەی ئێمە، بەبێ ئەوەی هیچ ئامادەکاری بۆ کرابێ. دەبینی منداڵە و هێشتە ساوایە، مۆبایلەکی لەدەستە. هۆکارێکی دیکە ئەوەیە ئێستا، کە خوێندیش تەواو دەکەی دانامەزرێی، تەلەبە هەیە حەوت ساڵە تەواوی کردووە و دانەمەزراوە، جا ئەوانەی خوارەوەی وان کاتێک گەورەکان دەبینن دانامەزرێن، دەڵێن ئێمە بۆچی بخوێنین، ئەمە وادەکا ورەی تەلەبە دابەزێ و حەزی بۆ فێربوون و خوێندن نەبێ.

**– ئەی جیاوازیی مامۆستای ئەو کات و ئێستا چۆن دەبینی؟**

+ ئێمە ئەو کاتەی لەخانەی مامۆستایان لە بەغدا دەمانخوێند، مامۆستاکانمان زۆر زیرەک و زانا پڕ زانست و پەروەردە و هونەر و وەرزشیی بوون. هەر مامۆستایەک بەلای کەمی دوو بڕوانامەی هەبوو، وەک مامۆستا (لەمیعە عەباس عمارە) کە شاعیرەکی بەناوبانگە (نازک ئەلمەلائیکە) ئەویش شاعیرەکی بەناوبانگ بوو، (مەئارب عەلی) بلیمەت بوو لەزمانی عەرەبیی (مەعانی ئەلعانی) و (رنیە ئاکرەیی، جوزدنین ئاکرەیی، لەمیا عەلی کەمال، ناهیدە ڕەفیق حلمی) و زۆر مامۆستای بلیمەتی دیکە بوون. مامۆستاکانمان هەتا فێریان دەکردین چۆن جلک لەبەرکەین، کو نان بخۆین و بچینە گەڕانێ، کو دۆست بگرین، هەموو شتەکیان پێدەگوتین، قوتابییان دەکردە کەسێکی ئامادەکراو بۆ بوارەکەی خۆی، بەڵام ئێستا هەمووی بۆتە واسیتە و واسیتەکاری، ئایا چ بوارەکیان بۆ مامۆستا داناوە؟ کوا هەڵسەنگاندنی مامۆستا؟ حزبایەتی تەسک هەموو پێوەرەکانی تێکدا.

**– ئێوە لەژێر کاریگەریی کێ فیکری شیوعیتان وەرگرت؟**

+ من لەژێر کاریگەریی باوکم و ئینجا کەشوهەوای سیاسیی ڕواندزیش بەخۆی، بوومە شیوعی، هەر لەگەڵ خۆم، لە قۆناغی سەرەتایی، قوتابییان دەهێنایە مەکتەب و تاقیکردنەوەی شەشی بەدەست کەلەپچەکراوی دەدرایەوە ئەوە لەساڵی ١٩٤٨.

**«لە بیستەکانی سەدەی ڕابردوودا (حوسێن حوزنی موکریانی) چاپخانەی لەشاری (حەلەب)ەوە هێناوەتە ڕواندز و ڕۆژنامەی (زاری کرمانجی) دەرچووە و ڕۆژنامەی (زەوڕا)ش کە لە بەغدا دەرچووە هاتۆتە ڕواندز و خوێندراوەتەوە»**



له چەپەوە: خاتوون، شوکریە، هێرۆ خان، سۆزان، سەفیە، سەبریە

ڕاستە باوکم نەخوێندەوار و نازناوی دیوانەی هەڵگرتبوو، بەڵام فیکرێکی زۆر کراوەی هەبوو، گوتی هەموو ئەوەی هەیە تاقیمکردەوە دەرچوو هیچی بۆ میللەتەکەی نییە، هەر چەند ئێمە خاوەن موڵکین و گوندمان هەیە، بەس گوندەکەی باوکم ئیشتراکی بوو و بەروبوومەکەی دابەشی سەر هەمووان دەکرد، ئاغا دەهات دەیگوت چوار تەنەکە گەنمم بدێ بۆ مەلای چواری دیکە بۆ فلانی و بیست تەنەکە بۆ ئاغای، ئەی باشە سەپانەکان چییان بۆ دەمێنێتەوە؟!

جا لێرەدا باوکم فیکری شیوعی وەرگرت لەپێناو نەهێشتنی چەوسانەوە و جیاوازیی چینایەتی، ئەو فیکرەی هەڵبژارد و پێی پەسەندتر بوو لە بیروباوەڕاکانی دیکەی ئەوکاتە.

**- ئێوە لەنێو حزب زیاتر کارتان لەسەر چینایەتی دەکرد، یاخود لەسەر مافی ژن؟**

+ نەخێر ئێشم لەسەر مافی ژن و لەچوارچێوەی ئەوەش لەسەر چینایەتی دەکرد. هەوڵمان زیاتر بۆ ئەوە بوو ئەو جیاوازییە زۆرە لەنێوان ژن و پیاودا نەبێ، لەبنەڕەتدا ژن و پیاو تەواوکەری یەکن، بەڵام نابێ پیاو ببێتە زلهێزەک هەموو فەرمانەک بەسەر ژنەکەدا بدات، وەکو ئازادیی چوونە دەرەوە و پۆشینی جلوبەرگ و زۆر کاروباری دیکە، کە دەبێ جۆرەک لەسەربەخۆیی

> **یەکەم قوتابی کچ بوومە لە ڕواندز، دوای تەواوکردنی قۆناغی سەرەتایی، چوومەتە ناوەندی**

خۆی هەبێت.

**- پێتانوانییە کە هەر لەبەرەبەیانی مێژوو و پێش سومەرییەکانیش، هەموو سیستەمەکان کاریان لەسەر بەکۆیلەکردنی ژن کردووە، بەتایبەت دوای ئەوەی مرۆڤ فێری ڕاوشکار و کشتوکاڵ بوو و بەرهەمی لەپێداویستی خۆی زیاتر بوو، ئیدی پیاو دەستی بەسەر بەرهەمەکە و ژنەکەش داگرت. لە ئێستاشدا سیستەمی سەرمایەداریی لەسەر هەمان نەخشەڕێگا کار لەسەر بەکۆیلەکردنی ژن دەکات. بۆیە لەهیچ شوێنەک یەکسانیی لەنێوان ژن و پیاودا نییە؟!**

+ بەڵی زۆر ڕاستە. هەموو سیستەمەکان هەر لەزۆر زووەوە، کە چەوساندنەوە دەستی پێکردووە بەچەوساندنەوەی ئافرەت بووە، ژن خرانە ماڵەوە و ئەرکیان قورستر کرا و پیاو بووە زلهێزەک بەسەر ژندا. ئێستا لەنێو زۆربەی عەشیرەتەکان هەمان سیستەمە و ژن کۆیلەیە و هیچ مافێکی نییە، پیاو چەند ژنەک دەهێنێ و لەنێو عەرەبان هەتا نۆ ژن دەڕوات. بۆیە دەگەڕێینەوە سەر ئەوەی، کە ئەگەر زانست و ڕۆشنبیریی لەهەر شوێنەک هەبێت، جیاوازیی چینایەتی کەمتر دەبێتەوە و ژن و پیاویش دەبنە تەواوکەری یەکدی.

**- دوای نزیکەی حەفتا ساڵ لە ئاشنابوون و خەباتکردنت لەنێو شیوعی، هیچ لە بۆچوونەکانت سەبارەت بەحزب گۆڕانکاریی بەسەر داهاتووە؟**

+ نەخێر. هەر کەسەک، کە شیوعی بێت و لەو بەرنامەی دەرچووبێت شیوعی نییە، شیوعییەت بەرنامەیەکی پێشکەوتووە، ساڵی ١٩٣٤ کە حزب درووست بوو داوای سەربەخۆیی کوردستانی کردووە، بۆیە من ئێستاش لەسەر هەمان بیروباوەری جاران و ئەو ڕۆژەی بوویمە شیوعی، ماوم.

**- بەهۆی هەڵوێست و بیروباوەڕی شیوعێتی چەندینجار بەند کراون، کام جارە لەهەموویان ناخۆشتر بووە بەلاتانەوە؟**

+ ساڵی ١٩٦٢ بوو، ئەویش دوای ئەو هەڵمەتە گەورەی حزبی شیوعی بوو لە پێناو ئاشتی لە

کوردستان و چەند داواکارییەکی دیکەی ڕەوا بۆ ژیانی خەڵک. لەم هەڵمەتەدا توانرا بیست هەزار واژۆ کۆبکرێتەوە، بەڵام لە ڕێگەی ناردنی لیستی ناو و واژۆکان بۆ شاری کەرکووک، لەخاڵی پشکنین لیستی ناوەکان و ئەو هاوڕێیەی دەیوست بیگەیەنێ، دەسگیرکران و ڕەوانەی ئەمنی هەولێر کران. بەماوەکی کەم دوای ئەوە، ئەمنی هەولێر (٣٧٥)ی کەسی لەوانەی واژۆیان کردبوو دەسگیرکرد.

من ئەوکاتە بەڕێوەبەری قوتابخانەی عەنکاوەی کچان بووم و یەکێ بووم لەو ٣٧٥ کەسە دەسگیرکراوە. کەسێکی ناسراویش بووم، بەتایبەت لەلای پارێزگاری ئەوکاتی هەولێر (بەدرەدین عەلی) چونکە بەر لەوەی ببێتە پارێزگار، ئەو لە ڕەواندز قائیمقام بوو و ئاگاداری جموجۆڵ و چالاکی سیاسیی و کاری ڕێکخراوەیی من بوو، بۆیە زۆر ڕقی لێم بوو. هەر بۆیەش (بەدرەدین عەلی) منی خستبووە ژێر چاوەدێری، بەئاشکرابوونی ئەو ناو و واژۆیانە، بەڵگەیەکی باشی لەسەر من دەسکەوت.

### - چۆنیەتی دەسگیرکردن و مامەڵەی دەزگا ئەمنییەکان چۆن بوو؟

+ ڕۆژی ١٢ای ٥ی ١٩٦٢ لەنێو قوتابخانەی عەنکاوەی کچان لەکاتی دەوامی ئاسایی ڕۆژانەمدا بووم، پۆلیسێک بەدوامدا هات و لەبنکەی پۆلیسی عەنکاوە دەسگیرکرام و ڕەوانەی ئەمنی هەولێر کرام، کە لەشوێنی بینایەی پارێزگای ئێستای هەولێر بوو، لەژووری لێکۆڵینەوە، لێکۆڵەرەکە چەند لیستێکی دەرهێنا و دایە دەستم، لیستەکە ناو و ئیمزای پێوە بوو، پەنجەی درێژکرد و گوتی ئەوە ئیمزای تۆیە؟ گوتم بەڵێ. نەمتوانی نکوڵی لێ بکەم. گوتی بۆچی ئیمزات کردووە؟ گوتم وەک کچە کوردێک داواکارییەکانم پێ ڕەوا بوون و کەسیش نییە ئاشتی نەوێت و پێی خۆش نەبێت. گوتی ئەی ئەو ناوانەی لەگەڵ تۆ ئیمزایان کردووە، دەیانناسی؟ گوتم نەخێر! گوتی مامۆستای خۆتن! دووبارە وەڵامم دایەوە و گوتم نەخێر نایانناسم چونکە ئەو ناوانە لە عەنکاوە زۆرن.


عەزیز محەمەد لەکاتی سەردانیکردنی ماڵی شوکریە لە ٢٠١٢/٢/٢٢

پاشان لەگەڵ ئەمنێک، منیان ناردە لای حاکمی تەحقیق (ئیبراهیم دزەیی) کە چوومە ژوورەوە هەمان پیاوی لێکۆڵەر لەوێ بوو، دووبارە لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کردمەوە. پێش ئەوەی دادوەر قسەم لەگەڵ بکات، لێکۆڵەرەکە تەلەفۆنێکی بۆ هات، دواتر زانیم مفەوەزی ئەمنە و هەر دەیگوت «نعم باشا، تومەز باشا» تەلەفۆنەکەی دایە دەست حاکم، ئەویش زۆر بەتەوسەوە دەیگوت «نعم باشا»، ئینجا دوای تەلەفۆنەکە حاکم گوتی بۆچی ئەم ئیمزایانەت کۆکردوونەتەوە نازانی قەدەغەیە؟ گوتم نەخێر، چونکە بۆ ئاشتییە لە کوردستان، منیش وەک کچە کوردێک داواکارییەکانم زۆر پێ ڕەوا بوون بۆیە ئیمزام کرد. حاکم گوتی تۆ ئیمزاکانت کۆکردیتەوە و شاهێدت لەسەر هەیە، کە بە پەچە و عەبا بوویی و پێڵاوەکی لاستیکت لەپێ بووە لەگەڕەکەکان ئیمزات کۆکردیتەوە. منیش گوتم ئەگەر من بوومە، ئەی بۆچی ئەوکات دەسگیرتان نەدەکردم؟

> **دایکم ژنێکی نەخوێندەوار بوو، بەڵام زۆری حەز بەخوێندەواری دەکرد، بەمنی دەگوت کچم وەمەکە بکەویەوە ماڵێ و بچی دەست لە پیاوەکەت پان بکەیەوە**

ئەوجارە حاکم گوتی ئەی باشە کێ بۆی هێنای تەوقیع بکەی؟ گوتم ڕۆژێکی هەینی لەماڵەوە بووم، (ئەوکاتە بەڕێوەبەری مەکتەبی عەنکاوە بووم) ژنێک هات و گوتی ئەو یاداشتەم بۆ ئیمزا

دەکەم، هەتاوەکو ناوی چەند ئافرەتێکیشمان پێ نەڵێیت، لەسجن دەرناچی و هەموو سجنەکانی عێراقت پێدەکەم. دوای ئەوە منیان بردە سەرای هەولێر، ئەوکات زانیم کە لەگەڵ من، ئەو هەموو هاوڕێیانەی حزب دەسگیر کراون.

**- ئەو کاتانە بە ندکراوی ئافرەت لەنێو زیندانەکان بەژمارە کەم بوونە، هەستتان بەهیچ جیاکارییەک لەگەڵ زیندانییە پیاوەکان دەکرد؟**

+ لەسجنی هەولێر شوێنی ژنانیان نەبوو، ژووری نووسەرێکی پۆلیسیان بۆ چۆل کردین، من و دوو ئافرەتی دیکە، کە سجنی سیاسیی نەبوون پێکەوە دانرابووین، یەکێ لەژنەکان (عەیشە گوڵ) هاوسەری (مستەفا ئاغا)ی بێلینگیان بوو، لەدەڤەری خۆشناوەتی و ژنە پێشمەرگە بوو، عەیشەگوڵ دوو منداڵی بچووکیشی لەگەڵ بوو، بارودۆخی نێو سجنەکە زۆر ناخۆش بوو، ژوورێکی بچووک ڕۆژێ دووجار بۆ ماوەی پێنج خولەک بۆ ئاودەست دەیانهێنایە دەرەوە. هاوین بوو، ژوورەکەش پانکەی لێ نەبوو، خواردنێکی زۆر خراپ دەدرایە سجنەکان، ئاوەکەی لەگەڵ ئەوەی گەرم بوو زۆریش پیس بوو.

بەهۆی جموجۆڵی مامۆستایان و ئافرەتانی هەولێر، کە داوایان دەکرد بەر بدرێم، بووە هەرایەکی گەورە، بۆیە ماوەی ڕاگرتنی منیان لەسجن درێژ کردەوە و دواتر لەمانگی حوزەیران منیان گواستەوە بەندیخانەی مووسڵ، بێگومان ڕۆژە ناخۆشەکان لەوێوە دەستییان پێکرد، بەتایبەت هەر لەگەڵ گەیشتنم ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر درام، تاوەکو ئێستاش کاریگەریی دەروونی و جەستەیی لەسەرم ماوە، بەتایبەتی هەردوو گوێچکەکانم پەردەکەی دڕاوە و ڕادەی بیستنی بەهۆی لێدان زۆر کەم بۆتەوە، ئێستا گوێچکەم سەماعەی تێدایە، سجنەکە وەک قەڵایەکی گەورە وابوو، بەڵام بەشی ئافرەتانی زۆر بچووک بوو، هەموو کاروباری نێو بەندیخانەیان بەئێمە دەکرد، وەکو خاوێنکردنەوەی ژوورەکان و گۆرەپان و ئاودەستەکان، سجنی ژنان بە سیاسیی و ناسیاسیی هەموو تێکەڵاو کرابوون، بەشێک لەو ژنانەی لەگەڵ ئێمە بوون لەسەر کاری


بسم الله الرحمن الرحيم
الجمهورية العراقية
المجلس العرفي العسكري الرابع كركوك

الى - مدير شرطة لواء كركوك

التاريخ ٥/ ٥/ ١٩٦٤
الموضوع / حسم قضية

...

حسين عبدالله
الزعيم
رئيس المجلس العرفي
العسكري الرابع

وێنەیەک لە بڕیاری زیندانیکردنی خاتوو شوکریە لەلایەن دادگای سەربازیی چواری کەرکووک

بکە، با چیدی مێرد و کوڕ و برامان نەکوژرێ، منیش وەکو کچە کوردێک، کە خوێندمەوە زۆرم پێ ڕەوا بوو، چونکە کەس نییە لە دونیا ئاشتی نەوێت، بۆیە ئیمزام کرد. حاکم گوتی ژنەکە دەناسیتەوە؟ گوتم بەڵێ! چونکە دڵنیا بووم، خۆم بووم و زۆر لەئیمزاکانم کۆکردبۆوە!

حاکم ناوی زۆر لەمامۆستایانی دۆست و خزم و هاوڕێیانی هێنا، گوتی ئەگەر ناوی چەند کەسێک لەوانەی واژۆیان کردووە پێم نەڵێی بڕیاری گرتنت دەدەم. گوتم تەنیا ئەوەندە دەزانم مامۆستان، بەڵام ئاشنایەتیم لەگەڵ کەسیان نییە، ئینجا یەکسەر گوتی ئەوە ١٣ ڕۆژ تەوقیفت

لەشفرۆشی دەسگیر کرابوون.

ژیانی ئەوێم زۆر ناخۆش و کولەمەرگی بوو، خواردنی نێو سجن زۆر خراپ بوو، تەنیا نان و چایەکەم دەخوارد، بەڵام هەندێک جار پاسەوانێکی سجن، کە ژنە کوردێک بوو، بەدزییەوە خواردنی لەدەرەوە بۆ دەهێنام. مانگی جارەک کەسوکارەکەم دەهاتن و منیان دەبینی، ئەویش تەنیا ماوەی کاتژمێرەک دەرفەتیان دەدا، بۆیە ئەوپەڕی بێزار بووم، بەڵام کەسوکارەکەم کۆڵیان نەدا و بەپارە و بەرتیل مفەوەزێکی ئەمنیان ڕازی کرد بەوەی، کە نووسراوەک بۆ حاکمی سەربازیی بکات و بێ تاوانی منی بۆ بسەلمێنێ، نووسراوەکە چووە پێش حاکم و من لە کۆکردنەوەی واژۆکان بێ تاوان دەرچووم. دوای مانەوەی حەوت مانگ لە بەندیخانە، بە کەفالەتی براکەم لە بەرواری ٢٠ی ١١ی ١٩٦٢ لەبەندیخانەی مووسڵ ئازاد کرام.

**- دوای ئازادبوونت لەبەندیخانە، گەڕایەوە هەولێر و سەر پیشەی مامۆستایەتی؟**

+ نەخێر، دوای بەربوونم نەوەک گەڕامەوە ماڵ و سەرکار، بەڵکو چەرمەسەریی زۆرترم بینی. ئەو مفەوەز ئەمنەی کە بووە هۆکاری بەربوونم، گوتی لەهەولێر مەمێنەوە چونکە ئەوراقی بەربوونت بچێتە پێش پارێزگار دیسانەوە بەندت دەکاتەوە، بۆیە منیش لەدوای دەرچوونم لە زیندان ڕاستەوخۆ چوومە ماڵی کچی خوشکێکم لەبەغدا و بەنهێنی لەوێ مامەوە تاکو کودەتا شوومەکەی ساڵی ١٩٦٣ی بەسەر داهات. دوای ئەوە لە بەهاری ١٩٦٣ خۆم گەیاندە بنکەی (لۆغان)ی پێشمەرگە شیوعییەکان لەنزیک شاری ڕەواندز و لەوێ مامەوە، تاکو موفەوەزاتی شوباتی ١٩٦٤ کە گەڕامەوە هەولێر ئینجا زانیم ئەو برایەم، کە ببووە کەفیلم تاکو لە سجنی مووسڵ ئازاد بکرێم، لەسەر من زۆریان ئازاردابوو، گرتبوویان و داوایان لێ دەکرد، کە من واز لەهێزی پێشمەرگە بهێنم و بگەڕێمەوە هەولێر، من سەرەتا ڕازی نەبووم، دواتر چارەم نەما چونکە براکەم دەگیرا و حوکم دەدرا، بۆیە بەناچاریی ڕازی بووم، کە بچمە پێش مەحکەمەی عورفی عەسکەری چوارەم لەکەرکووک.

الجمهورية العراقية

مديرية التربية والتعليم للواء الحلة — العدد/ ٢٨٥ —

ذاتية الابتدائي — التاريخ ٧/ ٨/ ٩٦٣

سري ومستعجل

الموضوع/ استفسار

مديرية التعليم العامة – الابتدائي

اشارة لكتابكم س/ ٩٩١٤ في ١٢/ ٨/ ٩٦٣ والمكالمة التلفونية بتاريخ ٢٢/ ٨/ ٩٦٣ وعطفا على كتابنا س/ ٨٢٢٨ في ١/ ٨/ ٩٦٣ نرجو اعلامنا –

١- ماهي المدة التي يمكن ان يبقى فيها المعلم مسحوب اليد .

٢- الاتصال بالجهات الرسمية المبينة بكتابنا اعلاه لانهاء قضايا المعلمين المحالين اليها حفظا لاموال الخزينة .

٣- اعلمتنا معاونية امن اربيل بكتابها س/ ٤٤٩٣ في ٧/ ٨/ ٩٦٣ المرفقة صورة منه علما بان المعلمة شكرية محمد امين المنقولة من لواء اربيل الى لوائنا في ١/ ١/ ٩٦٢ بان المعلومات الواردة لديها دلت على انها التحقت بالحركة في الشمال لذا نرجو اعلامنا رأيكم عما نتخذه بحقها لاجراء اللازم كما نرى ضرورة عزلها من الخدمة للاسباب الواردة بكتاب معاونية امن اربيل المذكور اعلاه كما وانها مسحوبة اليد منذ نقلها الينا من اربيل ولحد الان .

المرفقات

١ صورة كتاب معاونية امن اربيل س/ ٤٤٩٣ في ٧/ ٨/ ٦٣

فاضل حنظل الساقي
مدير التربية والتعليم للواء الحلة

نسخة منه الى –
اللجنة التحقيقية والتطهير في اللواء – يرجى الاطلاع اجراء اللازم
[illegible]
ذاتية الابتدائي

نووسراوی پەروەردەی لیوای حیلە، سەرووی خۆی لەوە ئاگادار دەکاتەوە، کە شوکریە پەیوەندی بە پێشمەرگەوە کردووە لە ١٩٦٣/٨/٢٦

لە ٥ی ٥ی ١٩٦٤ منیان بردە پێش حاکم، دادگا بڕیاری دا بەحوکم کردنم بە (حبس الشديد) بۆ ماوەی ساڵێک، بەڵام هەر لەبڕیارەکەدا هاتبوو، کە حوکمەکە نەچێتە بواری جێبەجێکردن و هەر کاتێک بەتاوانێکی دیکە سزا درام ئەو ساڵەشی بچێتە سەر.

هەر لەوێش دوای چەند ڕۆژەک گواسترامەوە بۆ سەرای کەرکووک لەوێش ڕەوانەی ئەمنی هەولێر کرام، لەئەمنی هەولێر، داوای پاکانەیان لێکردم بەڵام ڕەفزم کردەوە و ئەوەم نەکرد، بۆیە لەکارەکەم دووریان خستمەوە و فەسل کرام، هاوکات بڕیاری نەفیکردنم بۆ شاری (حیللە) درا، لەوێ بۆ ماوەی پێنج ساڵ بەئیقامە جەبری

مامەوە تاوەکو لە ٢٧ی ٣ی ١٩٦٧ بەپێی بڕیاری ئاشتی بۆ کوردەکان، نەفیکردنەکەم لەسەر لاچوو و گەڕامەوە بۆ شاری هەولێر و ڕاستەوخۆش بڕیاری فەسل کردنم هەڵوەشایەوە و گەڕامەوە پیشەی مامۆستایەتی و بوومە بەڕێوەبەری قوتابخانەی پیرمامی سەرەتایی لەمەسیف سەلاحەدین.

**- ساڵی ١٩٧٢ شیوعی چووە نێو بەرەیەک لەگەڵ حزبی بەعس هەتا ١٩٧٨ ئایا ئێوە ئەمەتان پێ ڕاست بوو؟**

+ من لەگەڵ ئەو بەرەیە نەبووم، بەڵام ئەگەر لەگۆشەنیگایەکی دیکە سەیر بکەین حزب ئەگەر ئەوەی نەکردبا هەمووان کۆمەڵکوژ دەکراین، بۆیە زیاتر وەک خۆپارێزی چوونە نێو ئەو بەرەیە، هەرچەندە بەعس پێش بەرە و کاتی بەرەش زۆر لە شیوعییەکانی کوشت، بەرنامەی بەعس ئەوەبوو ئەمەی بەزمانیش بڵێ شیوعیم لەنێوی ببات، سەرکردایەتی بۆ ئەوەی پێش بەو کوشتارە بگرێ و هەندێ بالانس ڕاگرن پەنایان بۆ ئەم بەرەیە برد، بەڵام نەیانزانی بەعس فێڵزانن بۆ ئەوە چوونە بەرە تاکو جێ پێی خۆیان قایم کرد ئینجا لەشیوعییەکانیان دا. بۆیە منیش دەڵێم دروستکردنی بەرە لەگەڵ بەعس تا ڕادەیەک هەڵە بوو بەڵام هۆکاری خۆیشی هەبوو.

**- سنووری کاروچالاکی ئێوە لەنێو حزبی شیوعی تەنیا لە چوارچێوەی شاری هەولێر بوو، یاخود لەشارەکانی دیکەش هاتوچۆ و کارتان بۆ حزب کردووە؟**

+ نەخێر تەنیا لەسنووری هەولێر نەبوو، لەهەر شوێنێک ئەرکەک هەبووایە و بەمن ڕاسپێردرابا جێبەجێم دەکرد. ساڵی ١٩٨٤ لەبەغداوە دوو هاوڕێیان نارد تاکو لە ڕێگەی منەوە پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە بکەن لە دەڤەری بادینان، کە ئەوسا هاوڕێیانی ئێمە لە بامەرنێ بوون، لە ٢٦ی ٣ی ١٩٨٤ لەخاڵەکی پشکنین لەشاری دهۆک، پیاوانی ئەمن، خۆم و کوڕێکی (١٢) ساڵیم لەگەڵ ئەو دوو هاوڕێیە، دەسگیریان کردین و ئێمەین گواستەوە بۆ ئەمنی دهۆک. ئەوجارەش دوای واسیتە و بەرتیل دان و پارەیەکی زۆر لەبەغدا، ئینجا توانرا بەربدرێین.

> **"ناسینی من لەگەڵ هاوسەرەکەم، لە ڕێی حزب بوو، ئەو بە حزبی گوتبوو دەمەوێ ژیانی هاوسەری پێکبهێنم"**

**- سەرجەمی گرتنەکان و ئەو بەندیخانانەی بینیوتە چەندن؟**

+ بەدروستی نازانم چەند جار و ماوەی چەند گیراوم، چونکە زۆرجار بەهەفتە و دوو ڕۆژ و سێ ڕۆژ گیراوم، بەڵام ئەوە دەزانم کە چوار بەندیخانەم بینیوە و ماوەی پێنج ساڵ نەفی کراوم و پێنج ساڵیش لەپیشەی مامۆستایەتی فەسل کراوم.

**- دوای ئەوەندە ساڵەی خەباتکردنت لەنێو حزبی شیوعی، چۆنبوو دواتر هیچ پۆستێکی ئیداریی حکومیت وەک بەڕێوەبەری گشتی، پەرلەمانتاری، وەزیری لەسەر پشکی شیوعی وەرنەگرت؟**

+ ڕاستە من هیچ لەو پۆستانەم نەبووە، من بەخۆم بۆ ئەوە نەچوومە نێو حزب، تاکو ببمە خاوەن پۆست و پارە، بەڵام لەپۆستی حزبی و ڕێکخراوەیی توانیم ببمە سکرتێرەی کۆمەڵەی ئافرەتان لەکوردستان تاکو بتوانم ئافرەتان بەمافەکانی خۆیان بناسێنم، لە هەولێرەوە تاکو خانەقین، لەو لاوە تاکو هەڵەبجەی شەهید، تا بادینان، هەموو ئەو شوێنانە دەچووم تاکو ئافرەتان ئاشنابن بەمافەکانی خۆیان، ئەگەر مافیان پێشێلکرا داوای هەقی خۆیان بکەن، بەڵام دواتر ئەوەش نەما و ڕێکخراوەکانیان هەموو ئیفلیج کرد، ژنە لەماڵییە، خەسو ئیمپراتورە لەسەری، شوبرا ئیمپراتورە، باشە وەها بێت!؟

**- دوا قسە و ڕێنمایتان چییە بۆ شێوازی ئیشکردنی ئێمە لە گۆڤاری دیوان؟**

+ زۆرم پێخۆشە هەمیشە بەدوای ئەوانەدا بگەڕێن، کە پێیان دەگوترێت (محاربین قدما) پاڵەوان و تێکۆشەرانی پێشووتر و سەردەمی زوو بەسەر بکەنەوە، زۆرکەس لەنێو کۆمەڵی کوردەواری، تێکۆشانی کردووە، مامۆستایەکی بەتوانا بووە، ئەندازیارەکی بلیمەت بووە، هەتا جوتیارێکی بەتوانا، ئەمانە بدۆزنەوە، بۆ ئەوەی بزانرێ، کە ئەم میللەتە زۆری هەبووە و زۆر کراوە، بەڵام ڕێگری و بەربەستی گەلێ زۆر هەبووە، بەداخەوە!

# هونەر

- **ئەوانەی تا لێواری مردن سەمایان کرد**

ڕۆزالیند جانا - لەفارسییەوە: ئەرسەلان حەسەن

- **مۆزەخانەی لۆڤەر .. ئاوێنەی کلتووری جیهانیی**

خەلیل عەبدوڵڵا

- **حەیران، لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیی**

هێمن سارمەمی

- **حەیرانبێژ عیماد لاوە**

هاشم حاجی عەلی شەناغەیی



# ئەوانەی تا لێواری مردن سەمایان کرد

ڕۆزالیند جانا
لەفارسییەوە: ئارسەلان حەسەن

ساڵی ١٥١٨ی زایینی «تاعونی سەما» لەستراسبۆرگی فەرەنسە وایکرد دانیشتوانی ئەم شارە بۆ ڕۆژانێکی زۆر لەخۆوە سەما بکەن. هێشتا ئەم ڕووداوە سەیرە بۆ زۆربەی نووسەر و هونەرمەندان سەرنجڕاکێش و سەرسامکەرە، کە ئاکامی مردن بوو.

دەڵێن ڕۆژێکی گەرمی هاوینی تەممووزی ١٥١٨، نەنە ترۆفیا پێینایە گۆڕەپانێکی شاری ستراسبۆرگ و کەوتە سەما. خەڵکەکە بەدیتنی ئەم نمایشە نائاساییە ماخۆلانیان بوو، سەرەتا تەماشایان کرد. تەماشای ژنێک بکەن نەیدەتوانی واز لەسەماکردن بێنێت. نزیکەی هەفتەیەک سەمای کرد و جاروبار لەماندوویيان دەکەوت، بەڵام زۆربەی کات هەموو ئاماژە وریاکەرەوەکانی جەستە وەک: ئازار، برسێتی و شەرم، پێی نەوێران. بێ میوزیک و بەڕیتمی دڵی دەجووڵا تا سەماکە بەردەوام بێت.

بەڵام کە بردیان، حەیف. ژمارەیەک پەیوەندییان پێوەکرد و کەوتبوونە سەما. ژمارەیان تا مانگی شووبات گەیشتە سەدان کەس، بەڵام نەیانتوانی وەک ئەو ژنە هۆکەی ڕوونبکەنەوە. بەلاقی خوێناوی و لەشی بە بارەوە، گوایە بەناچاری وا سەمایان دەکرد.

نزیکەی ٥٠٠ ساڵ بەسەر ئەم ڕووداوە سەیرەی «تاعونی مردن»ی ستراسبۆرگ تێدەپەڕێت و لەم ماوەیەدا زۆر تیۆر بۆ ڕوونکردنەوەی خرایەڕوو، کە هێشتە مۆلەقی کردووین و بووەتە چاوگی ئیلهام بۆ داهێنەرانی ئەدەبی، تا هەر یەکە و بەڕوانگەی تایبەتی خۆی بیگێڕێتەوە.

گەرچی ڕووداوەکەی ستراسبۆرگ بەناوبانگترین نموونەی ئەو ڕووداوانەیە، بەڵام تەنیا «تاعونی سەما» نییە، ئەورووپا لەسەدەکانی ناوەڕاست و سەرەتای سەدەی نوێ لە بەلەکی ئالاوە. چەندان و چەندین نموونەی ڕاپۆرتی سەمای لەگرێژنەچوو لە ئەڵمانیا، فەرەنسە و سنووری ئیمپراتۆریەتی ڕۆما تۆمار کراوە. ئەو ڕووداوانە لەڕابردوو، بەسزدانی خوایی، یان خاوەندارییی ئەهریمەن دانراون و بۆ چارەسەرکردنی پەنایان بردووەتەبەر چارەسەری ئایینیی وەک کاری بەکۆمەڵ و ڕێورەسمی ئێوارە خوان، یان داوای دەستێوەردانی ڕاستەوخۆیان لەقەشەکان کردووە. دوو دەیە پێش ڕووداوی هاوینی ١٥١٨، سپاستین برانتی قەشەی ستراسبۆرگیی هۆنراوەی تەنزی «کەشتی گەمژەکان»ی نووسی: «سەما و تاوان یەکن» و ئۆباڵی «ئەم سەما سەرخۆشانە سەریەشەی» دایە پاڵ ئەهریمەن.

بەڵام چەندان ساڵ دوای ڕووداوەکەی ستراسبۆرگ، پاراسلسۆزی پزیشک و کیمیاگەری سویسریی، کە زیاتر وەک پێشەنگێکی توێژەری (ڕۆڵی کیمیا لە پزیشکدا) دەناسرێت گوتی: لەوانەیە زیاتر زەوی هۆی ئەم ڕووداوە بێت، تا ئەودیو سروشت. بەڕای پاراسلسۆز، گەرمبوونی نائاسایی خوێن لەدەمارردا، دۆخێک پێی دەڵێن: (دەمارە خەندانەکان) دەبێتە هۆی «هەستکردن بەقەلەقی» ئەم هەستە لە ئەندامەکانی لەش دەست پێدەکات و بەگەیشتن بەمێشک، کاریگەریی بەسەر توانای بیرکردنەوەی تاک دەبێت، ئارەزوویەکی ئاوا کۆنترۆڵ نەکراو بۆ جووڵەی خێرای جەستەیی تێدا فۆرمۆلە دەبێت و ئەم ڕەوتە

تا ئەوکاتە بەردەوام دەبێت، خرۆشانی خوێن دادەمرکێتەوە.

**سەمای شێتانە لە دونیای ئەمڕۆ**

دواجـــار چیرۆکی هـاوینێکی سـوریـالـی سـتراسـبـۆرگ تـەنیا چیرۆکێک نییە، بـەڵام گێڕانەوەی سەمای بەکۆمەڵ، کە لە ٦ ساڵنامەی جـیـاوازی سـەردەم تـۆمـار کـراوە و بەپێی راپۆرتەکان، سەماکەرەکان بۆ چەندین هەفتە سەمایان کـردووە. زۆربـەی ئـەم ساڵنامانە، خاتوو ترۆفیا بە داینەمۆی بزووێنەری ئەم رووداوە دەزانـن، بـەڵام لە وردەکـاریدا زۆر جیاوازە و مێژووی جیاواز بۆ دەستپێکی ئەم رووداوە تۆمـارکراوە. هـەر ساڵنامەیەک بۆ بنکۆڵکردنی ئەم دیاردەیە، جەخت لە میتۆدی جیاواز دەکاتەوە. وەک وێنای گشتیی هەموو رووداوە مێژووییەکان، لەرێزکردنی پارچە جیاوازەکان بەدەست هاتووە.

بە چاوپۆشین لەحەقیقەتە راستـەکان، ئەم چیرۆکە خەیاڵمان دەوروژێنێت: کەسایەتییەک سەردەکێشێتە بزووتنەوەیەکی جەماوەرییەوە. سەمایەکی سەرنج راکێش و هەڵخەڵەتێنەری ئەودیو ئیرادەی تاک، سنوورە جەستەییەکان و هەندێک جار ئاکامی مردن.

سـەمـای کـۆنـتـرۆڵ نـەکـراو کـاریـگـەری سەرسامکەری بەسەر تەماشاکەرانەوە هەیە. چیرۆکە ناسراوەکەی «پێڵاوە سوورەکان»ی ئەندەرسۆن بیربێنەوە. باسی جووتێک پێڵاوی لاستیکی سووری نەفرەتلێکراو، پڕ لە نجەولار خاوەنەکەی دەخاتە سەما، دواجار خاوەنەکەی داوای جەللادێک دەکات بۆ ئـەوەی لاقەکانی ببڕێتەوە.

ئەم چیرۆکە ترسناکە، خەڵک زۆریان پێخۆشە. گـەرچـی ئـەمـە دەمـانـگـەیـەنـێـتـە پێشهاتێکی ئاکاری نزیکەی راست (تاوانبار بێ سزا بۆی دەرناچێت و کارەکتەری چیرۆکەکەش کەوتە ژێر ئەزموونێکی سەختەوە، کە لە هەوەڵەوە ئـامـادە نـەبـوو پـێـڵاوە سـوورە جوانـەکانی لە کڵێسا نەکاتەپێ) بـەڵام رکێف نـەکراو و دینامیزمی ناوەرۆکی تاریکتریەتی، کە بووەتە ئیلهامی فراوانی بەرهەمی هونەری لە فیلم و میوزیکەوە تا باڵییە. فیلمی پێڵاوی سووری پـاوڵ و پرسبێرگەر، بەرهەمێکی هونەرییە و ئایدیای تاک (رکێفکراو) سەما ئیلهامیەتی و هـاوکـات «داری سـەمـا»ی کـایرن میلڤۆد هاریگریڤ بە تایبەت باسی ئەو رووداوانـە دەکات و دەڵێن ساڵی ١٥١٨ لەستراسبۆرگ روویـانـداوە و ئـەم رووداوە لەزمانی ژنانی بەشدار دەگێڕێتەوە. بەشی سەرەکی چیرۆکەکە لەدەریچەی روانینی لیزبێتەوە وێنا دەکرێت، ژنێکی دووگیانی هەنگەوان دەکۆشی سەر لە نهێنیەکانی خێزانی مێردەکەی دەربکات. لیزبێت بینەر، نەک بەشدار، بەڵام چۆن سەما جەوهەری شار دەگۆڕێت، ئەویش دەگۆڕێت. بەدرێژایی گێڕانەوەکە، بەکورتی رووبـەرووی ئەوژنانە دەبـیـنـەوە چـوونـەپـاڵ سـەمـاکـردنـەکـەوە. ئەو ژنانەی باوک، کوور، یان تەنانەت ئەقڵی خۆیان لەدەست داوە، ئـەو ژنانەی خۆشەویستییان ناسیوە، ئەم هەستەیان بە نکۆڵی لێکراوە و چاودێر ماونەتەوە، مەگەر بەرگری نەکەن بۆ گەیشتن بەئازادی بەڵێن پێدراویان، بچنە ناخی ئەم سەماکانە.

**جەزمبوونێکی دەروێشانە**

خۆشـەویـسـتـی تـاعـونـی سـەمـا، بـە فۆکس خستنەسەر پەتای کۆرۆنا بووەتە بابەتێکی خۆ لێ نەدزراو. بەگشتیی پەیوەندی رووداوەکانی ئـەم سـاڵانـە بـەوپـەتـایـە تـوونـدوتـۆڵـە پێشتر بڵاوبووەوە، لەمردنی رەشـەوە تا ئەنفلۆنزای ئیسپانی.

یەک: پاپا لەسەدەی حەفدە بەکەرەنتینەکردن،

> **"رۆژێکی گەرمی هاوینی تەمموزی ١٥١٨، نەنە ترۆفیا پێینایە گۆرەپانێکی شاری سترسبۆرگ و کەوتە سەما"**



رۆمای لەتاعون نەجات دا.
دوو: ئەوخواردنەی ‹تاعونی نەهێشت›
سێ: چۆن پەتاکان کۆتاییان پێ دەهێنرێت؟
مەبەست لەم ئاوڕدانەوە لەڕابردوو تەنیا بەراوردکردنی باروددۆخەکە بەکات نییە، بەڵکو خۆمان دڵنیا بکەینەوە دواجار هەمووپەتاکان کۆتاییان پێ دێت و هەمیشە جۆرێک لەنەخۆشی درمی بابەتێکی زۆر فریودەرە و لەجیاتی نەخۆشێک، جووڵە لەتاکێکەوە تەرز داوێتە تاکێکی دیکەوە.
کەرەنتینە لەسەمای دەروێشانە بێبەشی کردین و هاوشانی ئەوانیدی، هەستی بێوێنەی نزیکەی فیزیکی بەسەدان کەس، کە هەموویان ڕادەستی میوزیک بوون و میوزیکیش، لێشاوێک غەریبەی کردە یاوەرانی بەئەزموونی هاوبەش.
بەڵام هەوڵەکانمان بەرەو ئەم دیاردەیە هەر بە هۆی پەتای کۆڤید نۆزدەوە نییە و هەموو ترسەکانی سەردەمیش تێیدا ناکاریگەر نین. کلینا گۆتمان، نووسەری کتێبی «سەمای شێتانە: سەما و پشێوی دەڵێت: «پێموایە ئەوەندەی گوشار، ڕێسا، بڕیار و بەڕێوەبردنی کات لەژیانمان زیاتربێت. زەروری بەرهەمهێنان و کارامەبوون هەڵدەکشێت و بە زیاتر کۆنترۆڵ و چاودێریکردنی شوێنە گشتییەکان. خەیاڵ، خەیاڵپلاوی و ئارەزوو بۆ واز لێهێنانی خود زیاد دەکات.» لەڕاستی دا وازلێهێنان لە ئایدیای کتێبی داری سەما هەیە. میلفۆد لە کتێبەکەی بۆ کۆمەڵی گەشەکردووی سەماکەران دەنووسێت: «هەستی وازلێهێنان، شتێکی لوتکەگر و هیوابەخشە». تاعونی سەما لە کتێبەکە بەئاڵۆزی وێناکراوە و هاوکات نوای فریودەرە.
بۆخۆی دەڵێت: «دەمویست لەسەر هەستی سەرسامبوون بەشتێکی سەرنجڕاکێش، ئەسیر و سەیر قووڵ ببمەوە. بەڕاستی جەزمبوونێکی تەواو دەروێشانەیە.»

**بۆچوونی سەدەکانی ڕابردوو**

هەمیشە ڕووداوە ئاڵۆزە بەکۆمەڵەکان، جێگەی سەرنجی هونەرمەندان بوون. لەهەوەڵەوە فریودەرێک لە لێکترازانی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی دایە، کە ڕێساکان شوێنیان دەدەن بەڕووداوی ڕوون نەکراوە و سەیر، بەڵام بۆسەمای شێتانە بابەتەکە هەر چۆکدادان، یان خۆ لەنێوبردن (بابەتێکی سەرنجڕاکێش بۆ هونەرمەندان) نییە و پرسی نارەزایەتی جەستەشە.
ئەمڕۆ، ئایدیای سەمای تاعوون زیاتر لەسەیر، وەک دیاردەیەکی ئازادیبەخش دەبینرێت. سەمایەکی بەردەوام تا دەکرێ ترسناک بێت، ئیغراکردنە. چ دەبێت ئەگەر تەواو واز لەخۆمان بێنین؟ چ دەبێت ئەگەر سەدان کەس لەدەوروبەرمان هاوهەست بن؟ بەڵام، هەمیشە بۆچوونی ئەم دیاردەیە ئاوا نەبووە.
گۆتمان لەکتێبەکەیدا ئاماژەی بەوە کردووە، کە تاعوونی سەما، بەدەر لەوبۆچوونەی هەبوو، سەردەمێک بابەتێک بوو، دەبوو بە شک و گومانەوە تەماشا بکرێت. لە لێکۆڵینەوەی لێروانینەکانی سەدەی نۆزدەیەم بۆ سەمای شێتانە، سەرنجی ئەو هەڵوێستە فۆبیایەی دا لەهزری ئیستعماریی و ترسەکان قۆنداق کرابوو. بەئاماژەکردن بەنووسراوە پزیشکی و مێژووییەکانی سەردەمی ڤیکتۆریا، کە لە توێژینەوەکانیدا لای بوون، گوتی نوسخەیەکی مۆدێرنیتەیان تێدا دەخرێتەڕوو، کە دژبەرە بە «ژنانەتر، ئاژەڵیتر، درندەتر و ڕامنەکراوتر».
لەدرێژەیدا گوتی: «گوتارێکی نەژادپەرستانە و سێکسیزمێکی زۆر بوو.» بەڵام ئەمڕۆ بۆچوون دەربارەی ئەم دیاردەیە جیاوازە و هەمان ژنانەیی و جەوهەری جیاواز و نائاساییبوونی سەمای تاعوون کێشی دەکات و بۆ هونەرمەند و بیرمەندی ئەمڕۆ هەم دیاردەیەکی مێژوویی دەگمەنە و هەم نموونەیە.
لەگەڵ هەموو ئەمانەش، ئایدیای سەنتراڵ ڕاستە. خەڵکانێک دەکەونە سەما و ناتوانن وازی لێبێنن، بەڵام بۆچی سەما دەکەن و بەدوای چ کەوتوون، پرسیارێکە وەڵامێکی دیاریکراوی نییە.
دەکرێت چەندان جار پرسیارێک بکرێت و پەیوەند بەویستی هەر یەکێک، وەڵامی جیاوازت دەستبکەوێت. شێتی، برسێتی، نارەزایی، ئازادیی، چێژ، جەزم، بەڵام لە دونیای خەیاڵ، لاقی سەماکاران تا ئەبەد بەڕیتمی نهێنیانەی خۆیان، بەردەوامە لەجووڵە.
**سەرچاوە:** www.bbc.com

> **«نزیکەی ٥٠٠ ساڵ بەسەر ئەم ڕووداوە سەیرەی «تاعونی مردن»ی ستراسبۆرگ تێدەپەڕێت و لەم ماوەیەدا زۆر تیۆر بۆ ڕوونکردنەوەی خرایەڕوو، کە هێشتە مۆڵەقی کردووین و بووەتە چاوگی ئیلهام بۆ داهێنەرانی نەدەبییسەما»**

# مۆزەخانەی لۆڤەر
# ئاوێنەی کلتووری جیهانیی

فەرەنسا وڵاتێکی گرنگە لە ڕووی سیاسیی و ئابووریی و فەرهەنگییەوە، ڕووبەری خاکەکەی ٦٤٢٨٠١ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە، ژمارەی دانیشتوانی زیاتر لە ٦٥ ملیۆن کەسە، لە ڕیزبەندی بیستەمین وڵاتانی جیهانە لە ڕووی چڕی ژمارەی دانیشتوانەوە.

فەرەنسا ئەندامی کۆمەڵەی گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان و یەکێک لە پێنج ئەندامە هەمیشەییەکەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتییە، لە کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی مافی بەکارهێنانی ڤیتۆی هەیە.

زمانی فەرەنسیی لە سەر ئاستی دونیا وەک زمانێکی جیهانیی ناسراوە و ڕۆژی ٢٠ی ئاداری هەموو سالێک، ڕۆژی جیهانیی زمانی فەرەنسییە، ئەوەش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، کە ڕۆژی ٢٠ی ئادار ڕۆژی جیهانی فرانکفۆنییە، واتە ڕۆژی ئەو گەلانەی بەزمانی فەرەنسیی قسە دەکەن، کە زیاتر لە ٣٠٠ ملیۆن کەس لەسەرانسەری جیهان بەو زمانە قسە دەکەن.

زمانی فەرەنسیی یەکێکە لە شەش زمانە فەرمییەکەی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانو لە پاڵ زمانە فەرمییەکانی (ئینگلیزی، چینی، ڕووسی، ئیسپانیو عەرەبی) لە کاروبارە فەرمییەکانی ئەو ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە بەکار دێت.



خەلیل عەبدوللا

وڵاتی فەرەنسا خاوەنی سەدان شوێنی مێژوویی و کەلەپوورییە، بەشێک لەو شوێنانە لەلایەن یونسکۆوە خراونەتە لیستی کەلەپووریی جیهانیی.

یەکێک لەو شوێنانە مۆزەخانەی لۆڤەرە، کە لە لایەن



یونسکۆوە خراوەتە لیستی کەلەپووری جیهانییەوە.

مۆزەخانەی لۆڤەر، گرنگترین و مەزنترین مۆزەخانەی کلتوورییە لە فەرەنسا و جیهان. لە لیستی کەلەپووریی جیهانیی یونسکۆ دانراوە. ئەو مۆزەخانەیە دەکەوێتە کەناری باکووری رووباری (سین) لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا. لە سەر رووبەرێکی بەرینی ٦٠٦٠٠ مەتر دووجا بونیادنراوە.

لۆڤەر سەرەتا قەلایەک بوو کە (فلیپ ئۆگوست)ی پاشای فەرەنسا لە ساڵی ١١٩٠ دروستی کرد بۆ پاراستنی شاری پاریس لە هێرشی دوژمنان. دواتر لۆڤەر بوو بە کۆشکی پاشایەتی و پاشاکان لەو کۆشکەوە کاروباری ولاتیان بەڕێوە دەبرد. لویسی چواردەهەم دوا پاشای نیشتەجێی ئەو کۆشکە بوو، ساڵی ١٦٧٢ ئەو کۆشکەی بەجێهێشت و چووە کۆشکی ڤێرسای، ئەو کۆشکە لە گوندی ڤێرسای دروستکرابوو کە ٢٥ کیلۆمەتر لە خۆراوای سەنتەری پاریسەوە دوور بوو، ئیدی ئەو کۆشکە بووە شوێنی حوکمڕانیو بەڕێوەبردنی ولات، تا هەلگیرسانی شۆڕشی فەرەنسا لە ساڵی ١٧٨٩ کۆتایی بە دەسەلاتی پاشایەتی هێنا.

ئیدی لۆڤەر وەک شوێنێکی کلتووری مایەوە و بوو بە شوێنی دانانی هەندێک بابەتی کەلەپووری و کەلوپەلی پاشاکان.

ساڵی ١٦٩٢ لۆڤەر درا بە ئەکادیمیاکانی نواندن و هونەر، ساڵی ١٦٩٩ یەکەم ساڵۆنی هونەری تێدا کرایەوە. ئیدی تا نزیکەی ١٠٠ ساڵ بەو شێوەیە بۆ کاروباری هونەریی ئەکادیمیاکان بەکار هات و مایەوە.

لەکاتی شۆڕشی فەرەنسا، کۆمەڵەی نیشتمانیی فەرەنسا بڕیاری دا لۆڤەر بکرێتە مۆزەخانەیەکی نیشتمانی و بابەتە کلتووریو کەلەپوورییە نەتەوەییە ڕەسەنەکانی ولاتانی فەرەنسا و جیهانی تێدا دابنرێت.

ڕۆژی ١٠ی ئابی ١٧٩٣ مۆزەخانەی لۆڤەر بە فەرمی کرایەوە، ئەو کاتە تەنیا ٥٣٧ تابلۆی تێدا دانرابوو.

ساڵی ١٧٩٦ بەهۆی هەندێ کێشە و کەموکورتی لە تەلارەکە، مۆزەخانەکە داخرا، ساڵی ١٨٠١ ناپلیۆن پوناپارت کێشە و کەموکورییەکانی مۆزەخانەکەی چارەسەر کرد و نوژەنی کردەوە و مۆزەخانەکەی بە ناوی خۆیەوە ناونا و کردییەوە، تا ساڵی ١٨١٤ بە ناوی ناپلیۆنەوە بوو، دواتر بۆ ناوە کۆنەکەی خۆی گەڕانەوەو کرایەوە بە مۆزەخانەی لۆڤەر.

ئەو مۆزەخانەیە مێژوویەکی دێرینی هەیە، بە مەزنترین و بەناوبانگترین مۆزەخانەی هونەری لە فەرەنساو سەرانسەری جیهان دادەنرێت.

ساڵانەی ٧-٩ ملیۆن گەشتیار سەردانی مۆزەخانەی لۆڤەر دەکەنو هەر گەشتیارێک دەبێت بری ١٥ یۆرۆ بۆ چوونە ژوورەوە



بدات، بەوەش داهاتێکی زۆر بۆ بەڕێوەبردنی مۆزەخانەکە پەیدا دەکات و حکومەتی فەرەنساش لە بودجەی خۆی هاوکاری دەکات.
لۆڤەر هەمیشە دەرگای بەڕووی گەشتیاران والآ بووە، بەڵام لە لە ساڵی ٢٠٢٠ بۆ ماوەی شەش مانگ دەرگاکانی کلۆم درا و هیچ کەس سەردانی نەکرد، ئەویش بەهۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی کۆرۆناوە بوو، کە ژیانی وەستاند و هەموو شوێنە گشتییەکان داخران.
مۆزەخانەی لۆڤەر دەوڵەمەندترین مۆزەخانەی کلتوورییە، زیاتر لە یەک ملیۆن پارچەی هونەریی لە تابلۆ و پەیکەر و بابەتی دیکەی کلتووری تێدایە. ئەم مۆزەخانەیە شوێنەوار و شارستانێتی فەرەنسا، گریک، ڕۆمان، میسر و میزۆپۆتامیای لە خۆگرتووە و هەریەکەیان لەشوێنی تایبەتی خۆیان بەشێوەیەکی ئەندازەیی ڕێکوپێک پۆلێن کراون و دانراون.
تابلۆی چەندین هونەرمەندی ناوداری جیهانی لەو مۆزەخانەیە دانراوە، تابلۆی (مۆنالیزا)ی نیگارکێشی مەزنی ئیتالی لیوناردۆ داڤینچی کە ساڵی ١٥٠٣ کێشاویەتی، بە جوانترین و سەرنجڕاکێشترین تابلۆی نێو ئەو مۆزەخانەیە دادەنرێت، زۆرترین گەشتیار لە دەوری ئەو تابلۆیە کۆدەبنەوە و بەسەرسامییەوە لێی دەڕوانن و وێنەی یادگاریی لەلایەوە دەگرن.
لە دوای تابلۆی مۆنالیزا، تابلۆی فرانسیسی یەکەمی پاشای فەرەنسا کە هونەرمەندی گەورەی ئیتالی (تیتان) کێشاویەتی، زۆرترین گەشتیار سەردانی دەکەن.
ئەوەی جێگەی سەرنجە لە ماوەی ٢٢٨ ساڵی تەمەنی مۆزەخانەی لۆڤەردا لە فەرەنسای چاوگی دیموکراسیو یەکسانی، هەر پیاوان بەڕێوەبەری ئەو مۆزەخانەیە بوون، تا ساڵی ٢٠٢١ لەسەر فەرمانی (ئیمانوئیل ماکرۆن) سەرۆک کۆماری فەرەنسا، ژنێک بە بەڕێوەبەری مۆزەخانەی لۆڤەر دانرا، ئەویش خاتوو (لۆرانس لی کاری) تەمەن ٥٢ ساڵ بوو، کە مانگی ئەیلولی ٢٠٢١ وەک بەڕێوەبەری ئەو مۆزەخانەیە دەستبەکار بووو تا ئێستا بەردەوامە لە کارو خزمەت. لۆرانس کەسێکی ڕۆشنبیرو شارەزای هونەرو کاری



مۆزەخانەیەو پێشتر بەڕێوەبەری مۆزەخانەی ئۆراسیای هونەری هاوچەرخ بووە. لۆرانس سەرپەرشتی ٢٠٠٠ فەرمانبەری مۆزەخانەکە دەکاتو بە فەرمانی ئەو کاروبارەکان بەڕێوە دەبەن، هەرچەند مۆزەخانەی لۆڤەر سەربەخۆیی داراییو کارگێڕی هەیە، بەڵام دەبێ ڕاپۆرتی کارو چالاکییەکانیان بۆ وەزارەتی کولتووری فەرەنسا بەرز بکەنەوە.
ماوەی ٢٣٠ ساڵە مۆزەخانەی لۆڤەر بەردەوامە لە کارو چالاکیو بەخششی کولتووریو وەک هێمای بڵندو ئاوێنەی ڕوونی کولتوورو کەلەپووری فەرەنسیو جیهانی ماوەتەوەو هەنگاو بۆ ئایندەیەکی باشترو پێشکەوتووتر دەنێت.

# حەیران، لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیی



هێمن سارمەمی

کاتێک گوێمان لە حەیران دەبێت، خەیاڵمان بۆ هەولێر دەچێت، بەتایبەتی ژیانی گوند و لادێ. حەیران تەنیا ئاوازێک نییە، لە دەنگە ژێیەکانی قورگەوە دەربچێت و لەبۆنە و بەرنامەکان بگوترێ، بەڵکو پێناسەکەی زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێ، وەکو: خۆشەویستیی و جوانیی و جوگرافیا و سروشت و مێژوو، کەلەپوور و هونەر.

لە حەیران بۆمان دەردەکەوێت، گەلی کورد خاوەن کەلەپووری ڕەسەنی خۆیەتی، لەپاڵ حەیران، لە هونەرەکانی دیکەی وەک: (لاوک و بەیت و هۆرە و بەستە)ش پارێزگاریی لە دەق و ئاوازەکانی هونەری کوردیی کراوە، هەرچەندە تایبەتمەندییەکانی ئەو هونەرانە لە ئەدا و دەق، لەگەڵ حەیران جیاوازیان هەیە، بەڵام بەگشتیی هونەرەکان پارێزگارییەکی تەواو لەئاواز و دەق دەکەن، چونکە هەر بەندێکی حەیران، وەک ڕۆمانێکی ئاشقانە، مانا و ڕیوایەتێکی مێژوویی هەیە.

یەکێک لە گرینگترین هونەری حەیران ئەوەیە، کە پاراستنی تەواوی لە وشە، کەلەپوور، کلتوور و فۆلکلۆری کوردیی کردووە، دەتوانین بڵێین دڵنیاترین سەرچاوە و ژێدەری وشە پارێزراوەکانی زمانی زەنگینی کوردییە.

هەرچەندە گەلی کورد، خاوەنی زەریایەک لە وشەی جوانە و مەبەستمە بەشێک لەو وشە جوان و ڕەسەن و فۆلکلۆریانەی کە لەنێو دەقی حەیران هاتوون، بەئێوە ئاشنا بکەم، کە دەمێکە زۆر بەکەمی لەهزر و بیری تاکی کورد ماون.

١- (لەمجێز) ئەو وشەیە لەحەیراندا بۆ کچ بەکارهاتووە، واتە ڕۆیشتنێکی جوان و بەلەنجەولار، بۆ نموونە حەیرانبێژ دەڵێ: «گەلی براینە ئەنگۆ بەچاوێ من بڕۆننە بەژن و بارایێ حەیرانەکەی من، ڕفت و ڕۆیینی چەندە لەمجێزە» واتە چەندە جوان دەڕوات.

٢- (گراو) ئەو وشەیەش بۆ ئافرەت بەکارهاتووە و مانای (یار یان دۆست) دەگەیەنێت، وەک لە حەیران هاتووە و دەڵێت: «ئەوڕۆ چاوم دەکەت بەکەونە گراوەکەی خۆم، برینی کەون و نوم دەکولاوە» یان دەڵێ «گراوەکەی من جوابان دەنێری».

٣- (پەرچەم شێ) واتە ڕەنگێکی سووری تاریک و تۆخ، ئەوەش بەزۆری ئەو قژانە دەگرێتەوە، کە لەخەنە دەنرێن. حەیرانبێژ لە وەسفی یارەکەی خۆی دەڵێت: «پەرچەمی شێتاری گەلە جوانە دێتە خواری بەسەر بڕۆیێ»

٤- (باجە ستێن) ئەو وشەیە لە حەیران زۆر بەکارهاتووە، واتە «وەرگرتن یاخود لێستاندن» بۆ نموونە حەیرانبێژ دەڵێ: «خۆزی بەخۆزی داران باجەستێنی ماچان بام لەکێژە سیان و مامەسێنیان» یان دەڵێت: «لەبەژن برندان، یان لەوان ناسکە کێژۆران، هەتا ...».

٥- (پێناو) بەو کەسە دەگوترێت، کە لەنێوان کچ و کوڕ پەیامی هەردوولای دەهێنا و دەبرد، بۆ نموونە دەڵێ: «نازدار حەیرانەکەی من جوابان دەنێری بەپلکە پێناوێ، برێنە کوڕەتیمە حەیرانەکەی من یان بێتە پێش بەمارێ دنیایێ یان دەستم لێ بەردە».

یاخود کوڕەکە بە پێناوەکە پەیامی بۆ یارەکەی دەنێری و داوای لێ دەکات لەنیوەی شەوێ بێتە ئەو شوێنەی بۆی دیاری دەکا، بۆ ئەوەی یەکدی ببینن، بۆ نموونە دەڵێت: «دەمگۆتە پێناوێ لۆم برێ حەیرانەکەی خۆم شەوێ لەسێباری نیوەی شەوێ وەکی پێرو ئاوابوو لۆم بێتە پەنای قاناتی بیرێ». لێرە کات و شوێنەکەش دیاری دەکات.

# حەیرانبێژ عیماد لاوە



ناوی (عیماد ئەحمەد حامید)ە ناسراوە بەعیماد لاوە لە ساڵی (١٩٨١) لەگوندی قەیباشی نزیک شارەدێی پردێ لەسەر زێی گچکە لەخێزانێکی جووتیار لە دایک بووە لەهۆزی (جاف)ە خوێندنی سەرەتایی خوێندووە، لە تەمەنی لاویدا حەزی بە گوتنی حەیران کردووە.

سەرەتا بەلاساییکردنەوە دەستی پێ کردووە، زۆربەی حەیرانەکانی شێخ نەجات شێراوەی گوتۆتەوە، چونکە زۆر سەرسام بووە بەدەنگ و حەیران و بەستەکانی.

دوای دابڕانێکی کورت، بەهۆی سەرقاڵی بەکاری ڕۆژانەی، دووبارە هاتەوە ناو کۆڕی حەیران و بەستەی میللی، بەڵام ئەوجارە دەیەوێ ڕێچکەیەکی تایبەت بەخۆی هەڵبژێرێت و لە تێکست و لە ئەدا کردن جیاوازبێت. چەند حەیرانێکی لە حەیراندانەر مامۆستا عومەرحاجی عەلی شەناغەیی وەرگرتوە.

حەیرانبێژ عیماد لاوە دەنگێکی زۆرخۆش و شارەزاییەکی باشی لەگوتنی حەیران هەیە، ئێستە لەگەڵ کاری ڕۆژانەی بەردەوامە لە حەیران گوتن.

**هەندێک لەحەیرانەکانی عیماد لاوە:**

حەیران

ئای براینە، نەم دەگۆ لەبەر درێ مامۆستا

عومەری شەناغە لەمن بەچەمە

گەلی دۆست و برا و برادەرینە، زەینی خۆتان بدەنێ، لەبەر درێ مامۆستا عومەری، ئەم دەگۆ شەناغە لەمن بەچەمە دەوجە

براینە، دەرێم ئەو سار زستانەکی گەلەسارد و سەرمایە،

وەڵا براینە ئەم دەگۆ، دایم و سەعات لەمن بەتەمە

ئەوە دەمگوتە برا و برادەران، دەوەرن لۆم بڕۆنە داخوازی بەژنی باریک و دووچاوێ کار و گەردەنی زەردی بەخار، کابانی گچکۆکەی مارێ، بەخودای بابی گەلەغەددارە، بەژنی باریکم ناداتێ، چبکەمێ درێ کاکێ نگۆ گەلە بەخەمە

* * * *

ئای بابە دەرێم قەیباشی لەمن بەڕووبار و دەوزێیە

گەلی دۆست و برادرینە، دەوەرن زەینێ خۆتان بدەنێ، ئەم دەگۆ قەیباشی لەمن بەدەو ڕووبار و زێیە، دەوجە براینە، دەرێم بەخودای سەرێ چەند سارانە مارێ نازدار حەیرانەکەی منی لێیە

ئەدی براینە، ئەم دەگۆ هەتا ئەوێ ڕۆژێ دەمرم، هەناسەم لەبەر دەبڕێ، هەرچاوم لێیە

**• ئەو دوو حەیرانەی سەرەوە لە دانانی (مامۆستا عومەر حاجی علی شەناغەیی)ە**

حەیران

براینە ئەمن دەرێم، بریا کوریکەک بومایێ لە



کوریکێ هێرۆیێ

هەموو دانێ سبەینان، لەبۆخۆم شین بوومایەوە لەسەرێ سەفینێ، ناوەڵا براینە دەبا شین بوومایێ لەبانان لە بانیی کۆیێ

دەوجە برایە، دەمگو سەبارەت بە کورپە کیژۆرەکانی غەرابەی عەزیز ئاغە و بۆگد و شیوەجانێ

وەی بابە، ئەم دەگو گەلەجوانن وەکی بەکۆمەر دەگەرێنەوە لەبەرایی زێێ

حەیران

ئەرێ براینە دەرێم ئەوە قەیباشی لەمن بەزەل و زێیە

گەلی دۆست و براو برادەرینە، دەوەرن زەینێ خۆتان بدەنێ، قەیباشی گەلەخۆشە، لەمن بەزەل و زێیە

ئەرێ براینە، ئەم دەگۆ مارێ بابێ حەیرانەکەی من، پێش لە نساری پشت لەڕۆژێیە

وەکی هەموو دانی سبەینان، زەینێ خۆم دەدا بەژنی بارک و دووچاوێ بەرەک گەردەنی زەردی بەخاری، لەگەر کۆمەرەکی دەستە خوشکان دەهاتەوە لەڕێی زورگەزراوێ، وەی بابە دەمگۆ چەندە جوانە بەخودای خرخاری لەپێیە

حەیران

براینە، دەرێم ئەوە گەوارەکی دادەمەزاند، لەسەرێ سەفینی ئەوەتەڕ دەکاتەوە ناودارۆکان، سەرێ زیارەت و خوران قەراسنجی سەرێ و خوارێ، بابە ئەم دەگو چەندە جوانە وەکی تەڕدەکاتەوە دەربەندێ گۆمەسپانێ

ئەمن دەمگو، بریا باجگر و خەرجە ستێنی ماچەستێنی ماچان بام، هەموو فەسلێ بەهاران لە دەرکەی گۆمەسپانێ

سەبارەت بەکورپە کیژۆرەکانی هەولێرێ، برام ئەم دەگۆ گەلەگەلە جوانن، بەخودای وەکی دێن لەبۆ کەیفە و سەیرانێ

**ئامادەکردن و نووسینەوەی:**

**هاشم حاجی عەلی شەناغەیی**

# خوێندنەوەی کتێب

- **چیرۆکی بینراو**

برووس بلۆک - و: بەناز کەمال - خوێندنەوە: سەلاح جەلال

- **دەستنووسی پیترسبۆرگ ڕۆمانێک بە تامی مێژوو**

پێشڕەو تەها

# چیرۆکی بینراو

نوسینی: برووس بلۆک
و: بەناز کەمال
خوێندنەوە: سەلاح جەلال

چیرۆکی بینراو گرنگترین کتێبی تیۆری پراکتیکی جیهانی سینەمایە، وەرگێڕی بەتوانا (بەناز کەمال) پاش وەرگێڕانی کتێبی (بەتیشکۆ تەماشا کردنی سینەما) لەگەڵ خوێندنی ماستەرەکەی لەزمانی ئینگلیزیی لەزانکۆی (ساوز وێڵس) ئەم کتێبە گەوهەرییەی وەرگێڕایە سەر زمانی کوردیی.

چیرۆکی بینراو تیۆرێکی زانستی سینەمایی کەم وێنەیە، بە پێکهاتە هونەرییەکانی وێنەی بینراو لەسەر چەمک و بنەمای زانستیی. بەرهەمهاتووی زەمەنێکی دوورودرێژی وانە گوتنەوەی (برووس بلۆک)ە بەرهەمهێنەری فیلم و نوسەرێکی ئەمریکی ناودارە، سەرەتا وەک بەڕێوەبەری بانگەشەی بازرگانیی و فیلمی کارخانەکان و کارتێکەری دەنگی لە هولیوود، کالیفۆرنیا دەست بەکاربووە، ماجستێری لە کۆلێژی هونەری سینەمایی لەزانکۆی کالیفۆرنیا لە لۆس ئەنجلوس بەدەستھێناوە. چەندین کتێبی بەنرخی لەبواری دەرهێنانی فیلم و دراما و هونەردا هەیە.

نوسینی ئەم کتێبەیشی لەزانکۆی سەوزی کالیفۆرنیا بە بەشداری لەگەڵ هەزاران خوێندکاری پۆلی هات و ڕۆیشتوی زانکۆکە و سیمینار و ئەکادیمیای فیلم و کۆمپانیای دیزاین و بڵاوکراوە و ستۆدیۆی وێنەی جووڵاو لەهەمو جیهان و کارکردن لەگەڵ ئەزمونی کار و بواری بڵاوبونەوە و دیکۆمێنتەری و ڤیدۆیی و ویبسایت و نمایشە تەلەفیزیۆنیە زیندووەکان و فیلمی کارتۆنی درێژ و دەست بەکاربونی لەهولیوودە.

سەرەتای هولیوود:

لەشەوێکی زۆر ساردی زستانی ١٩٢٨ لە ڕووسیا لەهۆڵی خوێندنی فیلم، ژورێکی زۆر درێژی سارد و سڕ، لەبنمیچەوە بۆ زەوی ئاوێنە و ڕەنگی پایەکانی سپی، کۆمەڵێک خوێندکار کۆبونەتەوە (ئیزنشتاین، سیڤۆلۆد، پۆدۆڤکین، ئەلیسکاندەر دۆڤینچکو) یەکەم کەس بون ئەزمونی خۆیان بۆ دروستکردنی فیلم دامەزراند.

ئازینشتاین سەرۆکی بەشی فیلم لە(USC) بووە، دوای مردنی لەساڵی ١٩٥٠ ڤۆرکاڤێچ بووە بەسەرۆک و لەساڵی ١٩٥٥یش لیستە نۆڤرۆس دوای ئەویش برووس بلۆک دەبێتە سەرۆک. سینەمایش بەهۆی هولیود و دوایی کالیفۆرنیا و بۆمبای هیندی و ڕۆڵی قوتابخانەی تەعبیریی ئەڵمانیی و قوتابخانەی پێشڕەو و واقیعیەتی شیعری فەرەنسیی و درێژبونەوەی ئەو دوانە بۆ واقیعییەتی فەرەنسیی و قوتابخانەی ئیتاڵیی پێشکەوت و لە ڕەوتی کلاسیکی و تەقلیدییەکان دەرچو.

بەر لەوەی بچینە نێو زریانی چیرۆکی بینراو چۆن و بەچی شێوازێک بیخوێنینەوە؟ ئەم کتێبە تیۆرێکی بنەڕەتییە بۆ شێوازی وێنەی جووڵاو و سکرین و چوارچێوە و سێ


برووس بلۆک- نووسەری کتێبەکە

گۆشە و هێڵ و شێوە و تەن و ڕەنگ. هەموو شێوازە هونەرییەکانی وێنە گرتن. ئایا دەتواندرێت بەرهەمهێنانی فیلم و درما و کاری شانۆیی بەرهەمهێن بکرێت؟ بەو هەموو ئامراز و ئامێرە پێشکەوتوانەی فیلم و تیۆر و تەکنیک و بوونی پارەی خەیاڵی و ئەو هەموو حەشامەتە هونەرمەندە، ئەو خاڵانە کۆبکرێنەوە و ماڵی هونەر دروست بکرێت؟ هەتا ڕیشەیەکی تیۆری و شوناسێک بۆ سینەمای کوردیی دروست ببێت. هونەر لەخواستراو و بازاڕ و هەرکەس بۆ خۆی بهێنرێتە نێو پڕۆژەیەکی زانستیی.

مێتۆدی ئەم کتێبەیش پێویستی بە پراکتیک هەیە لەنێو ستۆدیۆ، چۆن وەک تیۆری سینەما بتوانین لە پڕۆژەکانماندا ئەکتەر کار پێ بکەین؟ ئەم تیۆرە تایبەت بۆ ئەمریکییەک نەنوسراوە، پەیوەندی بەهەمو کەسێکی بیر کەرەوەوە هەیە، داهێنەرانی سینەما لەهەر جێگەیەک بن، بۆ ئینگلیز، فارس و هیندییەک وەک یەکە، سینەما پیشەسازییەکی فرە لایەنە، فیکر و داهێنانە.

بۆ هەمو هونەرێکیش بناغە و دامەزراندن هەیە، جیاکردنەوەی هونەری سینەما کورتکراوەی وێنەگرتنی سینەماییە، تەکنیک و هونەری نمایش و گرتە و وێنەگیراوەکان دەگرێتەوە، بۆ دروستکردنی سروشتی جوولە لە ڕێگەی ئامێرە ڤیدیۆییەکانەوە. ئایا هەتا چەندە دەتوانرێت گەشە بەئەزمونی سینەما بدرێت؟ چۆن ئەم تیۆرە لەگەڵ چەندین کتێبی دیکەی گرنگی تیۆری بەزمانی کوردیی وەک: کتێبی (وێنەی جوولاو)ی پڕۆفیسۆر (دڵشاد مستەفا) و (چۆن فیلم بنوسین) و (کارەکتەری سینەمایی) و(سکرینپلەی) سێ کتێبەکەی کاک (دارۆ عەزیز) و چەندین کتێبی دی گرنگ. پراکتیک بکرێن؟ پرسیارەکەیش لەوەدایە چۆن ئاستێکی بەرهەمهێن و شوناس و ڕیشاڵێکی تیۆریی لە ستۆدیۆیەکی هونەریی بۆ سینەمای کوردیی بەرجەستە دەکرێت؟

بەکورتی، تیۆر گەشەسەندنی زانستیی و هونەرییە، بایەخی نابێت هەتا کارێکی هونەریی باڵای لەسەر نەکرێت لە ڕوی پیشەسازیی و فەلسەفیی و داهێنەرانەوە تێگەیشتنی تەواو بۆ مرۆڤایەتی دروست نەکات. هونەری تیۆری فیلم تایبەتمەندییەکی ئەکادیمییە ئامانجی دەرخستنی ناوەرۆکی سینەمایە لەو پەیوەندییانەی فیلم بە واقیع و هونەرەکانی دی و بینەرانەوە هەیەتی و لە هونەرەکانی دی جیا دەکرێتەوە.

هونەری وێنەی جوولاو لە سینەما و درامای تەلەفیزیۆنی و نمایشی شانۆیی کاری تاکە کەسیی نییە وەک لەژانرەکانی دی ئەدەب هەیە، کارکردنی نێوان بنچینە و پراکتیک کارێکی جەدەلی پەرەسەندوی جوولاوە و بەهاوکاری گروپێکی زۆر لە هونەرمەندان و لەڕێی ستۆدیۆیەکی هونەرییەوە ژانراکانی ئەو بەرهەمە لە گوتاری هونەریی بەرهەم دەهێندرێ.

سینەمایش بەو هەمو تایبەتمەندێتی و کارتێکەریانەیەوە، کە لەسەر ڕای گشتی هەیەتی و بەو تیشک خستنەی دەیخاتە سەر وێنەی کۆمەڵگە لەسەر سینەمای خۆراوایی و لەڕوی سیاسیی و سینەماییەوە فیلم ناوەندێکی سینەمایی بیستراو و بینراوە و دەکرێت زۆر کارتێکەر بێت بۆ بیری سیاسیی بەهێزترین هۆکاری بڵاوبونەوەی جەماوەرییە و کاردەکاتە سەر سیاسییەکان و سیستەمی دەسەڵات و بەها و پەرستگەکان و قوتابخانە سینەماییە گەورەکان بۆ هۆشمەندیی وێنەی سینەمایی و ڕەوتەکانی.

لینین کاتێک فیلمی ڕەگەزپەرستی (جریفێس)ی بینی

**ئەم کتێبە تیۆرێکی بنەڕەتییە بۆ شێوازی وێنەی جووڵاو و سکرین و چوارچێوە و سێ گۆشە و هێڵ و شێوە و تەن و ڕەنگ**

کارتێکەری سینەمای لەنێو هونەرەکانی دیکە و لەسەر ئیدای ئایدۆلۆژی سەر جەماوەر، بەگرنگتر دانا.

جێگەی داخە پاش دروستبوونی دوو ئەکادیمیای هونەر لە هەولێر و سلێمانی نەتوانرا ئەم کارە بکرێت و زۆر کەس سودمەندبوون و پارەیەکی زۆریان بەناوی فیلم و دراماوە وەرگرت و سەربەخۆییانە کارێک دەکەن هیوای بینەران نییە. بەهۆی تیڤییەکان و کاری لابەلاوە پارەی خەیاڵیان لەبەر دەست دایە و دراما و فیلمێکی پڕ لە کەموکورتی بەرهەم دەهێنن، دەیەها کەسی نا هونەرمەندیش دەهێنن و ڕۆڵیان دەدەنێ و دەبنە هونەرمەندی کارتۆنی. چۆن لێرە پرسیار بکەین؟ لەسەر بەها و توانا و باری کارەکتەر لەزمانی جەستە و ڕاهێنانی جەستەیی و خۆ ڕۆشنبیرکردن و ئەزمون و داهێنانەوە و پەیوەندی کارەکتەر بەکارە هونەرییەکەوە. ئەمە و زۆر هۆکاری دی داهێنەریان بێ بەش کردووە. جێگەی سەرسوڕمانە لەم ساتە وەختە، بەهۆی گەندەڵییەوە

ناتواندرێت ستۆدیۆیەکی پرۆفیشناڵ دابمەزرێت؟ فیلم و دراما و نمایشی شانۆیی دەچنە نێو تۆڕی تیڤی و ئینتەرنێت و بڵاودەبنەوە و ئێمە و جیهانیش دەیانبینین، وێنەی شارستانیی و بوونمانە. ئیدی فیلم بانگەشەی تەکنیکی ڕۆشنبیرییە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هۆگری مادە هۆشبەرەکان و باری تەندروستیی و دیاردەی سیاسیی و کۆمەڵایەتی و گەندەڵیی و ڕووداوەکانی ئایندە. نابێت کاری پڕ لەکەموکورتی بکرێت.

## ئامانج لەکتێبی چیرۆکی بینراو

ئامانجی ئەم کتێبە گەڕانە بە دوای بیروبۆچون، سایکۆلۆژیا و هونەرە بینراوەکان و شانۆ و مێژووی هونەر بۆ هێنانە کایەی بیردۆزی فیلم و بەستنەوەی بە پێکهاتە و چیرۆکەوە بۆ شکاندنی دیواری نێوان بیردۆز و کار پێکردن. هەتا پێکهاتەی بینراو ئاسانتربێ بۆ تێگەیشتن. شێوەکانی تەلەفیزیۆن و دۆکومێنتەری، بڵاوکراوە، یاری کۆمپیوتەری، سایتی ئینتەرنێت، ڤیدیۆی گۆڕان، ئەنیمەیشن، شیکراونەتەوە، بۆ فیلم، یان وێنەی دیجیتاڵی گەورە و بچووک دروست بکرێت، پێکهاتەی بینراو لەنێو وێنەکە چاودێری کراوە و وەک چیرۆکەکە گرنگە. چۆن پێکهاتە نەبینراوەکان دابمەزرێت؟ یان نۆتەی میوزیک ژەنێک. دۆزینەوەی پەیوەندی لەنێوان پێکهاتەی چیرۆک و پێکهاتەی نەبینراودا دەدۆزێتەوە. ئەم کتێبە ڕێ نیشاندەرە بۆ نوسەران و دەرهێنەران و فۆتۆگرافەران و دیزاینەران و بەرهەمهێنەرانی دەرهێنانی هونەریی و مۆنتاژ.

چاپتەری یەکەم: دارشتنی سیفەتەکانی بینراو هەموو شتێک وێنەیە، کتێب، گۆڤار و مۆزەخانە، وێنەی وەستاون. وێنەی جووڵاویش لەفیلم، کۆنسرێت، تەلەفیزیۆن و شانۆ دەبینرێن. یاری ئینتەرنێتیش وێنەی جۆراوجۆریان تێدایە.

هەمو وێنەیەک لە چیرۆکێک و بینراوێک پێکهاتووە و هەندێک جار دەنگیشیان لەگەڵ دایە. وێنەیش سێ بەردی بناغەی هەیە: (چیرۆک، دەنگ، بینراوەکان).

تێگەیشتن و دەست بەسەر داگرتنی پێکهاتە بینراوەکان بەدارشتنی کارەکتەرەکانەوە پێکهاتەی سەرەکی بینراون: (مەودا، هێڵ، قەبارە، تۆن، ڕەنگ، جووڵە و ئاواز) لەوێنەی جووڵاو و وەستاو دەبینرێن.

مەودا سێ جۆر بۆشایی بینراوی هەیە: (جەستە، بۆشایی، ناوسکرین، قەبارەکەی هێڵ، قەبارە، تۆن، ڕەنگ و جووڵە. میوزیکیش ئارەز و هەست دروست دەکات. دەنگ نیشانەی تۆقێنەر بەبینەر دەدات، بۆ ترساندن و تۆقاندن و شڵەژاندن.

چەند زاراوەیەکی گرنگیش بەکورتی شیکارییان بۆ کراوە:

١- سکرێن: دوو دووری ئاسۆیی و ستوونی هەیە، تەماشای وێنە دەکەین تیایدا.

٢- جیهانی ڕاستی نێو سکرێن: ئەو سێ دوورییەیە تیایدا نیشتەجێ بووین.

٣- بەردەم سکرێن: (ئێف جی) بۆ مەودای بەردەم سکرێنەکەیە، (ئێم جی) بۆ ئەو شتانە بەکاردێن و دووریان لەسکرێنەوە مامناوەندە (بی جی) ئەو شتانەی بەکار دەهێنرێن لە باگراوند دان و زۆرترین دوورییان لەکامێراکەوە هەیە.

پەنجەرەی وێنەی هێڵەکان ئەو چوارچێوەیەیە لەسکرین دەوری هەمو بینراوێک دەدات. زنجیرەی بەیەکگەیشتنی بینراوەکان بەیەک شت دەست پێدەکات و دەگۆڕدرێت بۆ شتی دی. ئەم کتێبە پلان دانەرە بۆ وێنەگرتنی فیلم.

چاپتەری دووەم: دژیەک و لەیەکچوو. پێکهاتەی بینراو لەسەر بنەماکانی دژیەک و لەیەکچوو دروست بووە.

دژیەک پێکهاتەیەکی بینراوی چڕییەتی داینامیکە. لەیەکچو پێکهاتەیەکی بینراوی لاوازە، دژیەک و لەیەکچوو کلیلی پێکهاتەی بینراوەکانن لە یاساکانی دژیەک، لەیەکچوون و کارکردنە لەسەر تۆنی (خۆڵەمێشی و ڕەش و سپی) دەتواندرێت هەموو کارێکی باشیان لەسەر دروست بکرێت، بەکەم کردن و زیادکردن، تەختەی چیرۆک کۆمەڵێک وێنەیە بۆ پیشاندانی شێوە فیلم. جیاکردنەوەی ڕەنگەکان دەبنە نیشانەی قووڵ بەسەر ڕەنگی گەرم (سوور، پرتەقاڵیی و زەرد) و ڕەنگی ساردیش (شین و سەوز).

هەمو پێکهاتەیەکی بینراو (مەودا، هێڵ، قەبارە، تۆن، ڕەنگ، جووڵە و ئاواز) دەتوانرێت دژیەک و لەیەکچوونی تێدا بەکار بهێنرێت. ڕۆیشتنی گالیسکەیەکی ئاسنی نێو چەرخ و فەلەک وێنەیەکی چڕە و نوستنی توتەڵە سەگێک وێنەیەکی چڕ نییە و بەپێی ستۆریبۆردی فیلمەوە کار لەسەر چڕی دەکرێت.

تیشکۆیش مانای ڕوناکی شتەکانە لەچوارچێوەی وێنەی ڕوون و لێڵ وێنەی سریدییەکان واتای سێ ڕەهەندی چیرۆک گێڕانەوە، ئەو وێنەیەی بەهۆی دوو وێنەی سکرینەوە دروست دەکرێت. سێ جووڵەی کامێرا ( پان، لارکردنەوە و زووم) ڕووی تەخت دروست دەکەن.

چاپتەری سێیەم: (مەودا) پێکهاتەی بینراوی ئاڵۆزە، کاتێک پێناسە دەکرێت پێکهاتە بینراوەکان لەسکرینەکەدا

دەبینرێت و مەودایش لەکۆمەڵێک پێکهاتەی دی دروست بووە. ژیانی ڕاستەقینە سێ دووریی هەیە، بەرزیی و پانیی و قووڵی. سکرین تەنیا دوو مـەودای هەیە، فیلم و تیڤی و سکرینی کۆمپیوتەر مەودایەکی تەختیان هەیە بەرزیی و پانییان پێ دەپێورێت. شێوەی سکرینی دوو دووریی و کارکردنی بۆ سێ دووریی و هۆلۆگرام شی دەکاتەوە. لەمەودای قووڵ و بەڵگەی قووڵیی و بینین و وێنەی دوو دیگە چەند نموونەیەکی لاکێشەیی خاڵی ونبوون لەیەکەوە هەتا پێویستی خاڵی بەیەک گەیشتن بۆ دروستکردنی قووڵی.

لەبەشی یەکەم، لەگرنگترین پێکهاتە ناسەرەکییەکان، چوار نیمچە پێکهاتەی مـەودایـە (مـەودای قـووڵ، تـەخت، کـراوە و داخـراو) گرنگترین جـیـاکـردنـەوەیـش جیاوازیی قەبارەیە بەنیشانەی (ئیف جی) لە بـەردەم کامێرا و نیشانەی (بی جی) لەباگراوند و نیشانەی (ئیم جی) لە ناوەند.

لەبەشی دووەم: چـوارچـێـوەکـە شـێـوێـنـە لاوەکـیـەکانـە و سـوودبـەخـشـن بۆ شوێن. وەک ڕوو، یان لەشێوەی ڕێژەیی، شێوەی ڕوو تەختێک لە دروستبوونی بۆشایی لەدەرەوەی سکرین یاساکانی جیاوازیی و لەیەکچوون بە بۆشاییەوە دەبەسترێنەوە، شیکردنەوەیشی زۆر قووڵ دەبێتەوە لەشێوەی ڕێڕەوی پەیوەندیی نێوان پانیی و بەرزیی و شێوەی ڕێژەیی چوار چێوەی فیلم، قەبارەی چوارچێوەکە و شێوەی ڕێژەی دیجیتاڵی پرۆفیشناڵەکان لەسینەما بەکار دەهێنرێت. شێوەی ڕێـژەی سکرین قەبارەی وێنە و سکرینەکە دەست نیشان دەکات.




شێوەی هێڵی چوارچێوە و سێ گۆشە و لاکێشە و دابەشکردنی ڕووتەخت. بۆشایی کراوە و داخراو باسکردنە لە هێڵی چوارچێوەکە، کە دەوری زۆربەی وێنەکانیان داوە، سکرێنە گەورەکان بەتایبەت زەبەلاحەکانی ئایماکس، یاخود سینەمای ئاسایی دەتوانن بۆشایی کراوە دروست بکەن. جووڵەی بەهێزی وێنەیش وەک چەکێک دژی بۆشایی داخراو بەکار دەهێنرێن، ئەگەر لەنێو چوارچێوەکە دابێت، هێڵە وەستاوەکانیش لەنێو چوارچێوەکە لاببرێن. هەتا هێڵی وەستاو لە گرتەیەک زۆر ببێت بۆشایی داخـراو زیاتر داخراوتر دەبێت.

دیمـەنـی جـیـاواز و شـوێـنـی بینراوەکان زیـاتـر پـەیـوەسـتـن بە بنەمای لەیەکچوون و دژ بەیەکەوە. دەکرێت لـەنـێـو گـرتـەیـەک بۆ یـەکـێـکـی دی بـوونـی هەبێت، نموونەی چەند فیلمێک دەهێنێتەوە و بەچەند بەشێکی گرنگیش شیکاریان دەکات:

نیشاندانی بۆشایی قووڵ، بۆشایی تەخت، دابەشکردن، ڕووتـەخـت، بـۆشـایـی سنووردار، بۆشایی نادیار، دابەشکردن و ڕووتەختە.

چاپتەری چـوارەم: هێڵ و شێوە. هێڵ لە هەموو شوێنێک هەیە، دەرچەی دەرگا شێوەی لاتەریبی هەیە، تۆپی باڵە شـێـوەی بازنەیی هەیە، جیاوازیی تۆن و ڕەنگ لەدەرکەوتنی هێڵەوەیە. ڕەنگە هێڵ دەربکەوێت، یان بشاردرێتەوە، لکاندنی خاڵەکانی نێو چوارگۆشەیەکە لە ڕوانینی بینەرەوە. بەرهەمەکە پێویستی بە ڕووخساری تاریکبوو هەیە و دیمەنەکان تاریک دەکرێن و ڕەنگاوڕەنگ تیایدا دەردەهێنرێت.

لێوار هێڵێکە بەدووریی شتێکی دوو دووریدا بێت. داخستنیش لە خەیاڵی بینەرەوەیە. لە یەکدی بڕینی

وێنەکان و یەکگرتن و بڕینی دوو وێنە وا دەردەکەوێت هێڵێک دروست بووە. لاسایی کردنەوەیش بەهۆی دوورییەوە دروست دەبێت. تەوەریش زۆربەی شتەکان تەوەری نەبینراویان هەیە بەدەوریان دەجووڵێنەوە. ڕێڕەو و ڕێچکە شتێکی جوولاوە نموونەی ڕێڕەوی ڕاستیی وێنەی فڕۆکەیەکی دوکەڵدارە، کە دوای خۆی هێڵێک بەجێ دەهێڵێت. ڕێڕەوی نادیاریش هێڵێکی بینراوە خۆمان دروستی دەکەین.

بیرۆکەی هێڵی هەر وێنەیەک بچووک بکرێتەوە بۆ چەند هێڵێکی سادە لە کۆمەڵێک بازنەی ڕێک، ستوونیی، ئاسۆیی و لار پێک دێت.

جیاوازیی لە یەکچون بەسێ ڕێگە هێڵ لە ناوی بەکار هێنراوە: (ئاراستە کردن، ڕێنمایی و جۆرایەتی). کارکردنە لەسەر هێڵی لار و ئاسۆیی و ستوونیی لەشێوەی گۆیی و شەش پاڵو هەرەمی سێ دووری لولەک، قوچەک، شێوە لەبۆشایی هێڵ، شێوە سەرەکییەکانی بازنە، چوار گۆشە، سێ گۆشە، گۆشە و وەستاو هەیە. بەدوو دووریی بۆ بە بۆشایی قووڵ دادەنرێت. جیاوازیی و لەیەکچوون لەنێو شێوە دوو دوورییەکان بازنە و سێگۆشە زۆرترین جیاوازییان هەیە لەبەکارهێنانی شێوەی سێ دووریی شێوە گۆیی و هەرەمی و سێ لا زۆرترین جیاوازییان هەیە، ئەگەر پێکەوەبن. شێوەی سێ دووریی دروست دەکەن.

١ - دەست بەسەر داگرتنی شێوە و هێڵ لەکاتی بەرهەمهێنان، چاو داخستن و هەڵسەنگاندنی ڕووناکیی و جووڵاندنی نەخشە بۆکێشراو و ستوریی بۆردێکی بیرۆکەی هێڵی.

٢- هەڵسەنگاندنی شێوەیش: أ ئەکتەر. ب. دیمەنی جلوبەرگ. ج. دەست بەسەر داگرتنی ڕووناکی.

٣ - ئاسان کردنەوە.

بۆ شێوەکانی هێڵی لار و شێوەکان و بۆشایی و چەند فیلمێکی ناوازەی بەنموونە هێناوەتەوە.

چاپتەری پێنج: تۆن. تۆن مەبەستی ڕادەی ڕووناکیی شتەکانە بەپێوانەی خۆڵەمێشی دەپێورێت.

چەند ڕێگەیەکیان هەیە، وەک دەست بەسەر داگرتنی پێوانەیی خۆڵەمێشی و زاڵبوون بەسەر شەوق دانەوەیان، یان دروستکردنی سێبەر و دەست بەسەر داگرتنی ڕووداوەکان و پیشاندان و دەست بەسەر داگرتنی تۆن لە بەرهەمهێنان. بۆ تۆنی جیاواز بەرهەمەکە ڕووخساری تاریکی ویست دیمەنەکان تاریک بکرێت و ڕەنگاوڕەنگ دەربهێندرێت. باشترین نموونەی دەست بەسەر داگرتنی ڕووناکی لەفیلمە تاریکەکان دەبینرێن، وەک فیلمەکەی (ڕۆمان لانسکی و ستیڤن فرێزر). جۆری پیشاندانیش لەسەر هاوێنەی کامێراکە بخرێتە سەر ستۆپ، هەمو وێنەکە، یان تاریک دەبێت، یان ڕوناک. ئەم گرتەیە بۆ دەرخستن و شاردنەوەی بکەری دیار و نادیار دەبێت. بۆ هەریەک لەم شێوازانەیش چەند فیلمێکی بەنموونە هێناوەتەوە.

چاپتەری شەشەم: ڕەنگ. تێگەیشتنمان بۆ ڕەنگ چۆنییەتی کارکردنیان شتێکی کار پێنەکراوە. ڕووناکی ئۆتۆمۆبێلێکی سپی لەبەر خۆر ڕابگرین ڕەنگی سپییە، هەمان ئۆتۆمۆبێل لەشوێنێکی تاریکدا ڕابیگرین ڕەنگی دەگۆڕدرێت بە مەیلەو سور. لەم چاپتەردا شیکارییەکی ورد لەچەند بەشێک دەکات:

لەپەیڕەوی ڕەنگەکان بەسیستەمی چاککردن و تێکەڵ کردن ڕەنگی زیادکراو پەیوەستە بە تێکەڵکردنی ڕووناکیی ڕەنگ دارەوە، ڕەنگی سێیەم دروست دەبێت و بە چەرخی ڕەنگەکان لەپەیڕەوی زیادکراو ڕەنگەکان گۆڕانیان دیاری دەکرێت، ڕەنگی کەمکراوی ڕەنگەکان بە تێکەڵکردنی بۆیە و بۆیاخ و ڕەنگ بەکار دەهێنرێن. لەچەرخی ڕەنگەکان لەپەیڕەوی زیادکراو، یان کەمکراو پێکهاتە سەرەکییەکان ڕەنگ و جۆری ڕەنگ و ڕادەی ڕووناکیی و ڕادەی تێری و ڕادەی بریسکەداریی، یان ڕووناکیی دژی ڕادەی تێری و جۆری ڕەنگ و ڕەنگە جیاوازە تەواوکەرەکان و کەرتکردن بۆ سێ ڕەنگ و بۆ چوار بەش و پاڵێتی ڕەنگ و فلتەرەکان و فلتەری ڕووناکیی کات و شوێن و وێنەی فیلم و وێنەگرتنی دیجیتاڵی و تاقیگەی پەرەپێدان و کات دانان بۆ وێنە کیمیاوییەکان و وێنەی دیجیتاڵی. شێواز و گۆڕانکاریی ڕەنگەکان بەشێوەیەکی زانستیی شی دەکاتەوە.

چاپتەری حەوتەم: باس کردنێکی زۆر قووڵە لەسەر جووڵە، زۆربەی فیلمە دیکۆمێنتەرییە مێژووییەکان و زۆر فیلمی دی جووڵەیان تیا نییە، لەوانەیش فیلمەکەی (کریبس مارکەر) لالێتی. لەگەڵ ئەوەیش جووڵە هەیە، لە فۆتۆگرافە وەستاوەکانیش زۆر جۆری جیاواز دروست دەکرێن. زنجیرەیەک تیری نیۆنی نەجووڵاو لەسەر جادە دەبینرێن، دەتوانێت. لەبازنەی لاکێشە و چوار گۆشە بازنەی ڕەش و سەوز بەنموونە لە جیهانی سکرێن وێنەی جووڵاو دروست دەبێت شتێک بجووڵێت جیاکاریی

و گۆڕانکارییەکانی جووڵاو و بینراو بەهۆی ڕێڕەوی (ئێف جی) و (بی جی)ەوە دروست دەبن. لەچەند بەشێکی گرنگ شیکاری جووڵە دەکات: جووڵەی تیرێک بنوێنێت. ڕاستەقینەی دیار، هاندراو، پەیوەندیدار، جووڵەی سادە و ئاڵۆز، درێژیی سکرینەکە دیاری دەکات و نموونەی زۆری هێناوەتەوە لەسەر هێڵی ڕاست و لار و کەوانەیی و ئاسۆیی و یەکتربڕ بە بەراوورد لەگەڵ جووڵەی کامێرا. جووڵاندن و بێ جوڵەیی و لاربونەوە لە زووم و هاوسەنگیی و ناهاوسەنگی و پێوانەیی جووڵە و خێرایی فرەیمێک، یان چوارچێوەیەک لەبیرەکەی و بەردەوامی جووڵە و بەردەوامی لە گرتەیەکەوە بۆ گرتەیەکی دی و دەست بەسەر داگرتنی جووڵە لە بەرهەمهێنان، ئاماژەیش بەکۆمەڵێک فیلمی گرنگ دەکات بۆ بەراووردکاری لەنێوان گۆڕانی جووڵەکان.

## چاپتەری هەشتەم: ڕیتم.

ڕیتم هەست پێکردنی ئاسانە و پێناسەکردنی زۆر قورسە، بەسێ شێوە هەستی پێدەکرێت: (بینین، بیستن و هەست) ڕیتمی میترۆنۆم، کاتێک دروست دەبێت دەنگێک لەدوای بێدەنگییەک دەبیسترێت، دەنگ لێدانێک دروست دەکات، وەک ڕیتم دەیناسین. واتای نۆرەکارییە لەنێوان دەنگ و بێدەنگیی. هەمو ڕیتمێک سێ پێکهاتەی هەیە: (نۆرەکاریی، دوبارەبونەوە، خێرایی ئاوازی مۆسیقا) ڕیتمی شتە جووڵاوەکان شیکردنەوەی گرتەکان دەکات لەسەر چوارگۆشە و لاکێشە. هێڵەکان دیاری دەکات و بەجیاوازیی شیکردنەوەیان بۆ دەکات. ڕیتمە سەرەکییەکانیش بەچوار ڕێگە دروست دەکرێن:

١- چوونە ناوەوە و چوونە دەرەوەی چوارچێوە.
٢- جوڵاندن لەبەردەم یان پشتی شتێکی ترەوە.
٣ - جوڵاندن و وەستاندن.
٤- گۆڕینی ئاڕاستە.

لەچەند بەشێکی گرنگ وەک: جەختکردنەوەی بینراو و دەست بەسەر داگرتنی ڕووداوە مۆنتاژکراوەکان و دەست بەسەر داگرتنی مۆنتاژ و ڕیتم و جۆراوجۆری بینراو. دۆزینەوەی ڕیتمێک، هەڵبژاردنی مۆنتاژ و شێوازەکانی ڕیتم و جیاوازیی لە یەکچوون و خاو- خێرا، ڕێک، نارێک و دەست بەسەر داگرتنی ڕیتمێک لەکاتی بەرهەمهێنان دا و نموونەی کۆمەڵێ فیلم دەهێنێتەوە بۆ تەماشاکردن و بەراورد.

چاپتەری نۆیەم: چیرۆک و پێکهاتەی بینراو و چەمکە سەرەکییەکانی پێکهاتەی چیرۆک: (پیشاندان، ناکۆکی و چارەسەر) چیرۆکی بازرگانیی و یاری ڤیدیۆیی، دیکۆمێنتەری، پرۆگرامی تەلەفیزیۆنی، سکرین، پلەی و فیلمێکی درێژ پێویستە لەو سێ چەمکە بێ بەش نەبن، نموونەی فیلمی هیچکۆک باشترین نمونەی پێکهاتەی چیرۆکە و چەند فیلمێکی دی.

پێکهاتەی بینراو ئەم زاراوەیە بۆ وەسفکردنی سێ بەشی سەرەکی چیرۆکەکەیە، پیشاندانی بینراو، ترۆپک و کۆتایی بینراو شی دەکاتەوە، گرافی ئەم پێکهاتەیەیش چڕی چیرۆک پیشان دەدات، دواتر گۆڕاوی یەکەم و نەگۆڕ. بنەماکانی بینراوێک بەدرێژایی بەرهەمهێنانەکە ناگۆڕدرێن و گۆڕدراوی دووەم و گەشەسەندنی لەبری نەگۆڕ وردەوردە دەگۆڕدرێت. گۆڕانی سێیەم جیاوازیی لەیەکچوون دروستبوونی بۆشاییەک تایبەتمەندە بەتەریبی چڕی چیرۆکەکە چەند نمونەیەکی بۆ کێشانی گرافی دەهێنێتەوە.

*لینین کاتێک فیلمی ڕەگەزپەرستی (جریڤیس)ی بینی کارتێکەری سینەمای لەنێو هونەرەکانی دیکە و لەسەر نیدای ئایدۆلۆژی سەر جەماوەر، بەگرنگتر دانا*

چاپتەری دەیەم: کارپێکردن نەکو تیۆر، بیرکردنەوە لە پێکهاتەی بینراو، بەکارهێنانی گراف، پێکهاتەکانی چیرۆک و بینراو بەیەکەوە دەردەخەن، بۆ دروستکردنی باشترین پێکهاتەی بینراوِ خاڵی تێروانینە، واتە گۆشەی کامێرا بە نیشاندانی هەستوسۆز بۆ بکەرەکە، یان چیرۆکەکە.

نوسەر لێکۆڵەرێک دروست بکات، زیرەکە، ڕەشبینە، هەڵەکەرە، ناتەواوە، خاڵی بەهێزی تێڕوانینی زیاد لەبڵاوکراوەکانی تەلەفیزیۆن و یارییە ڤیدۆییەکان و فیلمە دیکۆمێنتارییەکانیش.

کاتێک خاڵی تێروانین دامەزرێندرا وێنە دروستکەرەکە خۆی بنەماکانی هەڵدەبژێرێت. هەڵبژاردەی: بەسروشتی، هەرەمەکی، بەلێکۆڵینەوە، شیکاریی، دەست بەسەر داگرتنی بنەماکانی بینراو، چیرۆکەکە چییە؟ خاڵی تێروانینی چییە؟ شوێنی چرۆکەکە کوێیە؟.

بۆ دروستکردنی پێکهاتەیەکی بینراوی باش ئەم خاڵانە

گرنگن پەیڕەو بکرێن:

١ - چیرۆک. ٢- خاڵی تێڕوانین. ٣- شوێنی چیرۆکەکە و بۆشایی هێڵ و شێوە، ڕەنگ، جووڵە، ڕیتم. بەنموونەیش چەند چیرۆکێک بۆ پرۆڤەکاری پیشان دەدات.

زۆر لەپێکهاتە بینراوەکان پشتیان بەجۆری بەرهەمەکە بەستووە، لەوانەیش بڵاوکراوەی بازرگانیی، کاری دیکۆمێنتەری، یاریە ڤیدۆییەکان، تەلەفیزیۆنی وێنە، فیلمی ئەنیمەیشین .

پاشکۆ: بەشی ئەی: وێنەگرتنی خاڵی نۆداڵ، واتە خاڵی گرێی ناوەندی بینینی هاوێنەکان ڕاستەوخۆ لەسەر تەوەرەکە بێت جووڵەی پەیوەستە لەنێوان (ئێف جی) بۆ (بی جی).

بەشی بی: قووڵی ناوچەکە: کاریگەریی هاوێنەکان لەسەر بۆشایی: گۆشەی پان قوڵییەکی باش لە ناوچەکە دروست دەکات، هاوێنەکان هەمان قووڵیان هەیە، بەبێ جووڵاندنی کامێراکە گۆشەی هاوێنەکە دەگۆڕین بۆ ١٨ ملم، کامێراکە نزیک بکرێتەوە هەمان وێنە دەست دەکەوێت بەهاوێنەی تێلە فۆتۆی ١٠٠ ملم.

بەشی سی: هاوێنەی ئانەمۆرفیک (بینایی شێواو)و فیلمی ٧٠ ملم.

هاوێنە ستاندارەکان هاوێنەی گۆیی پان هاوێنەی تەخت پیشاندان و بۆ گرتنی فیلمی (١،٨٥، ١،٦٦، ١،٣٣) بەکار دەهێندرێن هاوێنەی گۆیی وێنەیەک نیشان دەدات نەشێوێندراوە. هۆلیۆد ساڵی ١٩٥٠ سیستەمێکی گرتەبەر بۆ شێواندنی وێنەکە بە سینەما سکۆپ ناسراوە. بەپێی بازنەکانی نێو لاکێشەکان ئەو گۆڕانکارییانە شی دەکاتەوە، لە بازنەکاندا نموونەی گرتەکان دیاری دەکات لەشێوازێکەوە بۆ شێوازێکی دی، بەپێی بەشە ئاڵتونییەکەیش ئەو دابەشبوونەی ڕووتەختەیە بەشێوە کلاسیکییەکەی لە هونەرە جوانەکان بەکارهێنراوە. چەند چوار چێوەیەکی بەنموونە هێناوەتەوە.

بەشی ئی: ڕەنگ و ڕێژەی کلیڤن: سەرچاوەی جیاوازیی و ڕووناکی ڕەنگی جیاواز دروست دەکات. زۆربەی سەرچاوەی ڕەنگی سپی، یان بێرەنگی دەبینرێن (ولیام کیلڤن) لەساڵی ١٨٠٠ پەرەی پێدا و لەسەرچاوەی جیاوازییەوە دەردەچێت. هەتا ژمارەی کلیڤن کەم بێت ڕەنگەکە سورتر دەبێت، ئەم پێوانەیە بەپلە دەست نیشان کراوە.

ڕووناکی و فۆتۆگرافی، ڕووناکی مۆم و خۆر جیاوازیی ڕەنگیشیان جیاوازە و پێویستی بەرێکخستن هەیە، ڕەنگی نێو فیلم و پلەی گەرمی و ڕەنگی فیلمەکە لەنێو کامێراکە هاوسەنگە لەگەڵ پلەی گەرمیی و ڕەنگی ڕووناکییەکە، بەپێی هێلکارییەکانی نێو کتێبەکە ئاسایی دەردەچێت. سکرێنی تەلەفیزیۆنی و کۆمپیوتەر سیستەمی زیادکەر بەکارناهێنن، بەهۆی تێکەڵکردنی بینایییەوە دروست دەبن و جیاوازیشن.

بەشی جی: ئاوازی دەرهێنەرانەیە. وشەی ئاواز لەشانۆ گەشەی کردووە، ڕیتم ناگرێتەوە، دابەشکردنی دیمەنێکە بۆ چەند ئاوازێکی داهێنەرانە، ئاوازەکان بەپێی # ١ بۆ # ٥ جیا دەکاتەوە، هەموو دیمەنێک دەتواندرێت بکرێت بەپێنج ئاوازەوە و بەچەند ڕێگەیەک ئاوازی داهێنەرانە پێناسە دەکرێت:

١ - نواندن. ٢ - نواندن لەسەر شانۆ. ٣ - کامێرا. ٤ - کامێرا مۆنتاژکردن ٥- پێکهاتەی بینراو.

بەشی ئێچ: گونجاندنی ڕێژەی دیمەنە و نیشاندانی فیلمێکی درێژە لەسەر تەلەفیزیۆنە بەرێژەی ١،٨٥ لەسەر سکرێنی تەلەفیزیۆنێکی (ئێن تی ئێس سی)ی ١،٣٣ جێگەی نابێتەوە. دوو ڕێگە هەیە بۆ چارەسەرکردنی بەلیتە بۆکس گۆڕینی فیلم لەسکرێنێکی پانەوە بۆ سکرینێکی ستاندار و فیلمێکی سینەمایی ستاندار بەسکرێنێکی تەواوی تەلەفیزیۆنی ١،٣٣ ببینرێت لەجیاتی لیتە بۆکس. دایاگرافیکی بۆ نەخشەکێشان سێ جۆر دروستبوونی وێنەی فیلم دەست نیشان دەکات، بەرێژەی بینراوەکانی ئێنتەرنێت، هەرچەندە زۆربەی کۆمپیوتەرەکانی ١،٣٣:١ هیچ یاسا و ستاندارێکیان نییە بۆ ڕێژەی بینراوی پرۆگرامە ئۆرجیناڵەکە لەرێژەی بینراوی ئینترنێتەوە دەتوانن هەمو شێوە و دابەشبوونێک بەخۆیەوە ببینێت و کێشەی تەکنیکی نییە جگە لە ڕێژەی قەبارەی سکرینی کۆمپیوتەرەکە.

ئەم کتێبە بەکۆتایی نەهاتن کۆتایی دێت، کراوەیە بۆ هەموو زەمەنەکانی مێژوو، لەگەڵ گۆڕانکاریی زەمەن خستنە سەری بۆ دەکرێت و بناغە و تیۆری پراکتیکی سینەمایی دارشتووە بۆ هەتا هەتایە دەمێنێتەوە.

سەرچاوە: چیرۆکی بینراو. نوسینی برووس بلۆک. ٢٠٢٢. چاپخانەی سەردەم. سلێمانی. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. وەرگێرانی لەئینگلیزییەوە. بەناز کەمال.

## دەستنووسی پیترسبۆرگ

# رۆمانێک بە تامی مێژوو

رۆمانی دەستنووسی پیترسبۆرگ، لە لایەن نووسەری بەتوانا (جان دۆست) بە تەکنیکێکی جوان و جیا لەوانی دیکە، وەستایانە و شارەزایانە نوسراوە. پەڕاوی رووداوە مێژووییەکانی کتێبخانەی ئەکادیمیایی لە سانت پیترسبۆرگ لە رووسیا، بۆ هێناوینەتە سەر زوبان. سەباح ئیسماعیل-یش وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردیی.

نووسەر، لەم رۆمانە، بە دوو کارەکتەری زیرەک، زمانزان، ژیر و سەرڕاست ئاشنامان دەکات. یەکێکیان، پیاوی عوسمانیی و کوردێکی ئایندار و مێژوونووسە، ناوی (مەلا مەحموودی بایەزیدی)یە. ئەوەی دیکەیان (ئۆگست ژابا)یە، کە بە نەژاد پۆلۆنییە، بەڵام بە ئەرکی کونسوڵی رووسیای قەیسەریی لە ئەرزەڕۆمە.

نووسەر، لەڕێگەی هونەری گێڕانەوە، خوێنەران بەلای زۆر شتی سەرنجڕاکێش و مێژوویی و لە بیرکراوی کورددا دەبات، بە کۆمەڵێک زانیاریی نەبیستراویان دەبەستێتەوە، وەک ئەوەی بەشێک بن لە نووسینەکە، کەمەندکێشیان دەکات بۆ تەواوی مژارەکان.

خوێنەر، تێ دەفکرێت؛ ئاخۆ کورد بۆچی لەوێ رۆژێوە هەتا هەنووکە، لە پانتایی کلتوور، مێژوو، فەرهەنگ و ئەدەبیاتییەوە، هێندە هەژار و داماوە و هێشتە بە مرازی خۆی نەگەیشتوە؟

بە خوێندنەوەی ئەم رۆمانە، خوێنەر بۆی دەردەکەوێت، کە رووسیا بە چ مەرامێکی سیاسیی لە ساڵانی رابردوو گرنگی و بایەخی بە توانستی گەنجان داوە، هاندان و پاڵپشتییان کردون، تا جگە لە فێربوونی زمانی دایک، فێری زمانەکانی دیکەش ببن.

ئۆگست، گەنجێکی هەڵکەوتووە، بارگە و بنەی خۆی تێکنا و چووە کتێبخانەی سانت پیترسبۆرگ، قرمی لە خوێندن و زانینی زمان و کەلەپوری خۆرهەڵات خۆش کرد، دوای دەست بەکاربوونی لە کاری دیپلۆماسی، ئۆگست کەسێک دەناسێت، بەناوی مەلا مەحموودی بایەزیدیی.

مەلا مەحموودی بایەزیدی، مێرخاسەکی خوێندەوار و دووربین بووە، نزیکەی دوو ساڵ سەرقاڵ و مژووڵی نووسینەوەی ئەو دەستنووسەی بووە، کە گفتی بە کۆنسوڵی رووسیا دابوو، بۆ ئەوەی بیباتە ئەکادیمیای ئیمپراتۆریی، لە سانت پیترسبۆرگ.

بایەزیدی، کەسایەتی و تایبەتمەندی زۆر جیاواز بووە بە بەراورد لەگەڵ میر و ئاغاکان. ئەو زۆر حەوسەڵە و مشتاقی خوێندنەوە و فێربوونی زمانەکانی دیکە بووە. مێرخاسەکی ئاوا ئاشتیخواز، بەردەوام لە هەوڵی نێوەندگیری دابووە، لەنێوان میرە کوردەکان و کونسوڵ.

بایەزیدی، پێچەوانەی میرەکان هەموو دانیشتن و شەوچەرەکانی، بە خوێندنەوە و نووسین بەسەر بردووە، بەبێ ئەوەی دەستمایەکی ماددی هەبێت، هیچ کاتێک سڵی لە نووسین نەکردیتەوە، هەمیشە پەرۆشی ئەوە بووە، مێژووی کورد بپارێزێت، پێدەچێت خەونی ئەوە بووبێت لە پاشەڕۆژ نەوەیەکی خوێن گەرم بێت و پەڕاوی رووداوە مێژووییەکان هەڵبداتەوە و



پێشڕەو تەها

بیانهۆنێتەوە.

مەلا دبێژێت: بەداخ و کەسەرەوە، کەچی کورد بە چقاسی سەرە دەنکە دەرزییەک چییە، حەڤداڵی پەرتووک و نووسینەوەی مێژوو نەبوون. چەند جارێک کارنامەی نووسینەکانی لەسەر سفرەی خوان پێشکەشی میرنشینە کوردەکان کردوون، وەلێ ئەوان گوێیان لێ نەگرتوون و بەهایان بەو خوانی مێژووە نەداوە.

ئەوان تەنیا مژووڵی ناکۆکییەکانی نێوان خۆیان بوونە، یەکێک قەستی ئەوەی بووە، ئەویتر لە پۆست و پلە دووربخاتەوە و لە لق و پۆپیان بخات. ئەوی دیکەیان مەرامی بووە لە سوڵتان و میرەکان نزیک بێتەوە.

ئەوان سەرنجیان بەس لای سترانبێژەکان بووە، دەنگبێژەکانیان بانگهێشتی تەلاری کۆشکەکانیان کردووە، تاکوو بە ئاوازی ئەوان گۆرانییان بۆ بچرن. لەمەڕ کارەکانیان، باس و خواستی جوامێری و مێرخاسیی خۆیان بووینە، لێ وەک لێزمە و قورەباران شاباشیان بەسەر دەنگبێژەکاندا باراندووە.

بایەزیدی لە مەشهەدێکیدا، ژنە گوتی: سوارچاکی شتێکە و سیاسیەتیش شتێکی دی. لەشەڕدا ئازایەتی کەڵکی نییە، گەر ئاوازێکی لە پشتەوەی نەبێت. ئاقڵمەند بەسەر ناکەسدا زاڵ دەبێت، خامەش لە شیران باشتر دەبێت.

خوێنەر، لەکۆتایی خوێندنەوەی ئەم ڕۆمانە، دەگاتە ئەو ڕاستی و دروستییەی، کە نووسەر بەراودکارییەکی مێژوویی لەنێوان ئەوێ ڕۆژێ و ساڵانی ١٨٤٢ و نووکە ٢٠٢٣ کردووە.

پرس و ڕووداوە مێژووییەکان لە هزری خوێنەر دێن و دەچن، بە لۆژیک و دۆکومێنتارییەوە پرسیارەکان لە گوێی خوێنەر دەزرینگێنەوە! ئایا هیچ تەکان و گۆڕانکارییەک بووە، هیچ هەوڵ و کۆششێک لە لای کاربەدەستانی میری هەرێم دروستبووە، کە سوود لە هەڵەکانی هەینێ وەربگرن.

خوێنەر زۆر بەخەم و کەسەرەوە، ئاخ و ئۆف هەڵدەکێشێت، بیروهۆش و کۆدرکی هەستەکانی دەزریڤێتەوە ئەوسای، کاتێک بۆی ئاشکرا دەبێت، کە کورد لە سەردەستی ئەو میر و ئاغا بێ کەڵک و نەخوێندەوەرانە ناخەملێندرێت.




بەداخەوە تاوەکو ئێستەشی لەگەڵ دابێت بەرپرسانی هەرێم، هیچ خوێندنەوەیەکیان بۆ ئەو ڕووداو و پێشهاتانە نەکردووە، بۆ ئەوەی بێن پەراو و دەستنووسە مێژووییەکان هەڵبدەنەوە و بزانن لە چ قۆناغێکی مێژوو، کورد هەڵەی کردووە، دۆست و نەیارەکانی کێ بوونە. میر، مورید، شێخ و مەلاکان ڕۆژێک نەهاتوون، لە قوژبن و کەلێنێکی تەلار و کۆشکەکانیان، هۆدە و هەیوانێک بۆ کتێبخانە بنەخشێنن.

ئەوان هەر بە پڕکردنی دۆلاب و باوڵەی خەزێنە و کوپە زێڕەکانیان سەرقاڵ بوونە، ئەوان هەر خەریکی دیوەخان و خانەقاکانیان بوونە، تاکو دەروێش و نەخوێندەوارەکان بحەسێنەوە، خوێندنگەیان ئاوا نەکرد، بۆ ئەوەی هیچ کەسێک دوای خۆیان بەئاگا و وشیار نەبن. ئەوەتانێ میرنشییەکانیان چوون، شورەت و ئاسەوارێشیان کەوتنە ناو زبڵ و خاشاکی مێژووی ڕەشەوە.



دکتور
جەمیل عیسا

بەشی یەکەم

دوای ئەوەی قوتابخانەی هەرمۆتەی سەرەتایی، ساڵی ١٩٤٧ لەنێو کەنیسەی، بۆ پێگەیاندنی نەوەکان و بڵاوبوونەوەی بیری ڕۆشنبیریی لە گوندەکە، لەلایەن بەڕێز (کەریم ئیسحاق) دروستکراوە، دواتر هەوڵ دراوە زۆربەی منداڵەکان بنێردرێنە بەر خوێندن، دواتریش کۆششی کردووە بۆ دابینکردنی مامۆستا، کەلوپەلی قوتابخانە و دامەزراندنی کارگوزار (فەڕاش).

کردنەوەی ئەم قوتابخانەیە لە هەرمۆتەی دەبێتە هۆی ئەوەی گوندەکانی دەوروبەریشی وەک: تۆبزاوە، مام قلینج و شیلەش منداڵەکانیان بنێرنە ئەوێ.

بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٠ من لە دایکبووی ١٩٥٠/٧/١، بەڵام ئەم مێژووە ڕەنگە هەر بۆ ئەوە بووبێت باپیرەم و باوکم ناونووسم بکەن بۆ ئەوەی بچمە قوتابخانە، ئەگەرنا بەگوێرەی تۆمارگەی کەنیسەی هەرمۆتەی، کە بەڕاستتر دادەنرێت، ڕێکەوتی لە دایکبوونم ١٩٥٠/٣/٥یە، بۆیە کە تەمەنم بووەتە حەوت ساڵان، هەر لەو قوتابخانەیە نێردراومەتە بەر خوێندن و قۆناغی سەرەتایم لەوێ تەواوکردوە.

قوتابخانەکە بریتی بوو لە بینایەکی لە بەرد و گەچ دروستکراو، لەچەند ژوورێکی بچووکی (٤×٥م) و ژوورێک بۆ ئیدارە پێکهاتبوو، کە بە دار و چەپەر سەری گیرابوو، پەنجەرەکانی بچووک بوون و دەرگاکانیشی هەمووی لە دار دروستکرابوون.

دوای چەند ساڵێکیش خوێندنی نەهێشتنی نەخوێندەواری لە گوندی هەرمۆتەی کرایەوە و پیاوانی نەخوێندەواریش دەستیان بە خوێندن کرد.

لە قۆناغی سەرەتایی، سالانە خواردنی بۆ دابین دەکرا، وەک: هێلکە، شیر، نان و بسکویت. ئەمە و جگە لە بەشداری کردن لە سەربازگەی تایبەتی لە دەرەوە، کە پێیان دەگوت (الكشافة)

ڕۆژانەش لەگەڵ خواردنەکەی بەیانیان یەک دەنکە حەبی (زەیتی ماسی) بەقوتابییەکان دەدرا. کاری دابەشکردنی خواردن و خزمەتگوزارییەکانیش لەسەر شانی پیاوێک بوو بە ناوی حنا یوسف کە خزمەتگوزاری قوتابخانەکە بوو.

حنا یوسف پیاوێکی چوست و چالاک، ئازا و نیشتمانپەروەر بوو. لە ١٩٦٣/٧/٧ لەلایەن ڕژێمی بەعسی چەپەڵی ئەوکاتە، بەبڕیاری حوکمی قەرەقۆشیی تەها شەکرچی لەگەڵ شەش کەسی دیکەی شاری کۆیە لەدینگەی بەسترانەوە و گوللە بارانکران.

ئەوکاتە من قوتابی بووم. بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان مامۆستا (حمید صالح بێتوشی) بوو، پیاوێکی نیشتمانپەروەر و کوردپەروەر بوو. زۆربەی سروودە نیشتمانییەکان لەو مامۆستا بەڕێزە فێربووین.

مامۆستا حمید پیاوێکی درێژی چوارشانەی کەڵەگەت و کەتە بوو، زۆر حەزی لە بەخێوکردنی سەگ دەکرد، جارجارەش لەگەڵ مام یلدا کریم ئیسحاق لەنێو مێرگی هەرمۆتەی شەڕە سەگیان دەکرد، زۆر سەخڵەت دەبوو، کە سەگەکەی لە شەڕەکە دەبەزی.

ماڵی مامۆستا حمید لە خانووێکی مام مەتی

موسای دابـوو. بەهۆی تێکەڵاوی لە ڕادەبـەدەری لە گەڵ خەڵکی گوندەکە، منداڵەکان هەموویان فێری زمانی سریانی ببوون، وریای کوڕی لەگەڵ ئێمە قوتابی بوو، هیچ جیاوازییەک لەنێوان قوتابیەکان نەدەکرا.

ڕۆژانە و حەفتانەش، پۆل پۆل قوتابییەکانیان لە گۆڕەپانی قوتابخانەکە، بۆ پشکنینی پاکوخاوێنی، جلوبەرگ، نینۆک، قژ، ئەسپێ و ڕشک ڕیز دەکرد، مامۆستاکان لەپێش پۆلەکەی خۆیان ڕادەوەستان و قوتابییەکانیان تەفتیش دەکرد. دواتریش سروودی تایبەتی لەلایەن قوتابییەکان دەگوترا.

ساڵانەش جلوبەرگ (قوماش-کوتاڵ) دەهات و بەسەر قوتابییە هەژارەکانیان دابەش دەکرد. زستانانیش بەهۆی سەرماوسۆڵەوە (سۆپای دار) لە پۆلەکان دادەگیرسا، کە زۆرجار لرپەی دەکرد واش باوبوو، کە هەر قوتابییەک ڕۆژانـە دارێک لەگەڵ خۆی بێنێت، ناوەناوەش دەبوو دەبەیەک نەوت ببەین.

حکوومەت پەرتووک و قەڵەم و دەفتەری بۆ قوتابییەکان دابین دەکرد، مامۆستاکانیش ئامۆژگاریی پاکوخاوێنیی بـۆ پـەرتـووک و دەفـتـەرەکـان دەکـرد، نـاوەنـاوەش پەرتووکەکانیان دەپشکنی.

هـەر لەهەمان قوتابخانە، کە لەنێو کەنیسەی (مريم العزراو-مەریەمی پاکیز)ی هەرمۆتەی بوو، ڕۆژانی هەینی و یەک شەممە وانەی ئاینییان پێ دەگوتین.

هەفتەی دوو ڕۆژیش، هەینی و یەکشەم پشوو بوو، لەبەر ئەوەی گوندەکە لەسەر ئاینی مەسیحی بوو، بڕیاری حکوومەت وابوو، کە یەکشەمان پشوو بێت، ئەم پشووە بەردەوام بوو، تا دوای شۆڕشی (١٤)ی تەممووزی ١٩٥٨

تا دوای بەیانی یـازدەی ئـازاری سـاڵی١٩٧٠-ش ئەم قوتابخانەیە هەرمابوو. دواتر بڕیاری دروستکردنی قوتابخانەیەکی نوێی بۆ دەرچوو، ئەو قوتابخانە نوێیە کەوتبووە نێو زەوی کەنیسەی هەرمۆتەی، هەمان ئەو قوتابخانەیەی ئێستە، کە کراوەتە باخچەی ساوایانی هـەرمـۆتـە، دواتـر قوتابخانەی نـاوەنـدی هەرمۆتەش دروستکرا، بەشێکی خوێندکارەکانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران-یش لەو قوتابخانە دەوام دەکەن.

ئێستە باخچەی ساوایان، بنەڕەتی سەرەتایی، ناوەندیی و دواناوەندیش لە هەرمۆتەی هەنە.

ژیـانـی ڕۆژانـەمـان زۆر سـەخـت بـوو، کـارەبـا نـەبـوو، پرۆژەی ئاو نەبوو، سەرچاوەی ڕووناکیمان چرا ڕەشکە، فانۆس و لالە بوو، شوێنی مەڕوماڵات و ڕەشەوڵاخ لەپاڵ ژوورەکانی نووستن دابین کرابوون، کاوکادین، عەمباری دەغلودان، هەمبانە، ناندین و هەموو پێداویستییەکان لەپاڵ یەک بوون، ئەوەش هەمووی لەترسی دزان.

ئەو سەردەمانە دزیی و ڕاوڕووتیی زۆر زۆر بوو،



خەڵکی گوندیی لەنێوان ماڵەکانی خۆیان دەلاقەیان دروست کردبوو بۆ یەکدی ئاگادارکردنەوە، لەکاتی هاتنی دزوچەتە بۆ نێو گوندی. ئەو دزانە هەرچی بەردەستیان بکەوتبا دەیانبرد، هەر لەمەڕوماڵات، مانگا و ئێسترەوە بگرە، تا دەگاتە کەلوپەلی نێو ماڵ، خەڵکەکەیان هەراسان کردبوو، زۆربەشیان، ئەوانەی ئەو دزییانەیان دەکرد، پیاوی ئاغا و دەرەبەگەکان بوون، کە هێندە چاوچنۆک بوون، تەنیا زەفەریان بە ماڵە هەژارەکان دەبرد.

کاتێک شۆڕشی ئەیلوول بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزانی هەڵگیرسا ئەم گوندە بووە سەرەڕێی پێشمەرگە، وەک گوندێکی نزیک لە کۆیە، ڕۆژانە دەیان پێشمەرگە لەو گوندە نانیان دەخوارد، خزمەت و نووستنیان لەسەر خەڵکی ئەو گوندەی بوو. ڕۆژانەش لەکۆیەوە خزم و کەسیان دەهاتن و سەردانییان دەکردن و نامەیان دەگۆڕییەوە، بە تایبەتی گۆڕینەوەی نامە لە نێوان شار و شۆڕش، جاروباریش دەمانچە و چەکیان بۆ دەناردنە نێو شار، یان بە پێچەوانەوە.

### قوتابخانەی هەرمۆتەی سەرەتایی، ساڵی ١٩٤٧ لەنێو کەنیسەی، لەلایەن کەریم ئیسحاق دروستکراوە

دوای تەواوکردنی قۆناغی سەرەتایی لە ساڵی ٩٦٢ لە ئامادەیی کۆیەی کوڕان ناونووس کرام و دەوامم کرد، سەردەمانێکی زۆر ناخۆش و پڕ مەینەتی بوو، کێشە و ململانێیەکان ڕۆژ بەرۆژ ڕوو لەزیاد بوون بوون، کێشەی ئابووریی، گرفتی هاتووچۆکردن لە هەرمۆتەوە بۆ کۆیە، تەڕوتووشی، قوڕو چرپاو، سەرماوسۆڵەی زستان، بەفروبەستەڵەک و نەبوونی هیچ ئاوەدانییەک لەسەر ڕێگە، تا دەگەیشتینە ئاشی مام خدری، هیچ خانووێک نەبوو، جادەوبانی قیرتاوکراو نەبوو، هەمووی کەندوکۆڵ و شیوو بوو. لە هەرمۆتەی بە پێیان بەڕێ دەکەوتین تا دەگەیشتینە پردۆکان، دواتریش کەندی (مەتنی کوژراو) دواتریش دەگەیشتینە ڕووباری (ڕولکان-گازران) ئینجا بۆ قەبرستانی دیانان، کە ئێستە دووریانە و بەنزینخانەی لەسەر دروستکراوە، دواتریش سەڵکی کافری، کە ئێستە مزگەوت و هۆڵی لەسەر دروستکراوە، ڕێگەی قیرتاوی پێدا تێپەڕ دەبێت. دواتریش ڕێگەکە دەبووە دوو لق، یەکێکیان بۆ چوارتاقان، کە بەتەنیشت بەیتارخانە، یاریگەی کۆیە، باخچەی کۆیە (کە هەمووی قەبرستانی جوولەکان بوو کرابووە باخچە) پێشەکەشی حەسارێکی لێ بوو بەناوی حەساری کاکە زیاد تێدەپەڕی، ئینجا بەنێو کۆڵانەکانی بەفری قەندی دەچووینە نێو بازاڕ و شاری کۆیە.

لقی دووەمی ڕێگاکە، لە سەڵکی کافری تێپەڕ دەبووی و سەردەکەوتی، تا ئاشی مام خدری، هیچ خانووێکی لێ نەبوو، سەرەوهەوراز، هەر بەپێیان دەڕۆیشتین، تا دەگەیشتینە قوتابخانەی ئامادەیی کۆیە، ئەوکاتە مامۆستا (سدیق عەبدولقادر) بەڕێوەبەر بوو، پیاوێکی سوورسپی، چاوشین و باڵا مام ناوەندی تێک چەقی بوو، تا بڵێی نیزامی بوو، زۆری خزمەت بەشارەکە کرد، خاوەن هەڵوێستی کوردانە و نیشتمانپەروەرانە بوو، هەرکە دەگەیشتینە بەردەم قوتابخانە پێشوازی لەگشت قوتابییەکان دەکرد، لێپێچینەوەی لەگەڵ ئەو قوتابیانە دەکرد، کە دواکەوتوون، ئێمەش ئەگەر زستان بوایە بەپێڵاوی لاستیک و جلی تەڕەوە دەچووینە ژووری، بەڵام لەپێش قوتابخانەکە، لەمبەر و ئەوبەری تەنیشت دەرگاکان ئاسنێکی شێوەی تەور دروستکرابوو، پێڵاوەکانمان پێ پاک دەکردەوە، ئینجا دەچووینە ژوورەوە.

بینایەی قوتابخانەکە بەشێوازێکی نوێ، لەبەردی حەلان نەخشەسازیی بۆ کرابوو، بریتی بوو لە دوو قات، ژوورەکانی ڕوویان بەرەو خۆراوا بوو.

ئەگەر وەرزی بەهار و بەرەو هاوین بووایە، هەر ئەو ڕێگەیەمان لەپێش نەبوو، بە ڕێگەی دیش هاتوچۆمان دەکرد. ئەوکات دوو دەوام بوو، دەوامی بەیانییان چوار وانە دەگوترانەوە، پاش نیوەڕۆیانیش دوو وانە دەگوترانەوە.

جا لەو کەین و بەینەی، زۆر بەخێرایی، وەکو گوللە دەردەپەڕین و بەرەو هەرمۆتەی ڕامان دەکرد و تیکە نانێکی سەرپێیمان دەخوارد و بەڕاکە ڕاک دەگەڕاینەوە قوتابخانە، تا کۆتایی دەوام.

ژیان و گوزەرانی گشت قوتابییەکان خراپ بوو، هەربۆیە بۆ نان خواردن دەچووینەوە هەرمۆتەی. سەرباری ئەوەش، ئەو شەوانەی تەقە و هەروهۆریا لە کۆیە هەبووایە لە ڕێگەو بازگەکان (سیگرە) دادەنرا و تووشی پشکنین دەبووین، هەندێک جاریش ڕێگەکەمان دەگۆڕی و دەچووینەوە چوار تاقانی، زەوی ڕەشیدە کەر، لەوێشەوە

بەرەو ئیسکان، تا دەگەیشتینە قوتابخانەکەمان.

گەڕەکی ئیسکان، زۆر لەمێژ نەبوو لەو قەدپاڵە دروستکرابوو، جادەی کۆیە و تەقتەقیش هەر لەو ماوەیە دروستکرابوو، تەنیشت جادەکە چاڵایی قووڵ قووڵی تێدابوون، بەزستانان پڕ ئاو دەبوون و دەبوونە یەک پارچە شەختە و بەستەڵەک. ئێمەش زۆر جار بەسەر ئەو بەستەڵەکانەدا دەڕۆیشتین، ئینجا بەزم و ڕەزمی پۆلیس، ئەمنەکانی سەیتەرە، پشکنین، خۆ سوورکردنەوە و جوێن دانیش لەولای بوەستێت.

ئەودەمە لە ساڵی ١٩٦٤ـەوە لەڕووی سیاسییەوە خەڵکەکە دابەش بووبوونە سەر دوو بەرە، بەرەی پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزانی و باڵی مەکتەبی سیاسیی بەسەرۆکایەتی جەلال تاڵەبانی، هەربۆیە ناونرابوون (مەلایی و جەلالی)

لەنێو قوتابخانەکەمان هەموو ڕەنگەکانی تێدابوو، زۆر جار بۆ ئەو کەسانەی، کە سەر بەباڵی مەکتەبی سیاسیی بوون، لە گوندەکان کێشەیان بۆ دروست دەکرا و دەگیران، شیوعییەکانیش لەگەڵ باڵی مەلایی بوون، لەدژی جەلالییەکان جاسووسییان بۆ دەکردن.

بەش بەحاڵی خۆم، لەسەر ئەوەی، کە سەر بە باڵی مەکتەبی سیاسیی بووم، دوو جار گیراوم و لێیان داوم.

جارێکیان ڕاپێچیان کردم بۆ ناوچەی کۆیە، کە لەتەکەول بوو، لێپرسراوەکە (عەلی حەسەن) ناوێک بوو، لەبیرمە عوسمان پشکۆ و عەبدەخەوە ئەندامی ناوچە بوون، پاش لێکۆڵینەوە بەرەڵایان کردم. شەو لەماڵی حەسەن حەمزە یادی بەخێر نانمان خوارد و هەر بەو شەوەش بەپێیان بەرەو هەرمۆتە بەڕێ کەوتین، باوکم (خوا لێی خۆشبێت) یاوەری کردم.

جارێکیشیان لەسەر پردی تۆپزاوە، لەگەڵ شەهید سلیم حنا، سەعیمان دەکرد، لەتەنیشت پردەکە چەند پێشمەرگەیەکی لێبوو، بەتۆمەتی ئەوەی من (جەلالیم) گرتمیان و چەند قۆنداغە تفەنگێکیان لێدام.

زۆرجار کێشەی دیکەشمان ڕووبەڕوو دەبۆوە، خەڵکی گوندی هەرمۆتە زۆربەیان شیوعی بوون بەرهەڵستییان دەکردین، تا کار گەیشتبووە ئەوەی ژنیشیان نەدەداینێ.

هەندێک جار شەوانە پێشمەرگەی شیوعییان دەناردینە سەر. سخریای برام حەزی لەکچێک دەکرد و پەیوەندییان هەبوو، بەڵام شیوعییەکان نەیانهێشت ئەو کوڕو کچە بەیەک بگەن.

بەسەر بڵندی خوێندنمان تەواو کرد و پۆلی سێمان بڕی. سخریا-ی برام چووە خانەی پێگەیاندنی مامۆستایان لە هەولێر، کە ئەوکات مامۆستا مەجید حداد (ئاسنگەر) بەڕێوەبەر بوو، منیش چوومە دواناوەندیی کۆیە، بەشی ئەدەبی.

دواناوەندیی کۆیەی کوڕان ئەوکاتە لە یەکی ناوەندییەوە تا پۆلی پێنجی ناوەندیی بوو، چونکە لەو سەردەمەی ئێمە، دوا قۆناغ، پێنجی ئامادەیی بوو. واتە ساڵی ١٩٦٨-١٩٦٩. دوای ئەوە پۆلی شەش زیادکرا. هەروەها پرۆگرامی پۆلی چوار و پێنج داخلی تاقیکردنەوەی گشتیی وەزاری دەکرا.

دوای ئەوەی دواناوەندیم تەواو کرد چوومە زانکۆی

> ***ڕۆژانەش لەگەڵ خواردنەکەی بەیانیان یەک دەنکە حەبی (زەیتی ماسی) بەقوتابییەکان دەدرا. کاری دابەشکردنی خواردن و خزمەتگوزارییەکانیش لەسەر شانی پیاوێک بوو بە ناوی حنا یوسف***

مووسڵ و لەبەشی ئینگلیزیی وەرگیرام، بۆ دوو حەفتەش دەوامم کرد، بەڵام سخریای برام بەدوام داهات و گوتی لە زانکۆی بەغدا کۆلیژی پەروەردە کراوەتەوە، فریای ئەوێ بکەوە، بەڵام کە چووم، فریا نەکەوتم، بە ناچاری چوومە بەشی جوگرافیای کۆلیژی ئاداب.

بەغدا شارێکی گەورەیە و سەدان کۆشک و تەلاری تێدایە، پایتەختی مێژوویی عەباسییەکان بووە، پایتەختی وڵاتی عێراقە، کۆلیژی ئاداب سەرەتا لە ڕاغبە خاتون-ئەعزەمیە بوو، دوای ساڵێک گوسترایەوە بۆ (باب المعظم) نزیک بەشە ناوخۆییەکان، کۆمەڵێک کۆلیژی دیش وەکو ئەندازیاریی و پەروەردە هەر لەوناوە بوون، ئەوکات ئەو شوێنە بە سەنتەری شار دادەنرا.

ڕۆژانە بە (پاس) هاتووچۆمان دەکرد، کە بەشی زۆری پاسەکان دوو قات بوون، تکیت بە (١٠) فلووس بوو، زۆرجار وابووە دەفتەری پسوولەمان بە دەفتەر دەکڕی،

بەیانییان پاسەکان جمەیان دەهات لەخوێندکار و فەرمانبەر و خەڵکی دی. ئەبونەواس یەکێک بوو لەشوێنە گەشتیارییەکان، بەخواردنی ماسی مەسگوف بەناوبانگە. جگە لە شەقامەکانی ڕەشید، نەهر، بە گۆڕەپانی تەحریر، تاوین، کەرادە، گۆڕەپانی (ساحە الطیران) و شوێنەکان دی کە لەژمارە نایەن، بەناو بانگە.

ڕووباری دیجلە بە ناوەڕاستی شاری بەغدا تێپەڕ دەبێت و بەغدای دابەشی سەر هەردوو بەرەی خۆرهەلات و خۆراوا کردووە، کە پێیان دەگوترێت (کەرخ) واتە بەری خۆراوا و (ڕەسافە) واتە بەری خۆرهەلات.

زانکۆی بەغدا بەیەکێک لەچاکترین زانکۆکانی خۆرهەلاتی ناوەڕاست ئەژمار دەکرا، لەسەر ئاستی جیهانیش ناووناوبانگی هەبوو.

بەغدای ئەبو جەعفەر مەنسوور، هاروون ئەلرەشید، مۆزەخانە، قوتابخانەی ئەلمەستەنسەرییە، دار حکمە و

> **هەر لەهەمان قوتابخانە، کە لەنێو کەنیسەی (مریم العزراو-مەریەمی پاکیز) ی هەرمۆتەی بوو، ڕۆژانی هەینی و یەک شەممە وانەی ئایینیان پێ دەگوتین**

گەلێ شوێنی دی بەسەرچاوەی بەهرە و ڕووناکی و ڕۆشنبیری و ئەدەب و هونەری جۆراوجۆر دادەنرا.

لە ساڵی (١٩٦٨-١٩٦٩) لەبەشی جوگرافیای کۆلێژی ئاداب، هۆبەی (أ) دەوامم کرد، ڕاستەوخۆ لەخوێندنی زمانی کوردییەوە بۆ زمانی عەرەبیی، بەڵام وردە وردە لێراهاتم و فێری زمانی عەرەبیی بووم، برادەری نوێم بۆ پەیدابوو، چوار ساڵی قۆناغەکانم بەسەرکەوتوویی بڕی، بەبێ کێشە لە ساڵی (١٩٧١- ١٩٧٢) زانکۆم تەواو کرد.

لە بەغدا زیاتر چوومە نێو سیاسەت، هەڤاڵ و هاوڕێی تازەم پەیداکرد. لە نەورۆزی ساڵی ١٩٧٠ لە هۆڵی (خولد) بەشداریم لەئاهەنگی نەورۆز کرد. بەشداریی شانۆگەریی (کاوەی ئاسنگەر)م کرد، بەشدار بووم لە کۆرسی گۆرانییەکی هونەرمەند خالید دلێر، کە بۆ یەکەم جار لەو ئاهەنگەی لە هۆڵی خولد کرا، سروودی (پێشمەرگەین)ی گوت، کە دەنگدانەوەیەکی زۆری هەبوو. خالد دلێر لە قسەکردن قسە زمان بوو، بەڵام لە گۆرانی گوتندا دەتگوت بولبوولە دەخوێنێ.

بۆ بەشداریکردن لەو چالاکیانە بۆ ماوەی هەفتەیەک لە لایەن هونەرمەند قادر دیلان-ەوە مەشق و ڕاهێنانمان پێکرا.

هەروەها لە (سەد هندیە) لە ئاهەنگێکی خوێندکاران بەشداریم کرد، کە چەندین سروود و گۆرانیی و هەڵپەڕکێی تێدا ئەنجام درا.

شاری بەغدا ژمارەیەکی زۆر کەسایەتی ڕۆشنبیریی، ئەدیب، شاعیر و ڕۆناکبیری گەورەی کوردیی لێ بوو، کە بەشی زۆریان لەبۆنەکان، بەجلی ئاڵووالا و ڕەنگاوڕەنگی کوردەواریی بەشدارییان دەکرد.

ئەودەمانە باروودۆخەکە، بۆ کوردەکان زیاتر لەباربوو، هەر لەو بۆنەیەدا لەگەڵ بەڕێز (دکتۆر کەمال خۆشناو) وێنەمان بەیەکەوە گرت کە ئەوکات مامۆستا بوو لەکۆلێژی کشتوکاڵی (أبو غریب).

دکتۆر کەمال خۆشناو پیاوێکی سۆروسپی و ڕێکوپێک بوو، دۆستی نزیکی جەنابی مام جەلال بوو.

لەنێو کۆلێژەکەمان ململانێ لەنێوان باڵی جەلالی و باڵی مەلایی هەبوو، زۆرجار شەڕ و پێکدادان ڕووی دەدا، بەتایبەتی لەنێو بەشی زمانی کوردیی، کە لەو بەشە سەدان خوێندکاری کورد هەبوون، مامۆستا ناسراوەکانی ئەوکاتی ئەوبەشە بریتی بوون لە عەلائەدین سەجادی، مارف خەزنەدار و عیزەدین مستەفاو مامۆستایانی دیش.

من کە لەبەشی جوگرافیا بووم، زۆربەی خوێندکارە کوردەکان پاڵپشتیی و مەیلی باڵی مەکتەبی سیاسیان هەبوو.

زۆرجار، کە دەگەڕاینەوە شوێن و شارەکانی خۆمان، دەمانبینی بەم هۆیەوە کەسوکارمان لێپرسینەوەیان لەگەڵ کراوە.

دوای بەیانی یازدەی ئازاری ١٩٧٠ بارودۆخەکە زۆر باش بوو، هێور بووەوە، عێراق و کوردستان کەوتنە بەر ڕکێفی ئاشتی و ئۆقرەیی.

دوای بەیانەکەی (١١)ی ئازار سەردانی جەنابی مام جەلال-م کرد، ئەوکات ماڵی لە (زیونە) بوو، کە چووم بە تەنیا بوو. دەستمان بە قسە و گفتوگۆ کرد، بە مام جەلال-م گوت چۆن دەڕوانیە بەیانی (١١)ی ئازار؟

مام جەلال زۆر پێی خۆش بوو کە حکومەتی عێراق دانی بە حوکمی زاتی ناوە و مافی کوردی سەلماندووە، بەلام گوتی ئەم حکومەتە پاشگەز دەبێتەوە و بەیانەکە جێبەجێ ناکات، چونکە ئەو حزبە دەسەلاتدارە حزبێکی شۆڤێنییە و دەیەوێت کات بەسەربەرێت، دواتر چی خراپە، دەرحەق بەکورد دەیکات.

دوای یەکگرتنەوەی هەردوو باڵی (مەلایی و جەلالی) بۆ بزووتنەوەی ڕزگاری کوردستان هەلێکی باش و لەبار هاتەپێش، یەکگرتنەوەکە دڵی هەموو کادیرەکانی هەردوولای خۆش کرد، بەهەمان نەفەسی جاران کەوتنە سیاسەتکردن و خۆسازدان بۆ هەر ئەگەرێکی نەخوازراو.

لە دوای چوار ساڵ حکومەتی عێراقی تاک لایەنە بڕیاری ئۆتۆنۆمی دا، کوردیش لەو سەین و بەینەدا ڕەتی کردەوە (مەجلیس تەشریعی و تەنفیزی دامەزران) بەلام پارتی دیموکراتی کوردستان لە دوای گفتووگۆیەکی دوورودرێژ لەگەڵ حکومەتی عێراق ڕێک نەکەوت و هەرچی دۆست و هەوادار و لایەنگری هەبوو بەگەڵ شۆڕش کەوت، زۆر بنکە و بارەگای پۆلیس و سوپا پەیوەنییان بە شۆڕشەوە کرد و دووبارە ئاگری شەڕ هەڵگیرسایەوە.

پێش ئەوەی دابمەزرێم بە (محازر) لەگوندی قورشاغلوو بوومە مامۆستا، بەلام تا فەرمانی کارگێڕیم بۆ دەرچوو، هەر وەک (مامۆستا) لە ناوەندی تەق تەق بووم. چەند مانگێکی بەسەردا نەچوو بوو، ناچار بووم، کە پەیوەندیی بەشۆڕشەوە بکەم.

سەرەتا چوومە گوندی گۆمەشین بۆ وەرگرتنی (تزکیە) ی ئەندامیەتی، ئینجا بەرەو چیا هەڵکشاین. ئێمە چەند مامۆستایەک بووین چووینە گوندی (سناوە) مامۆستاکان: حەسەن فەرج، محەمەد حەسەن حەوێزی، ڕوستەم محیدین، عەدنانی حاجی سەعید، خیرەدین محیدین) لەدۆڵ و بن چیای ئاوەگرد لە بەرانبەر ئەشکەوتی سناوە گیرساینەوە.

ئەشکەوتەکە بنکەی تەندروستیی پێشمەرگە بوو، هەربۆیە ناوەناوە فڕۆکەی مێک و سیخۆ، بەسەر ئەو ناوە دەسوڕانەوە، جاروباریش شەستیر و گوللە ساروخی ئاراستەی ئەو ئەشکەوتە دەکرد، کە لەبن پاڵی سۆرکەکە دابوو، ئێمەش ڕۆژانە ناچار دەبووین بەرەو خەرەند و بن پاڵی شاخەکان بچین و خۆمان لەوێ حەشار بدەین.

ماوەیەکیش بووین بەمامۆستا لە ناوەندی هیران. ئێمە هەر لە سناوە بووین، کاتێک زانیمان سوپای عێراق



جووڵەی کردووە، فرۆکە هاژەی دەهات. ناچاربووین لەمانگی تەممووزی ١٩٧٤بەرەو هیران بچین، لەوێش ڕوستەم محیدین و خیرەدین محیدین چوونە لقی دوو، لەوێش (کمال محیدین) پێی گوتبوون هەر ئەم شەو لێرە دەڕۆن، چونکە سوپای عێراق مەبەستیەتی ئەو دۆڵە داگیر بکات، ناوچەکە تووشی شەڕ دەبێت.

شەوی (١٣-١٩٧٤/٧/١٤) بەچیای هەوری بەڕێ کەتین، تا گەیشتینە چیوێ، لەوێشەوە بۆ شەوی دواتر بەرەو شیرێ، دەرەشیر و ساوسێوکان هەڵگەڕاین، شەو زۆر سەرما بوو، هیچیشمان پێ نەبوو، لەسەر قووڵەی ئاوەکە تا بەیانی ئاگرمان کردەوە، هەر لە شەوی (١٤)ی تەموزی (١٩٧٤) باران باری.

گەیشتینە کارۆخ و لەوێشەوە بۆ وەرتێ. لەگەڵ گەیشتنمان بۆ میوانخانەی وەرتێ فرۆکە جەنگییەکان ئەو دۆڵەیان تۆپباران کرد، ناوەناوەش بۆمبا تەوقیتکراوەکان دەتەقینەوە.

*ئەو سەردەمانە دزیی و ڕاورووتیی زۆر زۆر بوو، خەڵکی گوندیی لەنێوان ماڵەکانی خۆیان دەلاقەیان دروست کردبوو بۆ یەکدی ئاگادارکردنەوە*

دواتر بەرەو چۆمان بەڕێ کەوتین، لەسەر پردی (حافز) سواری ئۆتۆمبیلێکی جێپ بووین، تاکو گەیشتینە چۆمان، لەوێ چاومان بەکۆمەڵێک مامۆستاو برادەر کەوت، بۆ چەند ڕۆژێک لەوێ ماینەوە، دواتر پەیوەندییان پێوە کردین کە قوتابخانەی ناوەندیی و دواناوەندیی لەشاری خانەی ئێران دەکرێتەوە، پێویستە بچینە ئەوێ.

لە دواناوەندیی (خانە) دەست بەکاربووین بەسەدان قوتابی و خوێندکار لەوێ هەبوون، بەدەیان مامۆستا بەیەک گەیشتین، لەهەموو جۆرە پسپۆرییەک.

بەردەوام بووم لە کاری مامۆستایەتی، بەدڵسۆزیی وانەکانمان دەگوتەوە، تا ڕۆژێک بۆ دانانی پرسیارەکانی (وەزاری) پۆلی سێیەم و پۆلی شەشەمی ئامادەیی بەدوایاندا ناردم.

چوومە ناوپردان و چاوم بەمامۆستا محەمەد ئیسماعیل کەوت، ئەوکات دارا تۆفیق ئەمینداری گشتیی پەروەردە بوو (گوتیان دەبێت پرسیارەکان بۆ هەردوو خوول دابنێیت لەگەڵ وەڵامەکان) گوتم بەڕاستی کارێکی هاسان نییە، زۆر زەحمەتە بەو پەلە پەلەیە ئەو هەموو کارە ئەنجام بدەم. بەڵام ڕۆحی حەماسی و دڵسۆزیی بۆ کارەکەم هانیدام، کە کارەکە ئەنجام بدەم و دواتریش بگەڕێمەوە بۆ خانە.

لەخانە لەگەڵ ئەندازیار (ئەکرەم فەرەج) بەیەکەوە ژوورێکمان گرتبوو.

مامۆستا هادی ڕەحمان هاوڕێمان بوو، ئەویش مامۆستای بیرکاری بوو، پیاوێکی دڵسۆز و خوێنەویست بوو، زۆریش برادەرم بوو، هەموو کات بەیەکەوە بووین، هەر جارێک گەر بچووبان بۆ شوێنێک دەیگوت (بڕۆین، دەمگوت با بڕۆین) ئیدی دەچووینە شاری مەهاباد، یان سەقز، یان ورمێ.

مامۆستا جەواد شێروانی-یش کە دەکاتە زاوای مەلا عەلی (سەرۆکی زانایانی ئیسلامی کوردستان) بەماڵ و منداڵەوە لەخانە بوون. مامۆستا سعدەدین کوڕی مەلا عەلی-ش هەر بەخێزانەوە هاتبووە دەرەوە بەیەکەوە خانوێکیان گرتبوو، هەر وەکو ئێمە مانان، ژیانێکی ساکار و سادەیان بەسەر دەبرد.

شەڕ لە کوردستان گەرم بوو، دەنگی کوردستان ڕۆژانە چالاکییەکانی بڵاودەکردەوە، ئێمەش لە وڵاتی خۆمان دابڕا بووین بەڵام بیرمان هەر لەوێ بوو، تا کۆتایی هاتنی ساڵی خوێندن.

لقێکی پرسیارەکانی جوگرافیا، کە لە بیرم ماوە و بۆ پۆلی سێیی ناوەندیی هێنابوومەوە ئەوە بوو:

هۆی ئەمانەی خوارەوە چییە؟

(دار خورما لە شاخەکانی کوردستان ناڕوێت؟)

هەر لە خانە نیهاد مەلا مستەفا بارزانی-یش قوتابی ناوەندی بوو، هەر وەکو هەموو قوتابیەکانی دی دەوامی دەکرد.

لە خانە زۆر کەسمان ناسی و تێکەڵاوی زۆر خەڵک بووین، شار هۆنجەی دەهات لەخەڵکی ئاوارەی شارەکانی کوردستان، ناچار خەڵکەکە ڕوویان دەکردە شارەکانی دیکەی کوردستان، ئەوەی وەزعی باش بوو لەشارە گەورەکان خانووی بەکرێ دەگرت.

# وێستگەی دیوان

- (۱) پرسیار (سەرکەوت ڕەسووڵ)
- دیوانی هەولێر (سەلیم ڤاقا ملک الطیور)

نازم دڵبەند

- گۆشەی دیوان (ئەو شیعرەی لە دیوانەکەی دانییە)
- یەکەم (عوسمان شەیدا)

ئا: قەڵەندەر

- لە زمانی خۆیانەوە (یووسف ئیسماعیل)
- سینەما فیلم (فیلمی کۆمەڵەی شاعیرە مردووەکان)

ئامادەکردنی: شاگوڵ فوئاد

- لە دەفتەری نەمریدا (هونەرمەند ستار عەلی)
- لە دەفتەری نەمریدا (جەلال زەنگابادی)
- لە دەفتەری نەمریدا (جەمال بابان)
- لە دەفتەری نەمریدا هونەرمەند بیتو جان)
- بخوێننەوە
- ساڵۆنی لاپەڕە (۹)

پرسیار (۱)

# زیاد ئەسعەد شیعری عاشق بەتۆم-ی چۆن کردە گۆرانیی؟

لەکۆتایی ساڵی هەشتایەکان و سەرەتای نەوەدەکان لەسەر جادەی مەخمووری دوکانێکم هەبوو شفتیم دەفرۆشت.

ئێواران دەبووە جێی کۆڕ و کۆبوونەوەی هونەرمەندان و ئەدیبان، تاوتوێی ئەدەب و هونەرمان دەکرد، ئەوانەی لەو کۆدەبوونەوە ئێستە زۆربەیان قەڵەم بەدەستن. نووسینی شیعر و ئاگاداربوون لە هەواڵی دوابەرهەمی هونەریی هونەرمەندان حەزو ئارەزووی لە پێشینەمان بوو

ئەوکات هەستێکی سەیرمان بۆ ئاوازدانان و شیعری گۆرانیی هەبوو، ئەوەش زیاتر بەهۆی کاریگەریی هەندێک برادەر، یەک لەوانە (عەبدولڕەحمان بێلاف و ئیدریس شەیداهۆ) ئەو دووە زۆر کاریگەرییان لەسەر نەشونمای من هەبوو، بەتایبەتی لەبارەی شیعری گۆرانیی.

گۆرانییەک هەبوو ئاوازەکەی فارسیی بوو، من زۆر مەرەقم لێدابوو بیکەمە کوردیی، ئاوازەکەی زۆر خۆش بوو، ئیقاعەکی کەمەک دڵخۆشکەری هەبوو.

شیعری گۆرانی (عاشق بەتۆم) لەژێر کاریگەریی ئەو گۆرانییە نووسی، واتە لەجیاتی ئەوەی تەرجوومەی بکەم، ئەو شیعرەم بۆ دانا، بە یەک دوو برادەرم پشان دا زۆر ڕایان لێ بوو.

کوڕێکی گەنجی هاوڕێم هەبوو ناوی جەبار ئەحمەد، حەزی لە گۆرانیی بوو، حەزی دەکرد گۆرانی بڵێ، تازە دەستی پێدەکرد، هەموو شەوان دەهاتە لای ئێمە دادەنیشت، چ هەبایە قسەمان لەسەری دەکرد. کاک جەبار داوای ئەو گۆرانییەی لێ کردم گوتی من دەیڵێمەوە، زۆر خۆشیشی دەگوتەوە دەنگیشی خۆش بوو. ئەوکاتیش گۆرانی گوتن، بەڕاستی پێویستی بەئیمکانیاتی ماددی بوو ئەو کوڕە ئەو ئیمکانیەتەی نەبوو.

لەئەنجامی خراپی باروگوزەرانی خەڵکی کوردستان، ئەو کوڕە وازی لەهونەر هێنا و لە شێخەڵڵای بووە ئارد فرۆش.

چەند کەسێک گوێیان لەو گۆرانییەی ببوو، یەک لەوانە هونەرمەند (تەنیا ئیدریس) کە گەنجێک بوو تازە بەدیار دەکەوت، ئەو زۆر حەزی دەکرد ئەو گۆرانییەی بڵێتەوە، بەڵام ڕێک نەکەوت، لەبەر ئەوەی تەنیا ئیدریس شەرتی ئەوە بوو، کە سەربەندەکەی (عاشق بەتۆم) بگۆڕێتن ئەمنیش گوتم یەک وشە نابی بگۆڕدرێتن.

ئەوە ماوە هەتا ساڵی ۱۹۹۲ ڕۆژێک کاک جەبار بە سوتفە لەبن دیواری سینەما (حەمرا)ی، کە لەوێ ئاردی دەفرۆشت، دەبینی زیاد ئەسعەد بەوێندەردا تێدەپەڕێت، ئەویش بانگی دەکات و پێی دەڵێت کاک زیاد گۆرانییەکی زۆر خۆش هەیە، من وەختی خۆی دەمویست بیکەمە گۆرانیی، بەڵام ئەو گۆرانییە زۆر لەگەڵ دەنگی تو دێتن، ئەگەر بیڵێیەوە زۆر خۆشە، دەیباتە پەنایەکی و گۆرانییەکەی بۆ دەڵێت، زیاد ئەسعەد-یش کە گوێی لە گۆرانییەکە دەبێت، دەڵێت زۆر زۆر خۆشە، زۆر سەرنجی ڕادەکێشێت، پرسیاری خاوەن شیعرەکەی لێ دەکات، ئەویش دەڵێت هی کوڕێکە بە ناوی سەرکەوت ڕەسووڵ لەسەر جادەی مەخمووری شفتی دەفرۆشی.

دوای ماوەیە زیاد خەبەری بۆم نارد، کە حەز دەکات ببینم، ڕۆژەکی پاش عەسرەکی درەنگ بوو کاتی گەرمەی شفتی فروشتن بوو بەڕازیلییەکی سپی ڕایگرت، بینیم زیاد ئەسعەد بوو گوتی حەز دەکەم پێکەوە پیاسەکی بکەین.

ئەوە یەکەم دیتن و ناسینی من و زیاد ئەسعەد بوو، ئیدی پیاسەکمان کرد و باسی سەربردەی ئەو شیعرەی

کرد، کە کاک جەبار پێ دابوو گوتی: ڕێم پێ دەدەی ئەو شیعرو گۆرانیەی تۆ بڵێمەوە منیش گوتم زۆر ئاساییە، ئەو زۆر سەری سوڕما لەو هەست ناسکیی و سادەیەیی و شفتی فرۆشتنەی من لەسەر جادەی، زۆر دڵی بەوە خۆش بوو.

ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٩٣ ئەو گۆرانییەی تۆمار کرد و بڵاوی کردەوە، کە دەنگدانەوەکی زۆر باشی هەبوو. ئێستەش بیرمە وێنەگرتنەکەی تەلەفزیۆنی (گەلی کوردستان) بۆی کرد.

ئەوە یەکەم شیعری گۆرانیم بوو، کە بەدەنگی زیاد ئەسعەد، هەم وەک دەنگ، هەمیش وەک کلیپ بڵاوبۆوە، کە لەڕووی ستایلی گۆرانییەکانی، بۆ سەردەمەکەش شتێکی جیاواز بوو، لە هەموو ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان لێ دەدرا.

ناوەڕۆکی شعرەکەش تایبەت بوو بە کەسێکی دیاریکراو، کە بریتی بوو لە چیرۆکی خۆشەویستی لێک دابڕانی گەنجێکی تەمەن بیست ساڵی.

دەقی شیعرەکە:

عاشق بە تۆم
عاشق بەتۆم عاشق بەتۆم
بەخەفەت وا
توامەوە لە دووری
وەکو بەهار دێ و
لێم ڕادەبووری
بەهیوام تا ڕۆژێکی
خۆش ببینم
کە ڕوناک کا لانەی
تاریکی ژینم
لەتەنیایی دووریی
ژینی کۆتایی
لێم نەکەی نا،
خوداحافیز، سڵاوی
ماڵئاوایی
نەکەی گیانە، بەهەوری
دابڕانت
بمخەیتە بەر، ئەسرینی دوو چاوانت
پێم بڵێ شیرینی جوان بۆ ماتی؟
وەرە مەڕۆ تۆ فریشتەی لەنێو ئاسمان بۆم هاتی
بۆ نایەی تاجارێک باڵات ببینم
من فەرهادم وەرە جوانی شیرینم
بەحەسرەت وا دەچێژم دەرد و ئازار
بۆ ئەوینت شەو و ڕۆژبووم بێ قەرار
بەخەفەت وا توامەوە لە دووری
وەکو بەهار دێ و لێم ڕادەبووری

**سەرکەوت ڕەسووڵ**


سەرکەوت ڕەسووڵ و زیاد ئەسعەد

# سەلیم قاقا ملك الطيور

لەبیرمە لە چایخانەکەی حاجی مستیل-ی تێدەپەڕی، کۆڵانێکی تەسکی بچووک هەبوو، دەچـــووەوە نێو قەیسەری، دوکانێکی لێ بوو، کە هەموو کەلوپەلێکی بیناسازیی لێ دەبینراو پیاوێکی مەیلەو کورتە باڵا بەجلوبەرگی کوردییەوە لە بەردەمی دادەنیشت ناوی مام ڕەشید قۆجە بوو، لەنزیکی ئەویشەوە تۆڕێکی پڕ ڕەشۆڵە دانرابوو،



پیاوێکی دەنگ گڕ بەدیارییەوە هەڵتروشکا بوو، ئەویش (سەلیم قاقا) بوو.

ڕۆژانە ڕەشۆڵەکانی نێو ئەو تۆڕەی دەفرۆشت دانەی بە بیست فلس بوو، زۆرجاریش خەڵکانێک دەهاتن، ژمارەیەکی زۆریان لێ دەکڕی و بەڕەڵایان دەکردن، ئەویش دەیگوت: هەر بەڕەڵایان بکەن، هەر دێنەوە لای خۆم، کە هیچی نەدەما تۆڕەکەی بەپشتی خۆی دادەدا و ڕێگەی دەشتی (قەتەوی) و لای (قەسابخانە)ی دەگرتە بەر، بۆ ئەوەی سەر لەنوێ ڕاوە ڕەشۆڵەی خۆی دەست پێبکاتەوە.

سەلیم قاقا بێجگە لەوەی ئەوە کاروکاسبی بوو، کەسێکی قسەخۆش و تێکەڵاوی خەڵکیش بوو، تا عەیامەکی درەنگ یەکێ بوو لەپیاوە مەستەکەی قەڵاتی هەولێرێ، بێجگە لەوەی دۆست و خۆشەویستی هەموو ئەهلی بازاڕ بوو، دۆستی نزیکی (ئیبۆ بەربەر و مام تاقی چایچی و مشکۆ و محەمەد ئەحمەد ئەربیللی و نوری مەلا نادر و کەمال عەیشێ) بوو، لەگەڵ زۆرینەیان، کە ئێوارە دادەهات دوای ڕاوە ڕەشۆڵەکەی خۆی و گەڕانەوەی بۆ لای دوکانەکەی (مام ڕەشید قۆجە) هەر لەنێو تۆڕەکە تا بەیانی بۆ فرۆشتن دەیهێشتنەوە، خۆشی لەگەڵ ئەو هاوڕێکانی تا درەنگانی شەو سەریان گەرم دەکرد، ئینجا ڕێگەی دەرگای (ئەحمەد)یەی دەگرت و بەرەو قەڵاتێ هەڵدەکشا و دەچۆوە خانوە ساردوسڕەکەی و بەتەنیایی سەری دەخستە سەر بالیفەکەی، لەگەڵ گەردی بەیانیش دەهاتە خوارەوە و دەچووە لای (سلێمان قاورمەچی) قاوەڵتی بەیانی دەکرد و چایەکی گەرمیشی لەچایخانەکەی حاجی مستیل دەخـواردەوە، ئینجا دەستی دەکـردەوە بە

کارەکەی خۆی، کە ڕەشۆڵە فرۆشتن بوو.

هەندێک هاوڕێ، ناسیاو و کوڕانی قەڵاتی هەولێرێ لەناخەوە سەلیم قاقا-یان خۆشویستووە و وەک کوڕی گەڕەک پێناسەیان دەکرد.

فەریق (فوئاد چەلەبی) کە یەکێ بووە لەو قەڵاتیانەی لەنزیکەوە سەلیم قاقای ناسیوە وا باسی دەکات:

سەلیم قاقا خەڵکی قەڵاتی هەولێرێ بوو، سەد دەرسەد شانازی بەقەڵاتیی بوونی خۆی دەکرد، پیاوێکی قسەخۆش و دڵپاک و داوێن پاک بوو، بە درێژایی ژیانی هەر خەریکی کاروکەسابەت بوو، کەسێکی خۆشەویستی هەولێرییان بوو، چونکە تا بڵێی پیاوێکی ئێسک سووک بوو.

سەلیم قاقا هاوڕێ و خزمی نزیکی مام ڕەشید چایچی بوو، هەر سی ڕۆژی ڕەمەزانێ بە ڕۆژوو

* **کێشکەی کوڵای دانەی بە بیست فلس بوو**
* **ڕۆژانە دوو، سێ هەزار ڕەشۆڵەیان ڕاو دەکرد**
* **سەلیم قاقا هەر بەڕەبەنی مایەوە**

دەبوو، بەڵام لەگەڵ یەکەم ڕۆژی جەژن، سەر لەنوێ دەستی بەخواردنەوە دەکردەوە، ڕۆژانە لەپاڵ ڕاوکردنی ڕەشۆڵە، هەموو ئێوارەیەکیش مەنجەڵێکی گەورە ڕەشۆڵەی دەکوڵاند و لەسەر سەری خۆی دادەناو بەناو شار و بە بەردەمی (یانەی مۆزەفین) و کۆڵانەکان دەیگێڕا و هاواری دەکرد:

(کێشەکەی کوڵای) کە ئەم خواردنە تایبەت بەخەڵکی



شاری هەولێرە.

سەلیم قاقا لەپاڵ خۆی، چەند کەسێکی خۆی هەبوو، کە هەموو کات بەخۆیان و تۆڕەکانیان ئامادە بوون، ڕەشۆڵەو کێشکەیان بۆ ڕاو دەکرد، هەر لە ئێوارەوە گەنم و جۆیان حازر دەکرد و بەو شوێنانەیان بڵاودەکردەوە، کە تۆڕەکانیان لێ دادەنایەوە، ڕۆژانە دوو تا سێ هەزار کێشکە و ڕەشۆڵەیان دەگرت و بۆ سەلیم قاقا-یان دەبرد، ئەویش وەکو (دەڵاڵ) بێجگە لەوەی بۆ خۆی دەگێڕایەوە، ئەوانی دیکەی دەفرۆشتە کەسانی دیکە، جارانیش سەرماو سۆڵەی هەولێری زۆر سەخت بوو، بۆیە کێشکەی کوڵای تاموچێژێکی تایبەت و خۆشی هەبوو.

هەر بۆ گاڵتەو نوکتە کاتێک ڕەوە کێشکە و ڕەشۆڵە لەئاسمان دەبینران و دەفڕین، سەلیم قاقا بەخەڵکەکەی دەگوت:

ئەو کێشکە و ڕەشۆڵانە دەبینن لەئاسمانی دەفڕن، ئەوانە هەموویان هی منن. سبەینێ بۆ خۆیان دێنە ناو تۆڕەکەی من، ئێمەش دەیانکوڵێنین، ئێوەش لێمان دەکڕن، ئەگەر ئازادیشیان بکەن هەر دێنەوە لای (سەلیم قاقا)ی خۆتان.

ئەوانەی کێشکەیان لە ماڵەوە دەکوڵاند، هەر بەئاوە گەرمەکەی خۆیەوە بالیفێکی گچکەیان لەسەر سەریان دادەنا و مەنجەڵەکەیان دەخستە سەرسەریان، تا سەریان نەسووتێت، یان ئەزیەتیان نەدات، جۆرێکێک سەمونی گەرمیشیان لەگەڵ خۆ هەڵدەگرت و هەموو ئێوارەیەک بەکۆڵانەکانی قەڵاتی و گەڕەکی عارەبان و خانەقایدا دەسوڕانەوە و هاواریان دەکرد (کێشکەی کوڵای) هەندێکیش دەیانخستە سەر عارەبانە و جێگەکانیشیان دیاربوو، کە ئەم شوێنانە بوون:

پێش چایخانەی عەبۆ نزیکی چێشتخانەی (تاجریان) لەنزیک گەراجی مووسڵ، پێش یانەی مۆزەفین، گەڕەکی تەعجیل، نزیک چایخانەی (مەچکۆ).

لەبیریشمە زۆرجار خەڵک بۆ ماڵەوەش دەیانکڕی، کە بە ئاوەوە، بۆیان دەخستنە نێو کیسەی نایلۆن.

کێشکە فرۆشەکان سەری کێشکەکانیان بەجیا بەهەرزانتر دەفرۆشت، کە نرخەکەی لەنێوانی پێنج تا دە فلس بوو، ئەوانەی دەشیانکڕی، ئەوانە بوون، کە پارەیان وەک پێویست نەبوو، زۆر کەسیش حەزی لە چەلاوەکەی بوو و سەمونی پێوە دەخوارد، بەڵام هەندێک لە ماڵەکانیش هەبوون کێشکەیان دەکڕی و لەماڵەوە چێشتی داندۆکیان پێ لێ دەنا، کە خواردنێکی ڕەسەنی کوردەواریی و تایبەت بوو و تامێکی تایبەتیشی هەبوو و هەموو ڕۆژێکیش لەماڵان دروست نەدەکرا، ڕەنگە ساڵی دوو، سێ جاران دروستکرابایە، ئەمەش زیاتر لەلای هەولێرییەکان دروست دەکرا.

هەر لەبارەی سەربردە و ژیانی تایبەتی و کەسایەتی خۆش مەشرەبی هەولێرییان سەلیم قاقا کاک موشتاق عەبدوڵڵا توفیق، کە یەکێکە لە خانەوادە ڕەسەنەکانی قەڵاتی هەولێر، لەباوک و باپیرەوە ئاشنایەتی و نزیکیان لەگەڵ سەلیم قاقا هەبووە گوتی:

حاجی سەلیم کەریم سەعید بەحری مەلا عەلی مەلا محەمەد ناسراو بە سەلیم قاقا لەدایکبوی ساڵی ١٩٣١-ی قەڵاتی هەولێرە، لەژیانیدا خێزانی پێک نەهێنا، براکانی شەهید جەلال و جەبار کاکە و فازیل بوون.

سەلیم قاقا لەلای حاجی ڕەشید قوجە چایچیی کوڕی پلکی کاری دەکرد لەسەری کۆڵانی بەقالان، کە کەلوپەلی بیناسازییان، هەم دەفرۆشت، هەم بەکرێیان دەدا وەکو:

کاریتەی بیناسازی و بەرمیل و دەڕاب و تەشتی سپی، بەڵام کە زستان دادەهات لەگەڵ تۆڕچییەکان ڕێک دەکەتن ڕەشۆڵەو کێشکەو کۆتری کێوی و مراوی کێوی و قەلەڕەشیان بۆ دەهێنان لەبەردەمی چایخانەکە دەیانفرۆشت، هەندێک لەو کڕیارانەیان دەهاتن و ژمارەیەکی زۆریان لێ دەکڕین و بەرەڵڵایان دەکرد سەلیم قاقاش پێی دەگووتن:

هەر بەرەڵڵایان بکەن، سبەینێ هەر دەیانگرمەوە، بۆیە ناویان لێنا (سەلیم قاقا ملک الطیور) ئەو پیاوە بێوەیە هەر بەڕەبەنی مایەوە تا لەساڵی ١٩٩٩ ماڵاوایی لەقەڵای هەولێرو لەدۆست و هاوڕێ و ڕەوی باڵندەکان کرد.

گۆشەی دیوان

ئا: نەوزاد

# ئەو شیعرەی لە دیوانەکەی دانییە

تا ئێستە چەند جارێک شیعرەکانی جەلالی میرزا کەریم چاپکراون، بەڵام ئەمساڵ ٢٠٢٣ کۆی شیعرەکانی لەلایەن ناوەندی بڵاوکردنەوەی کەپر چاپ و بڵاوکرایەوە، ئەم چاپە ناولێنراوە دیوانی جەلالی میرزا کەریم.

لە ڕۆژانی ڕابردوودا لە دووتوێی ئەو ڕۆژنامە و بڵاوکراوە و گۆڤارە کوردییانەی لە دەرەوە چاپ و بڵاوکراونەتەوە، ئەم شیعرەی خوارەوەی شاعیری ناوبراوم کەوتە بەرچاو، هەر زوو گومانم هەبوو، کە ئەم دەقە لە دیوانەکەدا نییە، بۆ دڵنیابوونەوە، دووجار لاپەڕەکانی کتێبەکەم بە وردی خوێندەوە، ئەم دەقەم نەبینی، بۆ زیاتر خزمەتکردنی دیوانەکە، ئەگەر جارێکی دیکە چاپکرایەوە، وا لێرەدا دایدەنێم، هیوادارم بخرێتە دووتوێی دیوانەکە.

بەلای من شێرکۆ بێکەس و جەلالی میرزا کەریم، دوو لوتکەی شیعری نیشتمانی، سیاسی، حزبی و بەرەنگاریی کوردین، ئەگەرچی جەلال کەمی نووسیوە و بڵاوکردۆتەوە، بەڵام دەقەکانی شان لە شانی شێرکۆ دەدەن، بانگی ئەو هاواری پێشمەرگە، شەهید، کوردستان و کوردە.

دەقی شیعرەکە:

**لەوانەیە**

**لەوانەیە..**
**لەناکاوا، بێنە ناو سنوورەکانی ژیانمەوە**
**دەرگا و پەنجەرەم لێ دڵخەن**
**ئاسۆی سەر ڕووی پەڕاوەکان بسڕنەوە**
**لاشەی خامەی یاخی ڕاخەن**
**تا بتوانن ئازاری بەن**
**داوای ناوی پەنجە و جێگەی مێشکی لێ کەن..**
**بۆیان هەیە!**
*** * ***
**بۆیان هەیە..**
**ئۆکسجینی ناو ژوورەکەم لێ زەوت کەن**
**قەوانەکانی ئەلبوومی خەونی ڕێگام، لەت و پەت کەن**
**هەڵپرووێنن پەڕەی گوڵی یادگاری نامەکانم**
**تیر ئاژن کەن هەناسەی هاوڕێیانی٢ ناو وێنەکانم**
**وەک قاڵۆنچە بەناو ڕەنگی تابلۆ هەڵواسراوەکانی**
**سەرچنارما بێن و بچن٣**
**گیانە!.. مێژووی لەدایک بوونی دڵداریمان لێ بدزن٤**
**بەڵام هەرگیز .. نەء! ناتوانن**
**تەوژمی ووشە هەڵرشتن**
**بۆ کوردستانم ڕابگرن.**

١- هەست دەکەم ئەم دوو وشەیە زیادە و هەڵەی دیزاینە، لە کۆپلەی دووەم کۆپی کراوە و لێرە داندراوە.

٢- ئەم وشەیە لە ڕۆژنامەکەدا بەم شێوەیە نووسراوە (هاوریانی)، بەرای من هەڵەی چاپە و من کردم بە (هاوڕێیانی).

٣-٤ ئەم دوو دێڕە تەواوکەری نیوە دێڕەکانی پێشوون، وەک دەقی ڕۆژنامەکە نووسیونەتەوە.

* ئەو شیعرە ناوی «لەوانەیە» لە ڕۆژنامەی بارزان، ژمارە ٢، ئازاری ١٩٩٠، لاپەڕە ٨ بڵاوکراوەتەوە. بارزان ڕۆژنامەیەکی گشتی بووە، لە ئەمریکا لە لایەن عەبدولقادر حەمەدئەمین دەرچووە.




لەوانەیە

- جەلال میرزا کریم -




(یەکەم) گوشەیەکی گۆڤاری دیوانە، تییدا هەرجارەی یەکەم بابەت، یان یەکەم کتێبی نووسەرێک، یان شاعیرێک، یان هونەرمەندێک دەخەینەڕوو، بە مەبەستی ئاشناکردنی خوێنەران بە سەرەتا و یەکەم بەرهەمیان

**ئا: قەڵەندەر**

# عوسمان شەیدا (٢٠٠٥-١٩٥٣)

عوسمان شەیدا، ساڵی ١٩٥٣ لە گەڕەکی گۆیژەی شاری سلێمانی لەدایک بووە. قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لەو شارە تەواوکردووە.

بۆ یەکەم جار لە تەمسیلی (باوەژن خوا بناسە) وەک ئەکتەر رۆڵی دکتۆر دلێری بینی. شانۆنامەی (ژن بەژنی) نووسی، شانۆنامەی (کەڵلە سەری)ی نووسەری ناودار (نازم حیکمەت) ی بۆ سەر زمانی کوردیی وەرگێرا، کە دواتر لە ساڵی ١٩٨٢ وەک شانۆگەری لەهۆڵی چالاکی قوتابخانەکان نمایش کرا.

وەک دەنگێکی نوێ و جیاواز ساڵی ١٩٧٧ یەکەم بەرهەمی شیعرەکانی لە دوو توێی دیوانێکدا بەناوی (شەختە) چاپ و بڵاوکردەوە، کە دەنگدانەوەیەکی زۆری هەبوو. دواتر بایەخی بەکاریکاتێرە شیعر دا

(گرانەتا و سێبەرۆ) دوو بەرهەمی ناوازەی شاعیرن، کە کاتی خۆی وەک شێوازێکی نوێ و کاریگەریی شیعریی پێشوازییەکی گەرمیان لێکرا.

وەک کەسێکی نیشتمانپەروە بەشداری شۆڕشی نوێی کردوە و بووەتە پێشمەرگە. ساڵی ١٩٨٤یش لە شاخ کۆمەڵە شیعری سروودی بەرەنگاریی چاپ و بڵاوکردەوە.

(نزا سپییەکانی من) دوا دیوانی شیعری بووە،

من خۆشەویستیکم هەبوو
سپی وەک شیری دایکم
ورد وەک شەپۆلی ئەستێرەی
پشت زێی باران
شیرین وەک گەمەی منال






## له زمانی خۆیانەوە

# یووسف ئیسماعیل: یەکەم کتێب، کە خوێندمەوە (شازادە و گەدا) بوو

تەمەنم زۆر بچووک بوو، ئەودەمەی بۆ یەکەم جار بەر خوێندنەوە کەوتم. تەمەنم پێنج ساڵان بوو، کە دایکم هەوڵی ئەوەی دەدا پێش ئەوەی بچمە قوتابخانە، لەماڵەوە فێری نووسین و خوێندنەوەم بکات، ڕۆژانە بۆ کڕینی ڕۆژنامە، منی دەنارده ئەو خانەیەی کە لە نزیک ماڵەکەمان بوو، چونکە پیتەکانی بە تایپی گەورە بوون، لەگەڵ ڕۆژنامە و کاغەزە بێکەڵکەکانی ماڵەوە فێری خوێندنەوەی کردم.

لە پۆلی یەکی سەرەتایی دەستم بە خوێندنەوە کرد، یەکەم کتێب، کە خوێندمەوە (شازادە و گەدا) بوو، کە لە ساڵی ٢٠٠٩ چاپکرابوو.

ئەم کتێبە وای لێکردم دەست بەخوێندنەوەی ڕۆژنامە بکەم، بەتایبەتی خوێندنەوەی ئەدەب و هونەری فێربوون، ئەمە وای کرد هەر لە منداڵییەوە زۆر پرسیار بکەم، چونکە یەکەم بەرکەوتنی خوێنەر

کرد جیهانی کتێب و خوێندنەوە باشتر دەرفەرت بۆ تاک دەڕەخسێنێ بیر لەشتە جیاوازەکان بکاتەوە و درک بە بیرکرنەوەی ڕەخنەگرانە بکات، کە بۆ گەشەکردنی فیکریی زۆر پێویستە، چونکە مرۆڤ لەوێ دەتانێت هەست بە ئازادیی خۆی بکات و پرسیار و لێکدانەوە جیاوازەکان گەشە پێ بدات.

**یەکەم بەرکەوتنی خوێنەر لەگەڵ کتێبێک، سەرەتای ئەزموون و دروستبوونی گۆڕانکارییە لە ناخی مرۆڤ و دەبێتە بناغەی خۆشەویستییەکی تەواو بۆ خوێندنەوە و هێزی خەیاڵ**

لەگەڵ کتێبێک، سەرەتای ئەزموون و دروستبوونی گۆڕانکارییە لە ناخی مرۆڤ و دەبێتە بناغەی خۆشەویستییەکی تەواو بۆ خوێندنەوە و هێزی خەیاڵ.

کتێبەکان توانای ناوازەیان هەیە بۆ هاندان و پەرتکردنی خەیاڵی خوێنەر بۆ نێو جیهان، کلتوور و دیدگا جیاوازەکان، کە ئەمەش ڕێگە خۆش دەکەن بۆ بەدواداچوون و بونیاتانی بیرۆکەی نوێ.

خوێنەر لە ڕێگەی خوێندنەوەی کتێب دەتوانێت تێگەیشتنی قووڵتر بێت و هەنگاو بۆ بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە بنێت.

ئێستە زۆر بە چڕی لە هەوڵی ئەوەدام لە ژانرەکانی ئەدەب دانەبڕیم، گەر سەیرێکی کتێبخانەکەم و خوێندنەوەی ڕۆژانەم بکەی، دەبینی سێ ژانری سەرەکی زیاتر کاتەکانم بۆ تەرخانکردووە، وەک: ڕۆمان، بیرەوەریی و فەلسەفە.

**"ئێستە زۆر بە چڕی لە هەوڵی ئەوەدام لە ژانرەکانی ئەدەب دانەبڕیم، گەر سەیرێکی کتێبخانەکەم و خوێندنەوەی ڕۆژانەم بکەی، دەبینی سێ ژانری سەرەکی زیاتر کاتەکانم بۆ تەرخانکردووە، وەک: ڕۆمان، بیرەوەریی و فەلسەفە"**

من لە ڕۆمانەوە فێری نووسین بووم، بیرەوەریی بۆ من ئەزموونە، خوێندنەوەی فەلسەفەش دەتوانم بڵێم هەوڵێکە بۆ ئەوەی زیاتر خۆم بناسم و زۆر شت بخەمە ژێر پرسیار.

سەرئەنجام خوێندنەوەی کتێبی ژانرە جیاوازەکان، پانۆرامای زانینم دەکاتەوە و توانای هاوسۆزیم لەگەڵ ئەوانی دیکە بەرز دەکاتەوە، چونکە هەر زوو هەستم

## پرۆفایل

یووسف ئیسماعیل عەزیز لە بەرواری ٢٠٠٢/٨/١٧ لە شاری هەولێر لەدایکبووە، لە ساڵی ٢٠١٦ لەسەر ئاسناوی (کاتۆفیک) پارچە شیعرێکی بڵاوکردۆتەوە بەناوی ناوی (عاشقی کرێکارێکی ماندووم)

لەساڵی ٢٠١٩ یەکەم بەرهەمی کورتە چیرۆکی بە ناونیشانیی (بەڵێنماندا لە دونیایەکەی تریش پێکەوە بین) بڵاوکردۆتەوە.

زیاتر لە ٤٠ کورتە چیرۆک و بیست بابەتی فیکر و فەلسەفە و پەنجا ڕانانی کتێبی لە ڕۆژنامە و گۆڤار و ماڵپەرە ئەلکترۆنییەکانی باڵوکردۆتەوە.

کتێبە چاپ نەکراوەکانی:

- زاڵبوونی ڕۆژی ڕەش بەسەر ڕۆژی سپیدا، کۆمەڵە چیرۆک.
- خوێن نابێت بەئاو، کۆمەڵە چیرۆک.
- کەنیسەی عشقم، نۆڤڵێت.





ئامادەکردنی: شاگوڵ فوئاد

# فیلمی کۆمەڵەی شاعیرە مردووەکان





شیکردنەوەی فیلمی کۆمەڵەی شاعیرە مردووەکان. تەنیا کاتێک دەتوانن شتەکان بەڕاستی بناسن کە بتوانن بە دیدێکی جیاوازەوە سەیری بکەن، تەنانەت ئەگەر ناڕاست و گەمژەش دەربکەوێت.

کاتێک پارچە نووسراوێک دەخوێننەوە، تەنیا بۆچوونی نووسەرەکە لەبەرچاو مەگرن، سەیربکەن بزانن بۆچوونی خۆتان چییە سەبارەت بەوە. دەبێت هەوڵبدەن تاوەکو دەنگی خۆتان بدۆزنەوە، چونکە هەرچەند درەنگتر دەست پێبکەن، ئەگەری گەیشتنتان بەو ئامانجە کەمتر دەبێت.

(تارۆ) دەڵێت: (تەمەنی زۆرێک لە مرۆڤەکان بەبێ دەنگیی و بێچارەیی بەهەدەر دەڕوات) ڕێگە نەدەن شتی وا ڕووبدات، وریا بن! ئەمەی بەڕێزتان خوێندتانەوە، وتەی مامۆستا (جۆن کیتینگ) بوو، لە فیلمی (کۆمەڵەی شاعیرە مردووەکان) ڕێگە مەدەن هەروا بە ئاسانی بەسەرتان بڕوات، جارێکی دیش بیخوێننەوە! ببینن کاریگەرییەکەی چەند ناوازەیە! چی لەم وتەیەدا دەبینیت؟ دەیەوێت چیت پێ بڵێت؟ هەوڵبدەن دەنگی خۆتان بدۆزنەوە، مەکەونە ژێر کاریگەری بۆچوونی کەسانی دیکەوە بە شێوەیەک بۆچوونی خۆتان بخاتە ژێر پێوە. بەتەنیا لەدیوێکی لە شتەکان مەڕوانە، خاوەنی بڕیاری خۆت بە، بوێربە، یاخی ببە (یاخی بوونی ڕەها نا!) هیچ کەسێک ناتوانێت ژیانی

تۆ بژی، کەس ناتوانێت ئەوە تێبپەڕێنێت و بیچێژێت، کە تۆ دەیچێژیت بە خۆشی و ناخۆشییەوە، ڕێگە مەدە کەس بڕیار لەسەر داهاتووت و ژیانت بدات، گەر کرا و کۆتا ڕێگەچارەش مردن بوو، ڕێگە مەدە لە ژیانێکدا بژیت، کە خۆت هەڵت نەبژاردووە چونکە ئەوە نابێتە ژیانی تۆ! (گرنگ نییە کەسانی دیکە چیت پێ دەڵێن، وشە و بیرۆکەکان دەتوانن جیهان بگۆڕن)

بوون بە (دایک و باوک) شتێکی ئاسان و ڕەها و بە گۆترە و یاری منداڵان نییە، جیا لە مرۆڤبوون و هاوسەر، دایکایەتی و باوکایەتیش زیاد دەکات بۆ لیستەکەت، کاتێک منداڵێک دەهێنیتە دونیا بێ ویستی خۆیی و بۆ حەزێکی کاتی خۆت (ئەگەر بە مەبەستیش بێت) دەبێت توانای هەڵگرتنی ئەو بەرپرسیارێتییە گەورەیەشت هەبێت، کە پێگەیاندنی کەسێک چەند قورس دەبێت.

دەبێت بتوانیت قبووڵی جیاواز بوونی منداڵەکەت بکەیت، دەبێت وا هانی منداڵەکەت بدەیت خاوەن بڕیاری خۆی بێت، نەک ئەوەی تۆ داهاتوو و هەموو ژیانی بۆ بەرنامەڕێژ بکەیت، بێ ئەوەی گوێ بدەیتە بڕیار و هەست و خولیای منداڵەکەت، ئەو دەبێتە کەسایەتییەکی پێگەیشتووی سەربەخۆ، نەک لەبەرگیراوە و کۆیلەی تۆ.

(کۆمەڵەی شاعیرە مردووەکان) فیلمێکە لە ژانرەکانی (کۆمیدی و دراما) بە بەشداری ئەکتەری ئەمریکی (ڕۆبن ویلیام) لە ڕۆڵی سەرەکی، کاتەکەی لە دوو کاتژمێر و هەشت خولەکدا خۆی دەبینێتەوە، فیلمەکە براوەی خەڵاتێکی ئۆسکارە بۆ باشترین سکرین پلەی، کە ڕاستەوخۆ بۆ سکرین و سەر شاشە نووسرابێت، براوەی ١٩ خەڵاتی دی و پاڵێوراوی ١٨ خەڵاتی دیکەیە، چیرۆکی فیلمەکە لەلایەن (تۆماس ئیچ. شوڵمەن)ەوە نووسراوە، کە دەوترێت لە ئەزموونی ژیانی ڕاستی خۆیەوە ئەمەی نووسیوە و کەسایەتی ( جۆن کیتینگ) و ڕەفتار و شێوازی وانە وتنەوەی لە دوو مامۆستای خۆیەوە وەرگرتووە، کە وانەیان پێ وتوەتەوە (ڕۆبن ویلیامس) کە ڕۆڵی مامۆستا (جۆن) دەبینێت دەتوانێت بەو نواندنەی دەیکات سەرسامت بکات، ئەی باوەڕ دەکەیت سەرەتا زۆر نامورتاح بووە بە وەرگرتنی ئەو ڕۆڵە؟ بەشێوەیەک نەیویستووە بە دایالۆگە نووسراوەکانەوە ببەسترێتەوە و زۆربەی قسەکان هی خۆیەتی، لە پاش ئەوە توانیویەتی بەردەوامی بە ڕۆڵەکەی بدات. لە سکرینە ڕەسەنەکەدا (کیتینگ) تووشی شێرپەنجە دەبێت و دەمرێت کە لە فیلمەکەدا وانەبوو، بەس ئەگەر وردبینەوە لەو کاتەی (کیتینگ) دەڵێت: (کارپێ دیبەم، ڕۆژەکە بقۆزنەوە، ژیانتان خۆش و ناوازە بکەن) دەتوانرێت درک بەوە بکرێت.



له دەفتەری نەمریدا



هونەرمەند ستار عەلی

١٩٥٧-٢٠٢٣/٩/٤

لە دەفتەری نەمریدا



## جەلال زەنگابادی

## ١٩٥١ ـ ٢٠٢٣/٩/٥

# سالۆنی لاپەڕە (٩)

ئا: ڕەوەست نەوزاد

**لە درێژەی کۆڕەکانیدا سالۆنی لاپەڕە ٩ی ناوەندی هەولێری یەکێتیی نیشتمانیی کوردسان لە ماوی ٢٠٢٣/٨/٢٦ تا ٢٠٢٣/٩/١٦ ئەو کۆڕانەی ڕێکخست:**

**٢٠٢٣/٨/٢٦**






مەڕاسیمی ناساندن و دابەشکردنی کتێبی( تأثير المسلسلات المدبلجة على منظومة القيم الاجتماعية لدى الشباب في إقليم كوردستان - العراق) لەنوسینی دکتۆر هەژار محمد جەلال و لەبڵاوکراوەکانی مەکتەبی ڕاگەیاندنی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان.

**٢٠٢٣/٩/٢**






مەڕاسیمی ناساندن و دابەشکردنی کتێبی شێرکۆ بێکەس (مقبرة القناديل) لە وەرگێڕانی تاهیر مەلا قادر گۆپتەپەیی.

٢٠٢٣/٩/٩









مەڕاسیمی ناساندن و دابەشکردنی هەردوو کتێبی (ڕەهەندی تەندروستی لە شۆڕشی نوێدا ١٩٧٦- ١٩٩١ و گەڕان بەناو شەپۆلەکاندا)

٢٠٢٣/٩/١٦






مەڕاسیمی ناساندن و دابەشکردنی کتێبی (وتەبێژی ڕۆژنامەوانیی) لەنوسینی نووسەر هەڵمەت هۆشیار

# سلێمانی، دیسان سلێمانی

ئەوانەی ئێستا لە کایەی سیاسی و حکومی کاردەکەن، مانگێک زیاترە لە چەندان بۆنەدا مەرگی ئەم ئەزموونەیان ڕاگەیاندوە، هەرێمیان بەجۆرێک نمایش کرد، ڕووناکی ئاوا بووە و بەم زووانە سەر بەم مەسکەنەدا ناکاتەوە، خەریک بوو ڕای گشتی بۆ کارەساتێک ئامادە بکەن، ناویان نابوو مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە! لەو دۆخە ئالۆزەدا، کە ئەودیوی تونێلکەکەیان ئەوەندە تاریک کردبوو، مرۆڤی ماندوو دەکرد، وەک ئەوەی قەدەرێک هاتبێتە ڕێ و تەنیا تارمایی و نیشتمانێکی سوتماک لە چارەنووسمان نووسرابێت، ئا لەو ساتە، سلێمانی دیسان ئومێد بە ڕای گشتی دەدات، بەڵام ئەمجارە نە خۆپیشاندانە بۆ مووچە و نادادپەروەریی، نە ڕێپێوانە بۆ گۆڕین و گۆڕانکاریی، بەڵکو ئاواز و مۆسیقا بە چارەسەر دەزانێت، بە هەزاران کەس ڕوو لە هەواری شار دەکەن!

ڕۆژانی ٨ تا ١١ی ئەم مانگە، وەک پرۆژەی هاوبەشی وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان و زانکۆی ئەمریکی لە سلێمانی، لە فێستڤاڵێکی ئاست بەرزدا بە ناوی ئاوازی گەلان هەر لە کاتژمێر شەش و نیوی ئێوارە تا ١١ی شەو، ئاواز، وشە، ڕووناکی، مۆسیقا تێکەڵ بە ڕۆحی جەماوەر دەکرا، شەو نەبوو، شانۆی ڕۆمانی چوار تا هەشت هەزار کەس لە خۆی نەگرێت، کە بە ڕێزەوە گوێیان بۆ مۆسیقا ڕادەدێرا و لەگەڵ پرۆفیشناڵترین دەرهێنان و ڕووناکی ڕاخاوێکی تازەیان بە مێشک دەدرا. ئاخر جەماوەر بۆ ماوەی چوار ڕۆژ و زیاتر لە چوار کاتژمێر وەک تەقسێک چاویان لەسەر شانۆی ڕۆمانی بوو!




تیپە بەشداربووەکان کۆکتێلێک بوون لە کورد، فارس، عەرەب، تورک، زۆربەیان بۆ ماوەی نزیک لە کاتژمێرێک بەرهەمەکانی خۆیان پێشکەش کرد، ئەمجارە زیاتر کار لەسەر تیپە کوردی و عێراقی و هەرێمییەکان کرابوو، ئەگەر کەسێک گوێی مۆسیقی سووک بووبێت، درکی بەوە دەکرد، بەڵێ! ئەم چوار نەتەوەیە کار و کاریگەرییان لەسەر یەکتر داناوە، بەتایبەتیش بەرهەمی تیپە فارس و تورکەکان، ئەم فیکرەیەش دەبێت بە خاڵێکی پۆزەتیڤ بۆ ڕێکخەرانی فێستڤاڵەکە، کە چوار نەتەوەی دراوسێی یەکتریان لەسەر یەک سەکۆ کۆکردۆتەوە و جەماوەری ئامادەبوویان سەرمەست کردبوو.

لە فێستڤاڵە گەورەکانی جیهان جەماوەر و چێژ ئاوێتەی یەکتر دەکرێن، واتە پێشتر نەخشەڕێگای ئەم دوو جەمسەرە بە هەند وەردەگیرێت، لە هەواری شاریش جەماوەر سەلماندی تینوێ ئاواز و مۆسیقایە، بەڵام پێویستە ڕەچاوی ئاست بکرێت، چونکە ئەوان دەزانن هاوێر لەنێوان کۆنسێرت، ئەگلەنجە، فێستڤاڵ بکەن، ئەو جەماوەرە گرەوی هەستی مۆسیقی و چەشەی بردەوە و تا ماوەیەکی باش لە یادەوەرییەکەی دەمێنێتەوە.

ڕووناکیی و تەوزیفکردنی ڕەنگ و تۆنە جیاوازەکانی وێنە و زەخرەفە بە قەد دەنگ و ئاوازەکان کەشێکی جوانییان بە شانۆیەکە دابوو، لە کەسێکی نزیک لە ستافی ڕێکخەرانی فێستڤاڵەکەم پرسی؛ ئەو کۆمپانیا جێبەجێکارە لە چ وڵاتێک هێنراوە؟ گوتی: کۆمپانیایەکە لۆکاڵە و لە دەرەوە نەهاتوون، ئەم زانیارییە زیاتر و زیاتر دڵخۆشی کردم. ستافەکە زۆربەیان گەنج بوون.

لە ڕۆژی کۆتایی، چوار بلیمەتی ئاواز و مۆسیقا خەڵات کران، کە دیسان ئامادەبووان سەلماندیان چۆن کڕنووش بۆ داهێنەران دەبەن، تا خەڵاتەکانیان وەردەگرت بە پێوە دەوەستان و بە چەپڵە پێشوازیان لێکردن، ئەو چوار بلیمەتەش بریتی بوون لە: مەزهەری خالقی، عومەر دزەیی، ئیلهام مەدفەعی، ئەنوەر قەرەداغی، نەسیر شەمە.

ئەم فێستڤاڵە، کە لەسەر سێ کۆڵەگە کاری کردبوو؛ مۆسیقا، شانۆیەکی پرۆفیشناڵ، جەماوەرێکی جوان، بە هەرسێکیان مەدالیای سەرکەوتنێکی مێژووییان لە گەردەنی فێستڤاڵەکە کرد.

نەوزاد عەلی ئەحمەد

# فۆتۆسکان




**Kovarî HETAW**

گـۆڤارێـکی وێژەیی [ ادبي ] هەفتەیی کوردی یە جاری هەر لە دە رۆژاندا چاپکی ، هەولیر لە چاپخانەی کوردستاندا پەخش دەکرێت

Jimare 109 s 4 10 Gelar Ezan 2569 Kurdî « Madî »

ژمارە : ١٠٩ سالی ٤ دوشەمە ١٠ گەلارێزان [ ٣٠ ایلول ] ١٩٥٧

ناوەرۆک

١ – کورد ، مدیك ، مدیاو ، مدی

٤ – سەر ئەزمیری گشتی [ ملك الكلام ] – ناران

٥ – سەر پەرشتی سەر ئەزمیری گشتی

BEŞÎ AFRET

٦ – نیرو می – نی بینی لەبارەی نامەی خوشکێ [ ر ] کەرکوك رابەر

BAXÇEY BU WÊJAV

٩ – لەکانگای ژیانا ئەستەمبۆل – شوان

١٤ – کۆبوونەوەیەك لە منگەوتی ناو بازاردا

١٧ – بۆچی خرابنە پشت گوێ کەرکوك : ج . ن .

١٨ – بۆچی خرابنە پشت گوێ

بۆچی خرابنە پشت گوێ
کەرکوك – ( ج . ن )

هەموو کەس ئەیزانێ کەرۆژی ١٢ تشرین یەکەم دانراوە بۆ ژماردنی نفوس لەهەموو عراقا . بی گومان ئەو رۆژە رۆژێکی گرنگە لەمێژووی ئەم وولاتە خۆشەویستەدا بۆ بەخەلق وولات لەم بەرەوە ئامادە کردوە بۆ بەپیرە وەچوونی ئەورۆژەولەهەموو ناوچەیەکدا سەرنووسەکان شەوو رۆژ خەریکی بەجێ هێنانی ئەم کارەن بۆدەی خۆی .

دانیشتوانی شاری [ کەرکوك ]یش وەك هەمووشارەکانی تر چاوەڕوانی ئەورۆژە بوون بەگەرمی وەئەیان ویست هەندێك شارەزانامە وتعلیمات یان بۆ دەرچی لە بابەت ژماردنی نفوسەوە ، تا هەر کەسە پێویستی خۆی بەباشی بزانێ وتێ‌بگا بەلام بەهەمووداخێکەوە ئەلیم زوربەی زۆری خەلکی کەرکوك کەکوردن [ باسی دەورو پشتی ناکەم هەموو هۆزو تیرەی اوردن بەلکوو تەنها مەبەستم ناوشارە کەیەلەامام قاسم وە هەتا ئەخی حوسێن وزیوبە وشوریجە وتەپەی مەلا عەبدوللەو گەلی شوێنانی تر . . ئەلیم ئەمانە هەموو خراونە پشت گوێ چونکە هەرچی ئەو ( تەعلیماتانە هەیە بۆناوناوشار بەعەرەبی وتورکی دەرچووە وەك کورد هەر نەبی لەکەرکووکا . راستی ئەمەدلی کوردەکانی زور زیز کرد ، خەلقی بیریان لەوە ئەکردەوە بۆچی ئەبی لەشارێکی کورد زمانا کەزوربەی زۆری کوردبن دان بەبوونی کوردانە نری ? ? ?

ایمە ئەم پرسیارە ئاراستەی کاربەدەستانی میری ئەکەین لەکەرکوك و بەغدادا ناچارێك بۆئەمەبدۆزنەوە وماوەی هەموو کەسێك بدرێ لە چەرەگەزونەتەوەیەکە بەورەگەزونەتەوە خۆی بدا لەقەلەم . وابتر واچاەروانین

---

کاك [ ج . ن . ] لەکەرکوکدا لەچەند ماڵە مهاجرێکی آسوری بەدەر هیچ بێگانەیەکی تێدانیە هەمووی کوردن بێگمانە پەرستیشیان کەناکنا کە تێدا هەبێ نانونەکی کوردستان کوێریان هەردەکات وبەراستی ایمەش زۆر بەموخابنی دەزانین کەکاربەدەستانی دەوڵەت دڵی ٢٥ ملیون کورد بو ٤ ، ٥ میکروبان سەخلەت بکات
گـ

ئەمە نووسینێکی (جەمال نەبەز)ە لە ژمارە (١٠٩)ی ساڵی چوارەمی (١٩٥٧)ی گۆڤاری (هەتاو)

